حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان



# مێژووی نوێ
# بۆ پۆلی یازدەهەمی ئامادەیی وێژەیی

**دانانی**
لێژنەیەک لە وەزارەتی پەروەردە

**بژارکردن و پێداچوونەوەی زانستی**
عمر علی شریف- ئاکۆ صابر عثمان

**پێداچوونەوەی زمانەوانی**
عوبێد خدر فەتحوڵا

چاپی دوازدەهەم ٢٠١٥ زایینی ٢٧١٥ کوردی ١٤٣٦ کۆچی

## بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

### پێشەکی:

ئـەم کتێبـە کـە مێـژووی نوێـی پۆلـی یازدەهەمـی وێژەییـە، بـە تەواوکـەری زانیـاری قوتابیـان لـە قۆناغەکانـی پێشـوودا دادەنـرێ، کـەوا پێشـتر مێـژووی کـۆن و ئیسـلامی پاشـان مێـژووی نـوێ و هاوچـەرخ و مێـژووی شارسـتانیەکانیان خوێنـدووە، لـەم کتێبەشـدا ویسـتوومانە ڕووداوەکانـی جیهانیـان بـۆ بـاس بکەیـن هـەر لـە دۆزینـەوەی جوگرافیـەکان و چاکسـازییەکانی ئایینـی و سـەردەمی شۆڕشـی فەرەنسـاوە لـە (١٧٨٩-١٧٩٢زایینـی) بـە گەشـەکردنی ئابـووری و کۆمەڵایەتیـەوە تـا دەگاتـە پێشـکەوتنی زانیـاری، پاشـان باسـی بزووتنـەوە نەتەوەییەکانـی ئیتاڵیـا و ئەڵمانیـا و نەمسـامان کـردووە بـە ڕووداوو پێشـهاتەکانی مەیدانـی کۆمەڵایەتـی و ئابووریانـەوە، هەروەهـا ڕووداوەکانـی نێـوان هـەردوو شـەڕی یەکـەم و دووەمی جیهانـی و پێوەندییە دەوڵەتەکانی نێـوان ئـەم دووشـەڕە و ڕووداوەکانـی پـاش شـەڕی دووەمـی جیهانمـان بـاس کـردووە. بابەتەکانیشـمان بـە شـێوەیەک پێشـکەش کـردووە کـە وەرگرتـن و تێگەیشـتنیان ئاسـان بێـت و بەڵگەنامـەی مێژوویشـیان لەگـەڵا دابێـت، لەمـەش دا مەبەسـتمان ئاگاداركردنـی قوتابیانـی خۆشەویسـتە لـە مێـژووی نـوێ و ڕووداوە گرنگەکانـی.

هیواداریـن مامۆسـتایانی خوشـک و برامـان هـەر سـەرنج و پێشـنیارێکیان دەربـارەی کتێبەکـە هەیـە بۆمـان بنێـرن تـا لەپێشخسـتن و چاکترکردنـی کتێبەکـەدا سوودیان لـێ وەربگریـن. خـواش پشـتیوانی سـەرکەوتنە.

# بەندی یەکەم

## بەشی یەکەم

### دۆزینەوە جوگرافییەکان و چاکسازییە ئاینییەکان و سەردەمی شۆڕشی فەرەنسی

### یەکەم: دۆزینەوە جوگرافییەکان

دۆزینـەوە جوگرافییـەکان لـە کۆتایـی سـەدەی (١٥) دەسـتی پێکـرد، کاتێک دەوڵەتە ئەوروپییـەکان توانیـان سـەرکەوتنی گـەورە لـەم بـوارە بەدەسـت بێنـن و کیشـوەرێکی نوێیـان بەنـاوی (ئەمەریـکا) لـە سـاڵی (١٤٩٢ز) دۆزیـەوە و گەیشـتنە ڕێگـەی بازرگانـی بـەرەو هیندسـتان لـە ڕێگـەی (رأس الرجـاء الصالـح) سـاڵی (١٤٩٨ز)، بـەم شـێوە دۆزینـەوە جوگرافییـەکان لەگـەڵ دەریاوانـە پورتوگالییـەکان لـە سـاڵی (١٤٤٥ز) دەسـتی پێکـرد و دواتـر لـە نێـوان ئـەم سـاڵەو سـاڵی (١٦٠٠ز) هەریـەک لـە ئیسـپانییەکان و بەریتانییـەکان و فەرەنسـییەکان درێژەیـان پێـدا.

#### هۆکارەکانی سەرهەڵدانی دۆزینەوە جوگرافییەکان:

**١-دەرکەوتنی دەوڵەتی نوێی ئەوروپی (هۆکارە ڕامیارییەکان):**

ژمارەیەکـی زۆر دەوڵەتـی ئەوروپـی کـە تـازە دامەزرابـوون لـە ئەوروپـای ڕۆژئـاوا دەرکەوتـن وەک دەوڵەتەکانـی (ئسـپانیا و پورتـەگال و هۆڵەنـدا و بەریتانیـا و فەرەنسـا و ڕووسـیا) دواتریـش هەریـەک لـە دەوڵەتەکانـی (دانمارک و سـوید و ئیتاڵیـا و ئەڵمانیا) دەرکـەوت. ئـەم دەوڵەتانـەش بە شـێوەیەکی ڕاسـتەقینە بیریان لـە بڵاوکردنەوەی ئایینی کریسـتیانی و فراوانکردنـی دەسـەڵاتیان کـردەوە بـە تایبەتـی لەنـاو ئـەو نەتەوانـەی (گەلانـەی) کـە نوێبـوون لـە دروسـت بوونیـان، بۆیـە ئـەم دەوڵەتانـە هەوڵیـان دا بـۆ بڵاوکردنـەوەی ئاییـن و شارسـتانیەکانیان لـە نـاو گەلانـی تـر.


دۆزنیەوە جوگرافیەکان لەجیهان
ئیتالیەکان
مارکو بولو ١٢٧١-١٢٩٥
پورتوکالیەکا
دیاز ١٤٨٧-١٤٨٨
داجانا ١٤٩٧-١٤٩٨
ئیسپانیەکان
کولمبوس ١٤٩٢
کولمبوس ١٥٠٢
ماجلان ودیل کانو ١٥١٩-١٥٢٢
ڤالدیڤیا ١٥٤٠-١٥٥٣
دي أوریلانا ١٥٤١
بەریتانیەکان
فروبشر ١٥٧٦
هدسن ١٦٠٩
هدسن ١٦١٠
کوك ١٧٦٨-١٧٧١
کوك ١٧٧٢-١٧٧٥
کوك ١٧٧٦-١٧٧٩
کوك في هاواي ١٧٧٩)
بارك ١٨٠٥
لیڤنجستون ١٨٤٩-١٨٥٤
لیڤنجستون ١٨٦٦
ستوارت ١٨٥٩
سبیك وجرانت ١٨٦٠-١٨٦٣
فەرەنسیەکان
کارتیر ١٥٣٤
هۆلندیەکان
بارینتز ١٥٩٧
تسمان ١٦٤٢-١٦٤٤
روسەکان
بیرنج ١٧٢٤
بیرنج ١٧٢٨
بیرنج ١٧٤١
المقیاس ١ : ١٢٠ ٠٠٠ ٠٠٠
ئەنتارکتیکا
گرینلاند
ڕوسیا
چین
ژاپۆن
ئەفریقیا
ئەمریکای باکور
ئەمریکای باشور
ئوسترالیا
زەریای هێمن
زەریاس ئەتلەسی باکور
زەریاس ئەتلەسی باشور
زەریاسی هیندی
دەریاس بێرنگ
کەنداوی مکسیك
الهند
الفلبین
گەرووی ماجەلان

## ٢-ئارەزووی قازانج و دەست بەسەرداگرتنی بازرگانی (هۆکارە ئابوورییەکان):

ئەوروپییەکان بیریان لە ڕێگەیەکی بازرگانی دەکردەوە بیانگەێنێتە هیندستان بێ ئەوەی بەو ڕێگا بازرگانیانەدا بڕوا کە ولاتانی تر لە ڕۆژهەلات دەستیان بەسەرداگرتبوو، بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت لەو باجانەی دەسەپێنرا بەسەر کەشتی و کاروانە بازرگانییەکانیان کە بە ولاتانی ڕۆژهەلاتدا تێدەپەڕی، بەمەش دەولەتە ئەوروپییەکان بازاڕی نوێیان بۆ فرۆشتنی بەروبوومە زیادەکانیان دۆزییەوە، هەروەها ڕێگرتن لە دەسەلاتی عوسمانییەکان، بەسەر ڕێگە بازرگانییەکان کە بە ئاسیای بچووک و باشووری ڕۆژهەلاتی ئەوروپادا دەڕۆیشت.

## ٣-ئەو زانیارییە جوگرافیانەی دەست ئەوروپییەکان کەوت:
## (ئارەزوو بۆ گەڕیدەیی و زیادکردنی زانیارییە بازرگانییەکان):

بیرکردنەوەیەک لای ئەوروپاییەکان دەرکەوت بۆ ئەنجامدانی گەشتە جوگرافییەکان لە پێناو ئاشنابوونی زیاتر لە بواری زانیاریە جوگرافییەکان، ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ هەولەکانی ئەوروپییەکان بۆ زیاتر شارەزابوون لە بواری توێژینەوە زانستیەکان و پێشکەوتنی گەردووناسی، هەروەها پێشکەوتنی پیشەسازی تایبەت بە بواری دروستکردنی کەشتی و قیبلەنوما و باروت و (تەقەمەنی) و جولێنەری کەشتی کە دەیتوانی زەریاکان ببڕێ.

## ٤-هۆکاری ئایینی:

کلێسەی کاسۆلیکی دەیویست دەست بەسەر ئەو ولاتانەدا بگرێت کە تازە دۆزرابوونەوە و سەر بە ئایینی کریستیان نەبوون، لەگەل زیادکردنی لایەنگرانی کلێسە، بۆیە لەگەل هەولەکانی دۆزینەوە جوگرافییەکان قەشە و ڕەبەنەکانیان دەنارد.

## دووەم/ ئەنجامی چاکسازییە ئاینییەکان لە ئەورووپا:

ئاینی کریستیان (مەسیحیەت) ڕووبەڕووی کۆمەڵێک ڕووداو بۆوە، کەبووە هۆی پێویستی ئەنجامدانی چاکسازییە ئاینیەکان لە ئەوروپاو گەڕاندنەوەی ئایینی کریستیان بۆ بنچینە و ڕەسەنایەتی خۆی ئەم هەولانەش پێویستی بە گۆڕانی بنەڕەتی هەبوو لە کڵێسە و دام و دەزگا ئایینی و کارگێڕییەکان.

ڕووداوێکی گرنگیش کە لەناو کڵێسەی کاسۆلیکی ڕووی دا ئەویش ئەوەبوو کە پیاوە ئایینیە کاسۆلیکەکان خۆیان دانیان بە پێویستی ئەنجامدانی چاکسازییە ئایینییەکان نا کە بگونجێ لەگەڵ بارودۆخی ئەو کات، لە پێناوی ئەم مەبەستەش کۆمەڵێک ئەنجومەنی ئایینیان بەست، بەڵام لەم هەوڵانەیان سەرکەوتوو نەبوون، چونکە بڕیارەکانیان لەسەرووی بڕیارەکانی پاپا بوو کە دەیانویست ڕاددەیەک بۆ دەسەڵاتی بێ سنووری پاپا و ئەو هەموو ماڵ و سامانەی دابنرێت کە بۆ کڵێسە دەهات، بەڵام سیستەمی پاپەوی توانی زاڵ بێت بەسەر ئەو تەنگوچەڵەمانە دوای هاتنە سەر تەختی پاپەوی بۆ پاپا (نیکۆلای پێنجەم) لەساڵی (١٧٧٤ز)، ئەم سەرکەوتنەی پاپەوی دوو ئەنجامی لێکەوتەوە :

**یەکەمیان:** شکستهێنانی ئەنجوومەنە ئایینیەکان لە چاکسازیکردن دژ بە خراپەکارییەکانی کڵێسە.

**دووەمیان:** لاوازبوونی دەسەڵاتی ڕۆحی کڵێسە وایکرد کڵێسە سەرکردایەتی ئایینی لەسەرتاسەری ئەوروپای ڕۆژئاوا لەدەست بدات.

هەڵسوکەوتەکانی پیاوانی ئایین و کڵێسەی کاسۆلیکی لەسەرووی هەموویانەوە (پاپا) خۆی لە دوورکەوتنەوە لە کاروباری ئایینی و بایەخدان بەلایەنی دنیاو خۆشی لەزەتی و دەرکەوتنی (پاپایەکان) بە شێوەی میرە (علمانییەکان) کە هەوڵی کۆکردنەوەی سامان و بەهێزکردنی ویلایەتەکانی پاپەوی دەدەن و کارکردن بۆ کۆکردنەوەی زۆرترین سامان و پارە و بە فیرۆدانی ئەم پارەو سامانە لە دروستکردنی کۆشک و تەلار و کڵێسە زیادەڕۆیی لە جوانکاری و نەخشەسازی و ڕازاندنەوەیان، ئەوە بووە هۆی تووڕەیی و بێزاری خەڵک لە ئەوروپا دژی پاپا

و ئیتر وایان لێهات بەئاشکرا رەخنە بگرن لە کڵێسە و (پاپا)، دیارترین ئەو کەسانەی کە سەرکردایەتی کاری رەخنەو داواکاری چاکسازی لە کڵێسە و دژایەتی کەم وکورییەکانی پیاوانی ئایینی و کڵێسە دەکرد (مارتن لوسەر) بوو، مارتن لوسەر (مارتن لوپر) لە ساڵی (١٤٨٣ ز) لە ئەڵمانیا لە دایک بووە و لە ساڵی (١٥٤٦ ز) کۆچی دوایی کردووە. لەیاسا خوێندویەتی و دواتر لە ژیانی زانستی دوورکەوتۆتەوە و بۆتە رەبەن لە دێرێک لە ساڵی (١٥٠٥ ز)دا داکۆکی (جەختی) لەسەر ئەوە دەکردەوە کە رزگاربوون بەهۆی باوەڕەوەیەو بە دەروازەی دانا بۆ ڕزگاربوونی مرۆڤ و چوونە بەهەشت (واتا مرۆڤ لە خوا نزیک دەبێتەوە بەبڕوا بوونی ڕەها بەخوا نەک بەو کارانەی کە کڵێسە لەسەری دەسەپێنێت)، لۆسەر هێرشی دەکردە سەر ئەو بۆچوونانانەی کڵێسە کە (پاپا) دەتوانێت بروانامەی لێخۆشبوون بۆ گوناهەکانی مرۆڤ دەربکات بەرامبەر بەخشین بۆ کڵێسە، ئەم بڕوانامانەش ناسراون بە (مۆرکردنەکانی لێخۆشبوون)، هەروەها ڕایگەیاند کە کتێبی پیرۆز واتا (ئینجیل) سەرچاوەی سەرەکی ئایینی کریستیانە، داواشی کرد پیاوانی کڵێسە دەبێت بکەونە ژێر دەسەڵاتی مەدەنی، هەروەها ڕێگەدان بە قەشە بۆ ژنهێنان. لۆسەر بەردەوام بوو لە بڵاوکردنەوەی بیروڕاکانی تا لایەنگرانی زیادبوو، ناوی کۆمەڵەکەی نارەزاکان (پرۆستانت) مەزهەبە نوێیەکەی لەبەشی باکووری ئەورووپاش بڵاو بۆوە، هەروەها (ئینجیل)ی وەرگێڕا بۆ سەر زمانی ئەڵمانی تا وای لێهات بانگەوازەکانی بۆ چاککردنی کڵێسە مۆرکێکی نەتەوەیی وەرگرت و بووە هۆی دابەشبوونی کڵێسە و مەزهەبی پرۆستانتی سەری هەڵدا.

مارتن لوسەر

## گرنگترین ئەو هۆکارانەی کە یارمەتی دەرکەوتنی بزوتنەوەی چاکسازییەکانی ئایینیدا:

١- خراپەکارییەکانی کڵێسە: لۆسەر پێی وابوو کە ناخۆشی و زەحمەتی خەڵک بەهۆی سەرنەکەوتنی کڵێسەیە لە گەیاندنی پەیامەکەی و بایەخدانی خەڵک تەنها بە ڕواڵەتکارییەکانی ئایینە.

٢- ڕۆڵی بزوتنەوە مرۆڤاییەتیەکە لە بڵاوکردنەوەی بیری ئازاد کە هاندانی خەڵک بوو هێرشکردنە سەر کەموکورتییەکانی کڵێسە لەزۆر بواردا.

٣- زۆر لە میرو فەرمانڕەواکانیش هانی بزوتنەوەی چاکسازی کڵێسەیان دەدا بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت لە دەستتێوەردانی کڵێسە و پاپا لە کاروباری ئەواندا.

٤- هۆکاری ڕاستەوخۆش لە شۆڕشەکەی مارتن لۆسەر دژی پاپا بۆ (مۆرکردنەکانی لێخۆشبوون) دەگەڕێتەوە.

### سێیەم- بوژاندنەوەی ڕووناکبیری و کاری بۆ سەر وریابوونەوەی ڕامیاری

لە کۆتایی سەدەی هەژدەمدا دەوڵەتەکانی ئەوروپا بە تەواوی پێگەیشتن و هەریەکەیان دوای ئەو ئاراستە ڕامیارییە دەکەوت کە سوودی خۆی تیادا دەبینی. پەیمان بەستنە کاتییەکانیش، کە لە نێوانیاندا دەبەسترا، هەر لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی ڕاستەخۆ و سیاسەتی هاوسەنگییە نێو دەوڵەتییەکانی هێزەکانی نێوانیانبوو. لەهەمان کاتدا ئاراستەیەکی کۆمەڵایەتی دژ بەوە هەبوو کە کارکردنەکەی هەر بەهێزتر و پتەوتر دەبوو، ئەویش ڕێبازی بوژانەوەی ڕووناکبیری بوو (English ment) کە خۆرئاوای ئەوروپای گرتبووەوە، چونکە ئەم ناوچەیە دەوڵەتەکانی تری ئەوروپای لە پێشکەوتنی سەرمایەداری و ئابووریدا بەجێ هێشتبوو.

سەرکردایەتیکردنی بۆ دۆزینەوە جوگرافییەکان و دەست بەسەراگرتنی داگیرگەکان (المستعمرات) و فراوانی بازرگانی دەرەوەیان بووە هۆی کەڵەکەبوونی سامانێکی بێ شوومار و دەرکەوتنی چینێکی نوێی چالاک لە کۆمەڵدا، ئەویش چینی بۆرجوازی (ناوەندی) بوو کە کەوتە هاندانی بزووتنەوەی ڕووناکبیری و کەمتەرخەمی لە

ڕووناکبیرە ئازادیخوازەکان بۆ چەسپاندنی مافی خۆیان لە گەیشتنیان بەحوکم و ڕووخاندنی ڕژێمی دەرەبەگایەتی و ڕێبازە بیرکردنەوەکەی. مێژووناسان وا ڕاهاتوون، بوژانەوەی ڕووناکبیری بە بزوتنەوەیەکی فەڕەنسی ڕووت دابنێن، بەڵام لە ڕاستیدا فەڕەنسییەکان سەرکردەی ئەم بزووتنەوەیە بوون ئەگینا تەنیا تایبەت نەبوو بە فەڕەنساو، (هیۆم و کیبۆن و لۆک) لە بەریتانیادا، (کانت و شیلر و گیتە) لە ئەڵمانیادا بەشێکن لەم بزووتنەوەیە کە (ڤۆلتێر و مۆنتسکیۆ و ڕۆسۆ) لە فەڕەنسادا نوێنەرانی بوون.

## بزووتنەوەی بوژانەوەی ڕووناکبیری به سێ نیشانەی تایبەتەوە دەناسرێتەوە

١- **جیهانی بوو لە ڕواڵەتدا**، و بەوەی دژایەتی ئەو بنەمایانەی دەکرد کە سیاسەتیەدەی هەژدەمی لەسەر بەند بوو، بزووتنەوەی ئەدەبی لەدەوڵەتە ئەورووپییە جیاجیاکاندا دوور بوو لە شێوازی ناوچەیی تەسک.

٢- **سیمایەکی مرۆڤایەتی هەبوو** ئەم بیروباوەڕەش نەک پێش ئەم سەدەیە نەزانراو بوو، بەڵکو لەم کاتەدا فراوانتربوو، خەڵکی وا تەماشای ئایین و حکومەت و یاساکانیان دەکرد کە چەند شتێکن لەبەر بەرژەوەندی مرۆڤ دانراون و بەهاکانیان بەوەوە بەندە.

٣- **مۆرکێکی تایبەتی ڕەخنەو گاڵتەجاری توندی پێوە دیار بوو**، سەرکردەکانی ڕەخنەیان لەباری کۆمەڵایەتی و ڕامیاری ئەو سەردەمە دەگرت و گاڵتەیان بەو خوو نەریتانە دەکرد کە خەڵکی بە ڕاستیان تێگەیشتبوون ولایان پیرۆز بوو، بەڵام لەگەڵ گیانی ئەو سەردەمەدا نەدەگونجان، زۆربەی ڕەخنەکانیان ئاراستەی کڵێسە و حکومەت و خراپەکانییان کردبوو.

## هەندێک لە ڕووناکبیرە فەڕەنسییەکان:

تەنیا لە ڤۆلتێر و مۆنتسکیۆ و ڕۆسۆ، کەلە سەرکردەکانی ئەم بزووتنەوەیەن دەکۆڵینەوە بۆ ئەوەی لە سرووشتی و کاریگەری ئەم بزووتنەوەیە بگەین:

### ڤۆلتێر ١٦٩٤ز- ١٧٧٨ز:

ڤۆلتێر لە بەناوبانگترین ڕووناکبیرە فەڕەنسییەکانە و زۆرترین خوێنەری هەبووە. هەرچەندە بیروباوەڕەکانی قووڵ نەبوون و شتێکی تازەی نەهێناوەتە جیهانی بیرکردنەوە کەچی کاریگەرترین فاکتەری بە توانا بووە لە وریاکردنەوەی چینەجیاکانی خەڵکیدا، ئەویش بەوەی گاڵتەجاری و پێکەنیناوی و ڕەخنەی تەزێنەر شێوازی تایبەتی ئەو بووە. گاڵتەی بە کڵێسە و بیروباوەڕەکانی کردووە، پیاوە ئایینیەکان و کردەوەکانیانی بە کەم و سووک زانیوە کاتێک بینیویەتی چۆن هیگۆنۆتەکان (پرۆتستانتە فەڕەنسەییەکان) دەچەوسێنرێنەوە. هێرشی کردۆتە سەر توندڕەوی ئایینی، هەروەها پاشایەتی داوەتە بەر گاڵتەو سووکی. ڤۆلتێر لە نووسینەکانیدا بەرگری لە هەست و شکۆمەندی مرۆڤ دەکرد، کاتێک کتێبە بەناوبانگەکەی ((نامەکان دەربارەی ئینگلیز))ی دانا دادگای باڵای پاریس بڕیاریدا ئەم کتێبە لەبەردەم جەماوەردا بسووتێنرێ، چونکە تیایدا هێرش دەباتە سەر حکومەتەکەی ئەوکاتەی فەڕەنسا. دەتوانین بڵێین کە ڤۆلتێر بە شێوازە گاڵتەجارییەکەی لەداشۆرین و شێوە زمانە ڕوونەکەی و بانگەوازە مرۆڤایەتییەکەی توانیویەتی کارێکی ئاشکرا بکاتە سەر مێژووی سەدەی هەژدەمین و شۆڕشی فەڕەنسا.

### مۆنتسکیۆ ١٦٨٩ ز- ١٧٥٥ ز:

مۆنتسکیۆ توێژەرێکی قووڵی لێکۆڵینەوەی یاسابوو. کتێبەکەی (**گیانی یاساکان**) (Lesprit deslois) دادەنرێت بەباسێکی گشتی لەجۆری حکومەتەکاندا، بەڵام لەدوایدا بوو بە سەرچاوەیەکی گرنگی ئەوانەی بەسیاسەتەوە خەریک بوون، حکومەتی ئەو کاتانەی بەریتانیای لاپەسەند بووە، بۆیە وای لێهاتووە داوای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بکات، چونکە یارمەتی ئەوە دەدات هەریەکەیان چاودێر بێت بەسەر ئەوی تریانەوە، و وای دەبینی کە ئەوە باشترین دەستەبەرییە بۆ سەربەستی گەل

و هێمنی و دادپەروەری. و خەڵکی ئاگادار کردۆتەوە دەربارەی گەندەڵی حکومەتی فەرەنسا، چونکە هەر سێ دەسەڵاتە کە لەژێر دەستی پاشا دابووە.

بەڵام نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە لەبیرکردنەوەیدا دەربارەی جیاکردنەوەی هەردوو دەسەڵاتی جێبەجێ کردن و یاسادانان لە یەکتر لە بەریتانیادا بەهەڵەدا چووە.

## ڕۆسۆ ١٧١٢ ز- ١٧٧٨ ز:

جان جاک ڕۆسۆ

ژان ژاک ڕۆسۆ بەگەورەترین نووسەری سەردەمی خۆی دادەنرێت کە هەست و نەستی جەماوەری وروژاندووە، ئەوەش یامەتی داوە بۆ ئەوەی ببێتە هێزێکی کاریگەر لە ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی و دوای خۆیشی، چونکە لە ڕاستیدا تێکۆشەرێک بووە دژی گەلێک لەو ڕواڵەتانەی خەڵکی بەڕاست و پیرۆزیان زانیوە. کتێبەکەی (**گرێبەستی کۆمەڵایەتی**) یاخود (**پەیمانی کۆمەڵایەتی**) (Contract social) کە لەساڵی ١٧٦٢ز دا دەری کرد، دادەنرێت بە پوختەی بیروڕا سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی، بە ناڕەزاییەکی توند دژی حوکمی زۆردارانە دەست پێ دەکات و دەڵێ ((مرۆڤ بەسەربەستی لە دایک دەبێت، بەڵام لەهەموو شوێنێکدا بە کۆت و زنجیر بەستراوەتەوە)).

وەتیایدا داوای گەڕانەوە بۆ سروشت دەکات بۆ رزگاربوون لە کۆت و زنجیرەی (شارستانێتی). حکومەت بە پێی ڕای ئەو لە دامەزرانیدا قەرزاری پەیمان و گرێبەستێکی کۆمەڵایەتییە، کە پاراستنی خەڵک مسۆگەر بکات بەرامبەر بەمەش خەڵک واز لە هەندێک مافی خۆیان بهێنن بۆ حکومەت. بەم جۆرە حکومەتی ڕاست ئەوەیە لەسەر ئاوات و حەزی خەڵک دامەزرا بێت، گەل بۆی هەیە لە حکومەتەکەی ڕاپەڕێت هەرکاتێک کە زانی لە مەرجەکانی گرێبەستەکە پەشیمان بۆتەوە یان لایداوە.

لەگەڵ ئەوەی ڕۆسۆ یەکەم کەس نەبووە بیردۆزی گرێبەستی کۆمەڵایەتی باسکردبێت، بەڵام یەکەم کەس بووە مافی شۆڕش و ڕاپەڕینی دژی حکومەت داوە، بیروڕاکانی دەنگدانەوەی لە دەروونی هاوچەرخەکانیدا هەبووە و کاری کردۆتە سەر نەوەی داهاتووش.

### ئەنسکلۆپیدییەکان (الموسوعیون):

لەپاڵا ئەو ڕووناکبیرانەدا، کە کاریگەریان هەبوو بۆ هاندان و ڕێنمایی خەڵکی، کۆمەڵێک هەبوون کە ناسرابوون بە (ئەنسکلۆپیدییەکان) لە سەرووی هەموویانەوە دیدرۆ (Diderot) کاری ئەمانە بریتی بوو لە دانانی ئەنسکلۆپیدیایەک (دائرە معارف) کە تیایدا جۆرەکانی حکومەتیان ناساندوە. ڕەخنەیان لە ڕژێمی ئەو کاتەو کڵێسە گرتووە، خەڵکیان دەربارەی کەم و کورتییەکانی کۆمەڵگەکەیان هۆشیار کردۆتەوە.

### فیزیۆکراتییەکان (ئابووریناسە سروشتییەکان):

کۆمەڵێکی تر هەبوون ناسرابوون بە (فیزیۆکراتییەکان) (Physiocrois) (ئابووریناسە سروشتییەکان) ئەمانە بیروڕای ئابووریناسی بەناوبانگ (**ئادەم سمث**) (Adam Smith) و کتێبەکەی (**سامانی نەتەوەکان**) (Wealth of Nation) کاری تێکردبوون، (میرابۆ) وتاربێژی شۆڕش باشترین نوێنەری ئەم کۆمەڵە بوو لە فەڕەنسادا، ئەوانە گەلێک کتێب و نووسراویان دەربارەی شیکردنەوەی بیروڕا ئابوورییەکان داناوە، کشتوکاڵیان بە تاکە سەرچاوەی سامان زانیوە، داوای سەربەستی بازرگانی نێوان نەتەوەکان و لابردنی باجە جۆربەجۆرەکانیان دەکرد و تەنیا باجی زەوییان دەهێشتەوە. داوایان لە حکومەت دەکرد دەست نەخاتە نێو کاروباری ئابوورییەوە، بەڵکو پێویستە وازی لێبێنێت شێوەی سروشتی خۆی وەربگرێت وە کورتەی ئەم بیروڕایەیان لە ڕستە بەناوبانگەکەیدا خۆی دەنوێنێت (Faire Laissez) (واز لەکاروبار بێنە چۆن دەڕوات با بڕوات). وایان دادەنا کە ئەم بیروڕایانە بۆیان هەیە سیستەم و خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵا بگەڕێنێتەوە.

### کاریگەری بزووتنەوەی ڕووناکبیری لە فەڕەنسادا:

لە شاکارەکانی ئەم بزووتنەوە ڕووناکبیریە لەفەڕەنسادا، وروژاندنی هەستی خەڵکی و ڕزگارکردنی بیرو هۆشیان و ئاگادارکردنەوەیان بەرامبەر کەموکوڕییەکانی کڵێسە و خراپی ڕژێمی حوکم بوو، بۆیە هێزو توانایانی یەکخست و کەوتنە هەوڵی چاکسازی و داواکردنی سەربەستی و یەکسانیان هەرچەندە ببێتە هۆی شۆڕش بەرپاکردن دژی ڕژێمە حوکمڕانییەکانیان.

## باری فەڕەنسا پێش شۆڕش:

بەرپابوونی شۆڕشی ساڵی ١٧٨٩ز لەفەڕەنسادا بەتەنیا ڕوداوێکی گرنگی لە مێژووی ئەم وڵاتە نییە، بەڵکو لە هەموو مێژووی ئەوروپا و جیهانیشدا ئەویش لەبەر ئەو بیروباوەڕانەی لەگەڵ خۆی هێنانی و ئەو جەنگانەی شان بەشانی بەرپابوون و ئەو گیروگرفت و کودەتا ڕامیاری و کۆمەڵایەتیانەی سەریان هەڵدا.

### ١- باری ڕامیاری و کارگێڕی:

پاشای فەرەنسا دەسەڵاتێکی فراوان و بێ سنووری هەبوو، بەڵکو خۆی سەرچاوەی هەموو دەسەڵاتەکان بوو، هەر ئەو وەزیرەکانی دادەناو و هەر خۆشی دەبردن، جەنگی هەڵدەگیرساند و پەیمانی دەبەست و باجی دادەنا چۆنی دەیویست پارەی خەرج دەکرد. مافی دانانی یاساو لابردنیشی هەبوو، دەست کراوە بوو لە کاروباری گەلەکەیدا.

لەتوانایدا بوو فەرمان بدات، بە نامەیەکی مۆرکراو هەرکەسێکی بوێت بێ لێپرسینەوە و دادگایکردن بگیرێت و بەند بکرێت،

پاشا لەمانە پشتی بە (بیردۆزی مافی خودایی) بەستبوو لە حوکمدا



کۆشکی ڤرسای

ئـەو مافـەش تەنهـا بـۆ بەرژەوەنـدی تایبەتـی خـۆی بـەکاری دەهێنـا، وڵاتیشـی دووچـاری چەندین جەنـگ کـرد کـە جگـە لەشکست هیچی تـری لێنەکەوتـەوە، خەرجییەکانـی کۆشـکی پاشـایەتی سـاڵی ١٧٨٩ز گەیشـتە ڕادەییەکـی ئەوتـۆ کـە بـاوەڕ نەدەکـرا لەبـەر زۆرییەکـەی، تەنانـەت بودجـەی گشـتی فریـای ئـەم هەمـوو خەرجییانـە نەدەکـەوت.

ڕژێمـی کارگێڕیـش هەمـوو گێرەشـێوێنیەکی حوکمـی تیـا بـەدی دەکـرا، لەگـەڵ ئـەو یەکێتیـە ڕامیارییـە ڕووکەشـەی کـە فەڕەنسـای تیـا دەژیـا هەر لەسـەردەمی لویسـی چواردەهەمەوە، کـە بـاڵا دەسـتی ڕامیـاری خانەدانەکانـی لەنـاو بـرد، کەچـی وڵات هـەر بەشـلۆقی مایـەوە، ئەمیـش گەلـێ هـۆی هەبـوو:

لویسی پازدە

**وەکو جۆراو جۆری یاساو ڕژێم و کێشانە و پێوانە کە هەرناوچەیەک یاساو نەریتی تایبەتی خۆی هەبوو سەرەڕای جیاوازی سنووری ناوچەکان، چونکە لە دابەشکردنەکانی کارگێڕی دا ڕەچاوی بەرژەوەندی گەل و سروشتی وڵات نەکرابوو، کە بەدوای ئەمەشدا جیاوازی باج و گومرگ دەهات، باجی گومرگ تەنیا لەسەر بازرگانی دەرەوە نەبوو، بەڵکو باجی ناوخۆیی نێوان ناوچەکانیش هەبوو کە ئەمەش کۆسپی خستەبەردەم ڕێگای بازرگانی ناوخۆیی ناوچەیەک و ناوچەیەکی تر.**

### ٢- باری ئابووری و دارایی:

باجـەکان گەلێـک گـران بـوون و بـە شـێوەیەکی دادپەروەرانـە دابـەش نەکرابـوون، زۆربەیـان بەسـەر چینـی زۆربـەی میللەتـدا سـەپێنرابوو، باجـی خانووبـەرەی چەسـپاو (باجـی موڵکداری) تەنیـا ملـی ئەوانـی دەگرتـەوە و خانـەدان و پـاوە ئایینیەکانـی لـێ بەدەربـوون، سـەرانە بەنـاو هەمـوو دانیشـتوانی دەگرتـەوە کەچـی پیـاوە ئاینییـەکان دیسـان لێـی بەدەربـوون، بەرامبـەر پارەیەکـی کـەم کـە نـاو بەنـاو دەیانـدا بـە پاشـا،

خانەدانەکانیش پارەیەکی کەمی وایان دەدا لەگەڵ سامانەکانیاندا نەدەگونجا، ئەمە سەرەڕای باجە لاوەکییەکان وەک باجی خواردنەوەکان و (باجی خوێ)، فەڕەنسییەکان زۆر رقیان لە باجی خوێ دەبۆوە، چونکە شێوەیەک بووە لە شێوەکانی حوکمی زۆردارانە، حکومەت بەرهەمی خوێی لە چنگی خۆیدا قۆرخ کردبوو هەموو کەسێکی ناچار دەکرد هەندێک خوێ بەنرخێکی دیاریکراو بکڕێت، ئیتر ئەوەی نەیبێت با سکی خۆی بە نانی ڕەق تێر بکات. نرخەکەش لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاواز بوو حکومەت ڕاستەوخۆ ئەم باجانەی نەدەسەند، بەڵکو بەکرێ دەیدایە هەندێ کەس پاش ئەوەی لەسەر پارەیەکی دیاریکراو بۆ هەرباجێک لەهەر ناوچەیەکدا ڕێک دەکەوتن و ئەو کاتە باج وەرگرەکە دەسەڵاتێکی زۆری دەدرایە بۆ کۆکردنەوەی و شتێکی ئاساییە کە ئەویش هەموو ڕێگایەکی دەگرتە بەر لە پێناو کۆکردنەوەیاندا و بەشی زۆری بۆ خۆی وەلادەنا.

### ٣- باری کۆمەڵایەتی:

کۆمەڵگەی فەڕەنسی لە سێ چین پێکهاتبوو، (خانەدانەکان و پیاوە ئاینییەکان و زۆربەی میللەت)، کە زۆربەی میللەتیش جوتیاران و چینی بورجوازی (ناوەندی) دەگرتەوە ئەوانەی کە دژی چینی خاوەن مافە تایبەتییەکان بوون، ئەویش لەبەر نەگونجانی بەرژەوەندییان لەگەڵیاندا. ئەو خانەدانانەی کە دەسەڵاتی سیاسی خۆیان لەسەردەمی **ریشیلیۆ**[1] دۆڕاندبوو، مافە تایبەتییەکانی خۆیان هەر پاراستبوو، ئەوانە سەرەڕای بەخشینیان خۆیان لە زۆربەی باجە مەدەنی و ئاینییەکان گەلێک ماف و تایبەتی تریشیان هەبوو پشتاوپشت بۆیان مابۆوە کە ئەوانەش لە پاشماوەکانی چینی دەرەبەگایەتی بوون، بەڵام پیاوە ئاینییەکان هیچ باجێکیان لەسەر زەوی و زارەکانی کڵێسە نەدەدا کە دەگەیشتە نزیکەی پێنج یەکی هەموو زەوی و زاری فەڕەنسا، بێجگە لەو دیاریانەی ناوبەناو دەیاندا بە پاشا، سەرەڕای ئەوەش باجی خۆیان لە میللەت دەسەند وەکو باجی دەیەک و ژنخوازی و.... هتد، بەڵام زۆربەی

---

[1] ریشیلیۆ: وەزیری پاشای لویسی سیازدەهەم (١٦١٠ز- ١٦٤٣ز) کە چاپوکێکی سیاسی بووە و دەسەڵاتی پاشای چەسپاندووە و لە خانەدانەکانی داوە.



ریشیلیۆ

چینی ئەم پیاوە ئاینییانە لە کولەمەرگیدا دەژیان، چونکە گەورەکانیان دەستیان بەسەر سامان و داهاتی کڵێسەدا گرتبوو و پێویستییە ئایینیەکانی سەرشانیان جێبەجێ نەدەکرد، بەڵکو هەموو ئەرکێکیان خستبووە سەرشانی قەشە بچووکەکانەوە بەرامبەر کرێیەکی کەم و ئەویتریان لە ڕابواردن و ئارەزووی خۆیاندا خەرج دەکرد. کەواتە سەیر نییە ئەمانە لەپاڵ زۆربەی میللەتدا بوەستن کاتێک ڕاپەڕین بۆ داوای مافی خۆیان و داواکردنی یەکسانی لەگەڵ گەورە پیاوە ئاینییەکاندا بێت.

بەڵام چینی زۆربەی میللەت وەکو وتمان جوتیاران و بۆرژوازییەکانی دەگرتەوە کە بێبەشبوون لە هەموو مافە تایبەتییەکان، و ئەرکی باجدان و بێگاری (السخرە) و بەزۆر سەربازیان کەوتبووە سەرشان. ئەمان زۆربەی هەرە زۆر بوون، و زانیمان چۆن دۆزینەوە جوگرافییەکان یاریدەی پێگەیشتنی چینی بۆرژوازی (ناوەندی) داو داکۆکیان لە شاکان دەکرد دژی ڕژێمی دەرەبەگایەتی. لە ڕاستیدا ئەم چینە جیاوازە لەگەڵ چینی زۆربەی میللەتدا، چونکە گەلێکیان بوون بە پارێزەرو پزیشک و نووسەر و مامۆستا، واتا چینێکی ڕووناکبیرە و هەست بەباری کۆمەڵایەتی و ئابووری دەکات و دەزانێت لەگەڵ پایە ڕامیاریەکاندا ناگونجێت و پایە نزمەکەی خۆی لە چاو خانەدانەکان و پیاوە ئایینیەکاندا دەبینێت. و بەو جۆرە کە بەرژەوەندییەکانی دژ بە بەرژەوەندی خاوەن مافە تایبەتییەکان دەوەستا لەگەڵ بەرژەوەندی گشتی یەکی دەگرتەوە. ئەوەش پاڵی پێوەنا ببێتە پێشەوای شۆڕش کە هەڵی دەدا بۆ تێکشکاندنی ڕژێمە کۆنەکەو ڕێگە خۆشکردن بۆ گەیشتن بە حوکم و بەدەستهێنانی مافە ڕامیارییەکانی پاش بەدەستهێنانی هەموو پێداویستییە ئابوورییەکانی.

## سەرەتاکانی شۆڕشی فەرەنسی:

لــە پێشــەوە زانیمــان ئــەو بووژانــەوە ڕووناکبیرییــەی نووســەر و فەیلەســووفە فەرەنسییەکان سەرکردایەتییان دەکرد چۆن بەرەنگاری حوکمی رەها و نایەکسانی و یاسای پاراستنی بازرگانەکان بۆوە و داوای ئازادی تاک و (کۆشکی ڤێرسا) لێبووردەیی ئایینی و ئازادی لە کارە ئابوورییەکاندا دەکرد، خەڵکی لەو بەندایەتی و چەوساندنەوەیەی تیایدا دەژیان هۆشیارکردەوە و ڕای گشتی دژ بەباری ئەو سەردەمە جۆشدا. گومانی تیا نییە بینیمان کۆمەڵگەیەکی وەکو کۆمەڵگەی فەرەنسی دواکەوتوو لە باری کۆمەڵایەتیدا، بەڵام هەست کردوو بەدواکەوتوویەکەی و هۆکارەکانی، ئاژاوەو سەرگەردانی باڵیان بە سەردا کێشابوو. لە ڕاستیدا ناڕەزایی گشت خەڵکی گرتبۆوە و ئارەزوویەکی لە ڕادە بەدەر پاڵی پێوەدەنان بۆ خۆڕزگار کردن لە ڕژێمەکەیان، بەڵام چاوەڕوانی هەلێکی لەباریان دەکرد.



## قەیرانی دارایی و کۆبوونەوەی ئەنجومەنی چینەکانی میللەت:

لویسی چواردەهەم دواپاشای بەهێزی بنەماڵەی بۆربۆن بوو کە فەرەنسا بە خۆیەوە بینی ، لەگەڵ ئەو هەموو هێزو شان شکۆیەی فەرەنسا لەسەردەمی لویسدا تیایدا دەژیا، کەچی لەپاش خۆی گەلێک کێشەی وای بەجێ هێشت وڵات بەدەستیانەوە دەیناڵاند. بۆ نموونە چەوساندنەوەی (هیگۆنۆت) ژمارەیەکی زۆریانی ناچارکرد وڵات بەجێبهێڵن، جا ئەگەر زانیمان ئەمانە لە ئەندامە گورج و گۆڵەکانی بەرهەمهێنان بوون و بەشێکی زۆری سامانیان لە دەست دابوو، ئەوکاتە دەتوانین ئەم زیانە گەورەیەی لە ئەنجامی ئەم کارە لە فەرەنسادا کەوت دەست نیشان بکەین، هەروەها ئەو جەنگە زۆرانەی لە دوادوای حوکمەکەیدا بەرپای کرد، وڵاتی زۆر بێ هێزکردو توانای لێ بڕی بەتایبەتی لە باری ئابووریدا تا لویس خۆی ناچار بوو لەساڵی (١٧١٣ز)دا بە پەیمانی **ئەتراخت**[٢] ڕازی ببێت کە زۆر لە پایەی فەرەنسای لە چاو دەوڵەتە گەورەکاندا هێنایە خوارێ.

ئەوەی زیاتر بێ هێزی کرد و بەرەو ڕووخاندنی برد، لویسی پانزەیەمی جێنیشینی بوو، کە هیچ هەوڵی چاکسازی نە دا، بەڵکو کەوتە ڕابواردن و ژیانی کەیف و خۆشی و، کاروباری دەوڵەتی بۆ دەست و پێوەندەکانی لە خانەدانەکان و وازلێهێنابوو، ئەوانەی هیچ بەتەنگ کاروباری وڵاتەوە نەدەهاتن بێجگە لە مسۆگەرکردنی بەرژەوەندییەکانیان و پارێزگاری مافە تایبەتییەکانیان نەبێت، بۆیە فەرەنسا لە ئەنجامی شەڕی حەوت ساڵە (١٧٥٦-١٧٦٣) ئەو موڵکانەی لە هیند و جیهانی نوێدا مابوون دۆڕاندی و بووە هۆی کەمبوونەوەی دەسەڵاتی لە سیاسەتی دەرەوە و باری دارایشی بەرەو خراپتر و تێکچوون دەچوو.

---

٢پەیمانی ئەتراخت: لە ئەنجامی ئەو جەنگەدا بەسترا کەلەسەر تەختی ئیسپانیا لەنێوان فەرەنسا و نەمسا بەرپابوو، فەرەنسا بەشێک لە موڵکەکانی لە ئەمەریکا دۆڕاند.

## لویسی شازدەیەم:

کاتێک ساڵی ١٧٧٤زاینی پاشایەتی کەوتە دەست لویسی شازدەهەم، بارودۆخەکە نالەبارتر بوو، بارودۆخەکان نیشانەی وێرانییەکی تەواویان پێوە دیاربوو، ئەگەر بە هۆشمەندی و لێزانی ئارەزوویەکی ڕاستەقینانەی چاکسازی نەبێت. لویس ئارەزووی هەبوو لە چاکسازی وڵاتەکەی و ڕزگارکردنی لەو کارەساتانەی کە خەریک بوون ڕووبەڕووی دەبنەوە، بەڵام باری دەوروبەری خۆی پێ هەڵنەدەسەنگێنراو نەیدەزانی چ ڕێگەیەک بگرێت بۆ ئەو چاکسازییە پێویستانە، و نابێت

لویسی شازدەیەم

کارتێکردنی دەست و پێوەند و کۆشکمان لەبیر بچێت کە بەرهەڵستیان لێدەکرد لەو چاکسازییانەی دەویست پێی هەڵسێت، بەتایبەتی کاتێ زانیمان خۆی گەلێک ڕاراو بێ دەسەڵات بووە و لەسەر ڕایەک جێگیر نەدەبوو، جڵەوی بەدەست ماری ئەنتوانێت ژنە نەمساویەکە بووە. ماری بە ئامانجی پەیداکردنی خزمایەتی ژن و ژنخوازی نێوان هەردوو خێزانی بۆربۆن و هبسبۆرگ شووی بە لویس کرد، ئەو جۆرە ژنخوازی و شووکردنەیە کە ئامانجەکەی تەنها بەهێزکردن و پتەوکردنی ڕایەڵی پەیوەندییە ڕامیاریەکانە، بەڵام گەلی فەڕەنسا بەچاوێکی ڕق و کینە تەماشای شاژنی دەکرد، چونکە ڕقیشی لە بنەماڵەی هبسبۆرگ بوو، ماری بە پێچەوانەی مێردەکەیەوە بەهێزبوو، توانا و زیرەکیەکی بێ هاوتای هەبوو، بەڵام لە هەڵسوکەوتیدا ڕقاوی و سەرکێش بووە، شارەزای نەریت و خووڕەوشتی فەڕەنسییەکان نەبووە، نەیتوانی لەناخ و دەروونی گەلی فەڕەنسا پێداویستییەکانی لەڕووی چاکسازیەوە بگات. هەستی بەهەڵوێستی ڕاستەقینەی مێردەکەی نەدەکرد، هەر لەسەر دەست بڵاوی و ڕابواردنی خۆی بەردەوام بوو لەگەڵ ئەو نابووتییە زەقەی دارایی کە دەوڵەت تێی کەوتبوو.

# ئەنجومەنی نیشتمانی

لویسی شازدەهەم هەوڵی دا ئەو تەنگژە (قەیرانە) داراییە لە ڕێگەی سەپاندنی باجی زیاترەوە چارەسەر بکات، بۆیە بانگهێشتی ئەنجومەنی چینەکانی میللەتی کرد بۆ کۆبوونەوە کە پێکهاتبوون لە پیاوانی کەنیسەو خانەدانەکان و زۆربەی میللەت لەوێ ئارەزووی خۆی پیشان دا بە سەپاندنی باج بەسەر چینی زۆربەی میللەت و پاشان دوو چینەکەی تریش (پیاوانی ئایینی و خانەدانەکان)، بەڵام ئەوان ڕێگەی دەنگدانیان بەکارهێنا بەپێی ئەو بنەمایەی کە هەر چینێک مافی دەنگێکی هەیە، لە ئەنجامدا توانیان وابکەن کەوا باج بەسەریاندا نەسەپێنرێت، بۆیە ناکۆکی دروست بوو لەسەر چۆنیتی گۆڕینی سیستەمی دەنگدان کە بەشێوەیەک بێت هەر نوێنەرێک دەنگێکی هەبێ و هەرسێ چینیش لەیەک هۆلاکۆ ببنەوە، داخوازییەکانی چینی زۆربەی میللەت وەڵام نەدرانەوە، هەربۆیە ئەوانیش کۆبوونەوەیەکی تایبەت بە خۆیان بەست و ناویان لەخۆیان نا (ئەنجومەنی نیشتمانی) لەسەر بنچینەی ئەوەی نوێنەری ٩٦٪ی هەموو ئەندامانی میللەتن و هەر کەسێکیش لە نوێنەرانی هەردوو چینەکەی تر بهاتنایە پاڵیان، ئەوا پێشوازیان لێ دەکردن، پاشان سوێندیان خوارد و ئەوەیان ڕاگەیاند کە بڵاوەی لێ ناکەن تا دەستوورێک بۆ فەرەنسا دادەنرێ، لە ئەنجامی ئەمەشدا بەشێک لە نوێنەرانی پیاوانی ئایینی و خانەدانەکان هاتنە پاڵ ئەنجومەنەکە، بۆیە پاشا ناچاربوو بەفەرمی دان بە ئەنجومەنی نیشتمانی دابنێ، بەڵام سوور بوو لەسەر ئەوەی هەل بەدەست بێنێت و کاروبار بە هۆی هێزەوە بگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی. لەوەشدا دەست و پێوەندەکان و لەسەرووی هەموویانەوە شاژن هانیانی دەدا، ئەنجومەنیش بەردەوام کۆدەبۆوە پاش ئەوەی زانی سەربازەکان لە پاریس و ڤرسای خەریکی گەلەکۆمەکین.

نیشتمانپەروەرەکان لە هەڵسوکەوتی پاشا ترسان و کاتێک داوایان لێکرد سەربازەکان لە پاریس دووربخاتەوە داوایەکەیانی ڕەتکردەوە و خێرا (نیکەر)ی لە کارخست و یەکێک لە لایەنگرانی خۆی لە شوێنی دانا، ئەوەش بووە هۆی هەڵچوونی ڕای گشتی و وتاربێژەکان لەسەرووی هەموویانەوە (مارا و دیمۆلان) بە وتارە ئاگرینەکانیان جەماوەریان دەورووژاند و هانیان دەدان بۆ شۆڕشکردن و لە ئەنجامدا هێرشیان بردە سەر بنکەی (ئەنفلید) و چی چەکێکی تیادابوو دەستیان بەسەرداگرت.

## کەوتنی باستیل:

لـە چـواردەی گەلاوێـژدا جەمـاوەر ڕوویـان لـە قـەڵای باسـتیل کـرد کـە بـە هەڵـە وایـان دەزانــی کـۆگای چەکـە، پـاش پێکدادانێکـی گـەرم فەرمانـدەی قەڵاکە و سـەربازەکان خۆیان بەدەسـتەوەدا شۆڕشـگێڕەکان خۆیـان کوتایـە نـاوی و هەمـوو بەندکراوەکانیـان ئازادکـرد و بـە پـاچ و بێڵەکانیـان کەوتنـە دیوارەکانـی کە بـە نیشـانەی زۆرداری و سـتەمیان دانابـوو. ڕووخانــی باســتیل لــە بــاری ســەربازییەوە گرنـگ نەبـوو، بەڵکـو گرنگـە ڕامیاریەکـەی زۆر گەورەتـر بـوو، چونکـە پـاش ڕووخاندنـی هەڵچوونێکـی گشـتی پاریسـی گرتـەوە و شۆڕشـگێڕان حکومەتێکیـان پێکهێنـا بـۆ پاراسـتنی ئاسـایش و لەشـکرێکیان لـە خۆبەختکـەران (المتطوعیـن) دروسـت کـرد کـە بـە (پاسـەوانی نیشـتمانی) ناسـرابوو، (لاڤاییـت) یـان بـۆ سـەرۆکایەتی کردنـی هەڵبـژارد، بەمـەش پاریـس کەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی شۆڕشـگێڕانەوە. گیانـی شـۆڕش بەهەمـوو لایەکـی فەڕەنسـادا بڵاوبـووە و خەڵـک لـە هەرێمـە جیاجیاکانـدا هێرشـیان دەبـردە سـەر قـەڵاو کۆشـکی خانەدانـەکان و ئـەو تۆمارنامانەیـان دەسـووتاند کـە مافـی خانەدانـە دەرەبەگەکانـی تێـدا چەسـپێنرا بـوو، ژمارەیەکـی زۆر لەوانـە ڕایـان کـردە وڵاتانـی دەورووپشـت. پاشـا ناچـار بـوو دان بـەو بـارە نوێیـەدا بنێـت، هەروەهـا بەرلـە ڕووداوەکانـی باسـتیل فەرمانـی بـە هێزەکانیـدا لـە پاریـس بکشـێنەوە و (نیکـەر)ی گەڕانـدەوە شـوێنی خـۆی دانـی بـە حکومەتـی شۆڕشـگێڕاندا نـاو بڕیاریـدا بـە دانانـی لاڤاییـت بەسـەرکردەی پاسـەوانی نیشـتمانی.

## کردەوەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی:

پاش ڕووخاندنی باستیل، ئەنجومەنی نیشتمانی بە تەواوی بە هێزبوو، دەستی بەو کارانە کرد کە بڕیاری دابوو پێی هەڵسێ لە پێناو سوودی گەلی فەرەنسیدا، وە لە کۆبوونەوەی (٤ی ئاب ١٧٨٩ز)دا (مافە تایبەتییەکانی خانەدانەکانی نەهێشت و لەگەڵا هەموو ئەو ئەرکانەی کە پابەندبوون بە ڕژێمی دەرەبەگایەتییەوە و جیاوازی نێوانی چینەکانیشی سڕیەوە، هەروەها بەندایەتی لابرد و یەکسانی لەنێو خەڵکیدا لەکاری مەدەنی و سەربازییدا ئاشکرا کرد) بەڵام بەشێکی زۆر لەخانەدانەکان لەسەرووی هەموویانەوە (کۆنت ئەرتوا)ی برای پاشا، فەرەنسای بەرەو سنووری باکوری خۆرهەڵات بەجێهێشت وەکو نارەزاییەک بەرامبەر ئەو کردەوانە و لە پاشاندا بە (کۆچکەران) ناسران و لەوێوە دەستیان کرد بە پیلانگێڕی دژی شۆڕش و پاشایەکانی ئەوروپایان لێ هاندەدا. پاش ئەوە بەچەند ڕۆژێک ئەنجومەن گەلاڵەنامەی (مافەکانی مرۆڤ)ی ئاشکرا کرد، کە لە دەقەکانیدا ئازادی خەڵکی تیایدا هاتووە سەرەرای یەکسانیان لە مافەکان و ئەرکەکاندا و هیچ کەسێکیش لەوی تر پلەی زیاتر نییە مەگەر ئەوەی کە بەرژەوەندی گشتی پێویستی دەکات، هەروەها مافە سروشتییەکانی مرۆڤی تیایدا هاتووە.

### هەڵوێستی پاشا بەرامبەر ئەنجومەن:

پاش ئاشکراکردنی مافەکانی مرۆڤ، پاشا کەوتە ترس و لەرز و هەرگیز ڕازی نەبوو دانی پێدا بنێت و بەلای دەست و پێوەندەکانیەوە زۆر نەنگ بوو کە بیروباوەڕی شۆڕش ئاوا سەرکەوێ کە دوژمنی ئەوانە، پاشا داوای هێزی ئۆردوگای فلاندەری پشتگیری کرد بۆ ئەوەی خۆی لەپاڵیدا بپارێزێت، بەڵام هاتنی ئەم تیپە کێشەکانی زیاتر کرد، چونکە لە کاتێکدا گەل لە پاریسدا بەدەست برسیەتییەوە دەیناڵاند، هەواڵی ئەو میوانداریەی لە ڤرسای دا بۆ ئەو سەربازانە کرا بڵاوبۆوە کە لەپەڕی تێر و تەسەلی و دەست بڵاویدا بوو، هەڵچوونە خەڵکی بەهێزتربوو و، پۆل پۆل ژنان کە دار (خوترمە)یان بەدەستەوەبوو، تۆپیان ڕادەکێشا پیاوە

چەکدارەکانیش لە پشتیانەوە بوون لە پاریسەوە بەرەو ڤرسای دەچوون و داوای نانیان دەکرد و توانیان خۆیان بگەیەننە کۆشکی پاشاوە، بەڵام گەیشتنی لاڤاییت لەگەڵ بەشێک لەپاسەوانی نیشتمانیدا نەیهێشت شۆڕشگێڕان و پاشا ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە، لویس بڕیاریدا بۆ هێمن کردنەوە و دڵنەوایی جەماوەری ڕاپەڕیوو خۆی و خێزانەکەی بچنە پاریس و بڕیار لەسەر گەڵاڵەنامەی مافەکانی مرۆڤ بدات.

ئەنجومەنی نیشتمانی لە ئەنجامی گواستنەوەی پاشا چووە پاریس و لە کۆبوونەوەکانیدا بەردەوام بوو، کەوتە ئامادەکردنی دەستوور و لەو ماوەیەدا گەلێک کردەوەی ئەنجام دا کە گرنگییەکەی لەدەستوور خۆی کەمتر نەبوو، پێشتر ئاماژەیان بە هەڵوەشانەوەی مافە تایبەتییەکان و ئاشکراکردنی مافەکانی مرۆڤ کرد، لەو کارە گرنگانەی ئەنجوومەن هێنایەدی (هەڵوەشانەوەی دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتی کۆنی وڵات بوو و دابەشی کرد بۆ (٨٣) هەرێم کە تا ڕادەیەک ڕووبەرەکانیان لەیەکەوە نزیک بوون، لەسەر هەر بەشێک ناوی دیارترین ڕواڵەتی سرووشتی لە ڕووبار و چیا لێنا. بۆ هەر هەرێمێک ئەنجومەنێکی بەڕێوەبردنی پێک هێنا کە لەخەڵکی هەرێمەکەوە هەڵبژێردران بۆ ئەوەی سەرپەرشتی کاروبارەکانی ناوخۆیی بکات) و تا ئێستاش ئەو دابەشکردنانە کاری پێدەکرێت.

هەروەها ئەنجومەن ڕژێمێکی دادوەریی نوێی ئامادەکردو دەستی کرد بەدانانی ئەو یاسایانەی کە لەگەڵا پرەنسیپە نوێیەکاندا دەگونجا.

کاتێک ئەنجومەن ڕژێمی دارایی کۆن و پاشکۆی باجەکانی لابرد خۆی لەکورت هێنانێکی داراییدا بینیەوەو ئەوەش ناچاری کرد موڵکەکانی کڵێسە بخاتە ژێر دەسەڵاتی میللەتەوە و بۆ ئەمەش (دەستووری مەدەنی پیاوە ئاینییەکان)ی دانا، تیایدا پیاوە ئاینییەکانی بە فەرمانبەری حکومەت داناو بە هەڵبژاردن دادەنرێن و مووچەی دیاریکراویان بۆ دانرا، هەروەها دەستی گرت بەسەر زەوی و زارەکانی کڵێسەدا و بەوەش پەیوەندی نێوان پاپاو کڵێسەی فەڕەنسی پچڕاند.

## هەڵهاتنی پاشا و دەست بەسەر کردنی:

کردەوەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی لەچاو پاشا و دەست و پێوەندەکانیدا زیادەڕۆیی بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندیان بە موڵکەکانی کڵێسە و پیاوە ئایینیەکانەوە هەبوو، وا لە (لویس) زانرابوو کەخاوەن هەستێکی ئایینی بەهێزبوو، بۆیە بڕیاریدا وڵات بەجێ بهێڵێت.

لە ٢١ی حوزەیرانی ١٧٩١ز خۆی و ژن و منداڵەکانی بە خۆگۆڕدراوی، کۆشکەکەیان بەجێهێشت و بەگالیسکەیەک بەرەو سنووری خۆرهەڵات دەرچوون، بەڵام هەرزوو لەسەر سنوور لە شاری ڤارین (Vareene) ئاشکرا بوون لەنێوان هەرا و هاواری سوکایەتی پێکردنو قێزلێکرنەوەوە گەڕاندیانەوە بۆ پاریس. ڕاکردنەکەی پاشا کارێکی خراپی بۆ سەر ڕای گشتی لە دەرچوونی هەبوو پاشای بەرامبەر گەل و خیانەتکاریەتی بۆ مەسەلەکەی و گەلێک خۆپیشاندان ڕوویدا و جەماوەر داوای لابردنی پاشا و ڕاگەیاندنی کۆماریان دەکرد، بەڵام ئەنجوومەن کە زۆربەی ئەندامەکانی (پاشاویستە دەستوورییەکان) بوون، هەوڵیدا بیانوو بۆ ڕاکردنەکەی بدۆزێتەوە و کارەکانی وەستاند تا لەئامادەکردنی دەستوور دەبێتەوەو ئەوسا پاشا سوێندی دڵسۆزی بۆ بخوات.

## دەستووری یەکەم (دەستووری ١٧٩١ز):

ئەنجوومەن لەدوا دوای ئەیلولی ١٧٩١زدا، لەدانانی دەستوور بە شێوەی کۆتایی بۆوە و پاشا بڕیاری لەسەر داو سوێندی خوارد پارێزگاری بکات، ئەم دەستوورە لەسەر بنچینەی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دانرابوو دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی دا بە پاشا لەگەڵ مافی سەرکردایەتی سوپاو هەڵبژاردنی وەزیرەکانیشی، بەڵام نەک لە ئەندامانی دەسەڵاتداریەتی یاسادانان بن، پاشا (مافی ڕەتکردنەوەی) دیاری کراوی (Veto) هەبوو. بەڵام دەسەڵاتی یاسادانان درا بەئەنجومەنێک ناسرا بە (ئەنجومەنی یاسادان) ئەندامەکانی بە دوو پلە هەڵبژێردران بە پێی چەند مەرجێکی تایبەتی.

لە ئەنجامی ئەوەدا ئەنجومەن ئاشکرای کرد کە کۆتایی بە ئەرکی سەرشانی هێناوە و ئەندامەکانی بڕیاریاندا لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی بۆ ئەوەی لە خۆبوردنیان بسەلمێنن، کە بۆ هیچ یەکێکیان نییە لە ئەنجوومەنی یاسادانانی داهاتوودا بە ئەندام هەڵبژێردرێت و خەڵکی وایان زانی شۆڕش کۆتایی پێهات.

# ئەنجومەنی یاسادانان

ئەنجوومەنی یاسادانان لە یەکی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٧٩١ز)دا بەسترا و لەگەڵ ئەنجوومەنی نیشتمانیدا جیاواز بوو بەوەی ئەندامەکانی لاو بوون و زیاتر لەنیوەیان لە سی ساڵ تێنەپەڕیبوون، ئەمەش وای لێکرد زیاتر لەوەی پێشوو گورجتر و خوێن گەرمتر بێت. ئەرکی سەرشانە ئەم ئەنجومەنە تەنها جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی دەستوور و پاراستنی کردەوەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی بوو. ئەندامانی ئەنجوومەنەکە بەسەر دوو پارتی سەرەکیدا دابەش بووبوون ئەوانیش: **پارتی ڕاسترەوی میانڕەو** (**معتدل**) و **پارتی چەپڕەوی شۆڕشگێڕ**. پارتی یەکەم لە ئەندامانی پاشاویستەکان پێکهاتبوو، ئەوانەی پشتگیری پاشایەتییەکی پابەند بە دەستووریان دەکرد، بەڵام دووەمیان لە شۆڕشگێڕان و کۆمارییەکان پێکهاتبوو کە دەیانویست پاشاییەتی نەمێنێت و ڕژێمی کۆماری ئاشکرا بکرێت و بەچی نرخێک بێت ئەنجامەکانی شۆڕش بپارێزرێت کە بەناوبانگترینیان **یەعقوبییەکان**[3] و **گیرۆندییەکان**[4] بوون. توێژێکی سێیەم هەبوو کە هیچ ڕایەکی ئاشکرای نەبوو هەڵپەرست بوون، لە ئەنجوومەنەکەدا دەچوو پاڵ ئەو پارتەی بەهێزترەو دەتوانین بە (پارتی مام ناوەندی) ناو بنێین.

## ئەو کێشانەی ئەنجوومەنی یاسادانان تووشی هات:

ئەنجوومەن خۆی بەرامبەر گەلێک گیروگرفتی قورس بینیەوە کە بۆ نموونە باری ناخۆش هەر شلۆق بوو بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەبوو بەپاشا و هەڵوێستی گومان لێکراوی پیاوە ئاینییەکان لە شۆڕش لە دەرەوە کۆچەران هەر خەریکی ئەوە بوون پاشاکانی ئەوروپا لە شۆڕش هان بدەن بە ئومێدی

٣ یەعقووبییەکان: ئەم کۆمەڵە لەسەرەدەمی ئەنجومەنی نیشتمانی لەبەشێک لە نوێنەرانی هەرێمی بریتانی پێکهات و کاتێک ئەنجومەن گوێزرایەوە پاریس ئەندامەکان دێرێکی یەعقوبییەکانیان کردە شوێنی نیشتەجێ بونیان و بەوەوە ناونران و پایەی ئەم پارتییە گەورەبوو و زۆر لەڕۆڵەکانی میللەت چوونە پاڵی و گەلێک لقی لە لاکانی فەڕەنسادا دامەزراند.

٤ گیرۆندییەکان: بەم ناوەوە ناسراون بە گوێرەی هەرێمی گیرۆند، چونکە زۆربەی سەرۆکەکانیان نوێنەری ئەم هەرێمە بوون.

گەڕانەوەی دەسەڵات و مافە تایبەتییەکانیان و لەکاتێکدا دەوڵەتانی ئەورووپا پاشاو میری زۆردار و کۆنەپەرست حوکمی دەکردن. ئەوانەی لە ترسو دڵەڕاوکێ دابوون کەکڵپەو بڵێسەی شۆڕش وڵاتەکانیان بگرێتەوە و لە هەل دەگەڕان لەشۆڕش و بیروباوەڕەکانی بدەن. کاتێک (لیۆپۆڵد)ی برای شاژن ماری ئەتوانێت هاتە سەر تەختی نەمسا لەساڵی ۱۷۹۰ز، خوشکەکەی پەنای بۆ برد تا خۆی و مێردەکەی لە ترسی شۆڕش ڕزگار بکات، هەروەها بیروباوەڕەکانی شۆڕش وردە وردە لە زەوییە نزمەکانی نەمسا کاری خۆی دەکرد، نەمسا هەستی کرد کە پێویستە بۆ ئەوە کاربکات کە شۆڕش لە ئاستی خۆیدا ڕابگرێت.

کاتێ دەنگوباسی گرتنی لویس و ئەندامانی خێزانەکەی بیست کاتێ ویستیان هەڵبێن گەیشتە ئیمپراتۆر (لیۆپۆڵد) زۆر بێزار بوو بە هاوبەش لەگەڵ پاشای پروسیادا، گەلێک هەڕشەی دەکرد گرنگترینیان **بلاوکراوەی** (**پلنتز**) (Plinitz) لە ئابی ۱۷۹۱زدا بوو تیایدا ئاشکرایان کرد کە بەرژەوەندی پاشاکانی ئەورووپا لەوەدایە دوو دڵ نەبن لەگەڕانەوەی پاشای فەرەنسا بۆ دەسەڵاتدارێتی ئەم هەڕەشانەش دەنگدانەوەیەکی بەهێزی لەفەرەنسادا هەبوو هەڵچوونی ڕای گشتی توندتر کرد، چونکە ئەوەی بەدەست خستنە ناو کاروبارە تایبەتییەکانی دەزانی.

## بەشداریکردن لە جەنگەکانی دەرەوە:

ئەنجومەن کاتێ بینی چاری نییە و دەبێ لەجەنگ بەشداری بکات، بۆیە بڕیاری دا هەر کۆچکەرێک نەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی ناپاکە و دەست بەسەر موڵکەکانیدا دەگیرێت، هەر کەسێک لە پیاوە ئاینییەکان سوێندی ملکەچی بۆ دەستووری مەدەنی نەخوات لە وڵات دوور دەخرێتەوە.

پاشا ناچاربوو لە (۲۰) نیسان ۱۷۹۲زدا، جەنگ دژی نەمسا ڕابگەینێ و (لاڤاییت)ی کردە سەرکردەی گشتی سوپاکانی فەرەنسا و پاشاش جەنگی دەویست بەئومێدی ڕزگاربوون لەشۆڕش و گێڕانەوەی دەسەڵاتداریەتییەکەی. کاتێک پرووسیا پاڵی دایە پاڵ نەمسا (**برۆنسویک**) سەرکردەی گشتی پرووسیا بوو بە سەرۆکی گشتی سوپا هاوبەشەکان کە کۆببوونەوە بۆ هێرشکردنە سەر فەرەنسا. لەدەست پێکردنی

جەنگدا فەرەنسییەکان هەندێ شکستیان بەخۆیانەوە دی، بەڵام کاتێک لەپاریسدا هەرەشەکەی برۆنسویک لەگەلی فەرەنسی (٢٥ی گەلاوێژ) بڵاوبۆوە کە دەیەوێت هەموو نیشانەکانی شۆرش لەناو بەرێت و پاریس وێران بکات ئەگەر پاشایان یەکێک لە ئەندامانی خێزانەکەی بە ئازار بگەیەنن. خەڵکی وایان زانی پاشا دەستی لەگەڵ دوژمنەکاندایە و پیلانە جەنگییەکانیان بۆ ئاشکرا دەکات. وا رێکەوت لەم کاتەدا وەفدێکی پاسەوانی نیشتمانی لەمرسیلیاوە گەیشتە پاریس و سروودی مارسلیزیان دەوت کە ئەفسەر (رۆجیە دی لیل Rouget de Lisile) دایناببوو، خەڵکی بەتەواوی گڕ و کڵپەی سەند و شۆرشگێرەکان هەلیان بەدەست هێناو سەرکردایەتی خۆپیشاندانێکی گەورەیان کرد و هێرشیان بردە سەر کۆشکی تۆیلری و دەوری پاشایاندا ئەویش خۆی خێزانەکەی پەنایان بردە بەر ئەنجوومەن. خۆپیشاندەرەکان داوای پێویستی لابردنی پاشایان کرد، بەڵام ئەنجوومەن ئەو کارەی وەستاند تا ئەنجوومەنێکی نیشتمانی تازە پێکدێت و ئەویش بەناوی (کۆنگرەی نیشتمانی) ناسرا، بۆ تێروانین لە مانەوەی پاشایەتی یان لابردنی. لاڤاییت هەوڵیدا بەرهەڵستی بریارەکەی ئەنجوومەن بکا بۆ رزگارکردنی پاشا، بەڵام سووپاکەی ملی بۆ نەداو ناچار رایکرد وکاتێک سوپاکانی دوژمنان چوونە هەرێمی (لۆرین) و گەمارۆی ڤردۆن (Verdun)یاندا، گرۆتینی گەلی فەرەنسا بۆ دوورخستنەوەی مەترسی لەسەر وڵات زیاتربوو و دەستەیەکی جێبەجێ کردن بۆ بەرێوەبردنی وڵات بەسەرۆکایەتی دانتۆن پێکهات و شارەوانی (پاریس)ی کردە نیشتەجێی خۆی پاش دەرکردنی ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی تیایدا و ناسرا بە (کۆمۆن).

هەموو دەسەڵاتدارییەکانی وڵاتی کەوتە دەست، هەروەها لیژنەیەکی تایبەتی بەسەرۆکایەتی (مارا) بۆ چاودێری دوژمنانی شۆرش پێکهێنا و ژمارەیەکی زۆری لێ خستنە بەندیخانەکانەوە.

کاتێک دەنگوباسی کەوتنی ڤردۆن گەیشت و دوژمنان گەیشتنە دەوروبەری پاریس، ژمارەیەک لە بەندکراوەکان نێردران بۆ مەقسەلە (مل پەراندن) و بەشێکی تریشیان بە بیانووی پشتگیری دوژمنانەوە لە بەندیخانەکاندا کوژران.

بـەڵام دیمۆرییـە کـە لەسـەرکردایەتیدا شـوێنی لاڤاییتـی گرتـەوە توانـی ڕێگـەی گەڕانـەوە لـە سـوپاکانی (برۆنسـویک) بگرێت ئەویش بـە خۆڕاگرتـن لـە بەرزاییەکانـی ڤالمـی (Valmy)و سـووپای پروسـی ناچـار کێشـایەوە، وە لەبـەر ئـەوەی لـەم کاتـەدا پرووسـیا خەریکـی کێشـەی پۆڵەندەبـوو لەگـەڵ ڕووسـیادا، بۆیـە هـەر دوولایـان لەسـەر شـەڕ ڕاگرتـن ڕێککەوتـن و بـە شـێوەیەکی کاتـی مەترسـی لەسـەر فەڕەنسـا لاچـوو، ئەنجوومەنـی یاسـادانان ڕۆژی گەیشـتنی دەنگوباسـی سـەرکەوتنەکانی دیمۆرییـە، کارەکانـی تـەواو بـوو.

## کۆنگـرەی نیشـتمانی

کۆنگـرەی نیشـتمانی لـە زۆرتریـن ئەندامـە دیـار و بەرزەکانی دوو ئەنجومەنەکەی پێشـوودا پێکهاتبـوو. کاتێـک لـە ٢٠ی ئەیلولـی ١٧٩٢زدا کرایـەوە، دوو پارتـە سـەرەکییەکەی نـاو ئەنجوومـەن یەعقوبییـەکان کـە شـوێنی خۆیان لەسـەر کورسـییەکانی سـەرەوەی هۆڵەکەدا گرتبـوو و بەپارتـی شـاخ ناسـران و ئەوانـە پشـتگیری ڕژێمـی نوێیـان دەکـرد لەسـەروو هەموویانـەوە مـارا و ڕۆبسـبیر و دانتـۆن، ئەمجـا (گیرۆندییـەکان) کەلـە (یەعقوبییـەکان) کەمتـر نەبـوون لـە پشـتگیری بیروباوەڕەکانـی شـۆڕش و پارێزگاریکردنی، بـەڵام میانڕەوتر بـوون و ڕقیـان لـە توندوتیـژی و خوێـن ڕشـتن دەبـۆوە.

هەندێـک لـە ئەندامـە بـێ لایەنەکانیـش هەبـوون، بـەڵام هـەرزوو لەژێـر کاریگـەری ڕای گشـتی چوونـە پـاڵ پارتـی شـاخەوە. ئەرکەکانـی سەرشـانی کۆنگـرە زۆربـوون، (یەکەمیـان تێڕوانینـی کێشـەی پاشـایەتی، پاشـان بەرەنگاربوونـەوەی جەنگـی دەرەوە و کارکـردن لـە پێنـاوی چەسـپاندنی ئاسایشـی ناوخـۆ، لەکۆتاییـش دانانی دەسـتوورێکی نـوێ بـۆ وڵات. لـەڕۆژی دووەمـی کۆبوونەوەکانیـدا کۆنگـرە بڕیـاری لابردنـی ڕژێمـی پاشـایەتی و ئاشـکراکردنی کۆماریـدا. بڕیاریـدا کـە پێویسـتە پاشـا بدرێت بـەدادگا بـە تاوانـی هـاوکاری لەگـەڵ دوژمنەکانـدا دژی مانـەوەی فەڕەنسـا) و کاتێک لویسـی شـازدەم بەرامبـەر کۆنگـرە حوکـم درا فەرمانـی حوکمەکـەی بەلـە سـێدارە دەکـراو لـە ٢١ی کانوونـی دووەمـی ١٧٩٣ز بردیانـە بـەر (مەقسـەلە) و کوشـتیان. کاتێـک دەنگوباسـی پێشـکەوتنی سـوپاکانی دیمۆرییـە لـە (بەلجیـکا)دا لـە ئەنجامی سـەرکەوتنیدا لە شـەڕی

(**جیماب**) بەسەر نەمساوییەکاندا (٦ی تشرینی یەکەمی ١٧٩٣ز) گەیشت گرووتینی گەلی فەرەنسا بۆ شەڕو کوشتار بەهێزتر بوو، وای لێهات سوپاکانی کۆنگرە بە بەرگریکردن لە نیشتمانەوە نەوەستان، بەڵکو کەوتنە کار لە پێناوی ڕزگاری کردنی نەتەوەکانی ئەوروپا. ئەوەبوو کۆنگرە ئاشکرای کرد کە هیچ درێغی ناکات لە ناردنی یارمەتی بۆ هەر گەلێک دەیەوێت لە فەرمانڕەوا زۆردارەکانی ڕزگاری بێت بەمەرجێک وڵاتە ڕزگاربووە کە ئەرکی بەخێوکردنی سوپای فەرەنسا بگرێتە ئەستۆ. سوپای فەرەنسی توانی (نیس و سافۆی) لە پاشانیشی سەردینیا بگرێت، لە ئەنجامی ئەم سەرکەوتنانەدا بیردۆزی (**سروشتی**)[5] هاتە کایەوە و فەرمانڕەوا توندڕەوەکان هێنانەدییان بە پێویست زانی).

## هاوپەیمانی یەکەمی ئەوروپاو دژی فەرەنسا:

کوشتنی لویسە شازدەهەم لەلایەک و دەرکەوتنی فراوانخوازی فەرەنسی کە سیستەمی (هاوسەنگی هێزی ئەوروپی) تێکدا لەلایەکی ترەوە، ڕق و ناڕەزایی دەوڵەتە ئەوروپییەکانی جوولاند و بەریتانیاش لەسەرەتای ساڵی ١٧٩٣زدا چووە پاڵ نەمسا و پڕوسیا توانی پەیمانێک پێک بهێنێت ئەم دەوڵەتانە و هۆڵەندە و ئیسپانیا و سەردینیا بگرێتە خۆی. سوپای فەرەنسا ڕووی کردە شکستی کاتێک نەمساوییەکان سوپاکانی دیمۆرییەیان لە نیروندن (Neerwinden) شکاندو بەلجیکایان سەندەوە، دوژمنانی شۆڕش ئەم هەلەیان قۆزتەوە و کەوتنە خۆشکردنی ئاگری یاخیبوون لە کۆمار و لە هەرێمی (لاڤاندییە) یاخیبوونێک دەرکەوت. و چەند شارێکی تریشی گرتەوە لەوانە (مرسیلیاو تۆلۆن).

---

[5] سنووری سروشتی: ئەو بیردۆزەیە کە دەڵێت: پێویستە سنووری ئەلب و ناوچەی ڕاین بچنە پاڵ نیشتمانی فەرەنسی لەسەر بنچینەی ئەوەی چەند بەشێکی کۆنن لە فەرەنسادا.

# سەردەمی تۆقاندن

یەعقوبییەکان بەرامبەر توندبوونی مەترسی دەرەوە و بەرپابوونی شۆڕشی ناوخۆ وایان بەباش زانی پەنابەرنە بەر حوکمی دیکتاتۆری و بەشێوەیەکی کاتی دەسەڵات بخەنە ژێر دەستی خۆیانەوە. کۆنگرە بڕیاری پێکهێنانی دوو لێژنەی دا.

**یەکەمیان:** (لێژنەی ئاسایشی گشتی) کە کارەکەی ڕێکخستنی بەرگریکردن لە نیشتمان و زاڵبوون بەسەر دوژمنەکانی شۆڕش لەناوخۆدا بوو.

**دووەمیان:** (دادگای شۆڕش) کە ئەرکەکەی تاوانبارکردنی هەرکەسێکەکە گومانی ملکەچی لێبکرێت بەرامبەر کۆمار.

فەڕەنسا سەردەمی حوکمێکی تۆقاندنی بەخۆوە بینی کە زەبرەکەی پاش ناپاکی دیمۆرییە و هەڵهاتنی بۆ نەمسا توندتر بوو. یەعقوبییەکان دەستیان کرد بەڕیسواکردنی گیرۆندییەکان لە هاورێیانی دیمۆرییە و ئەوپەڕی دڵڕەقیان لە کوژاندنەوەی ئاژاوەکانی ناوخۆدا بەکارهێنا تا توانیان بەسەریاندا زاڵ بن و بانگ ڕاهێشتنی یاسای بەزۆر سەربازکردن و بەرزکردنەوەی ورەی جەماوەری فەڕەنسی و هەوڵدانەکانی (**کارنۆ**) لە پێناوی ڕێکخستن و پڕچەک کردنی سوپادا، ئەمەش یارمەتی وەستاندنی کشانی سوپای هاوپەیمانەکانی بۆ سەر فەڕەنسادا، بەو جۆرە بۆ نیشتمانی فەڕەنسا ڕێککەوت لەمەترسی دەرەوە ڕزگاری بێت، بەڵام ئەو سیاسەتە توند و تیژەی یەعقوبییەکان لەسەری ڕۆیشتن بووە هۆی دووبەرەکی لە نێوان سەرکردە شۆڕشگێڕەکان خۆیاندا و هەندێکیان مەیلیان بەلای میانڕەوی دا دەچوو وەکو (دانتۆن) کە پێیان وابوو هیچ پێویستییەک بە فەرمانڕەوایی تۆقاندن نەما، بەڵام (ڕۆبسبیر)و کۆمەڵەکەی وایان دەبینی کە پێویستە لەسیاسەتی تۆقاندن و توندی بەردەوام بن، کۆتایی ئەم دووبەرەکییە ئەوە بوو ڕۆبسبیر بە تەنیا حوکمی گرتە دەست و دوژمنەکانی ناردنە بەر (مەقسەلە) و هەر بەردەوام بوو لەسیاسەتی تۆقاندندا ولەوەدا ئەنجوومەنی شارەوانی پاریس (کۆمۆن) (Commune) یارمەتی دەدا. بەڵام لە دواییدا خۆی لەبەردەم لێژنەی ئاسایشی گشتی و کۆنگرەدا بینیەوە و فەرمانی لەسێدارەدانی درا و نێردرا بۆ مەقسەلە. لە ئەنجامی ئەم ناکۆکییەدا ژمارەیەکی زۆر لەسەرکردەکانی شۆڕش تیایدا چوون سەرەڕای ژمارەیەکی گەورە لە دوژمنانی شۆڕش و ئەوانەی تاوانبارکران بەکۆنەپەرستی و خیانەتکاری.

## کۆتایی سەردەمی تۆقاندن:

بەمردنــی ڕۆبســبیر فەرمانڕەوایــی تۆقانــدن کۆتایــی هــات. ئەندامــە میانڕەوەکانــی کۆنگــرە زاڵبــوون، بۆیــە کۆنگــرە لێژنــەی ئاسایشــی گشــتی و دادگای شۆڕشــی لابــرد، هەروەهــا یاســا نائاســاییەکانی نەهێشــت، و لێبووردنــی گشــتی دەرکــرد بــۆ بەندکــراوە سیاســییەکان و کەوتــە ئامادەکردنــی دەســتوور، بــەڵام لایەنگرانــی ڕۆبســبیر خراپــی بــاری ئابووریــان بەهــەل زانــی و خۆپیشــاندانێکیان ڕێکخســت و جەمــاوەری ڕاپەڕیــو هێرشــیان بــردە ســەر هۆڵــی کۆنگــرە، بــەڵام کۆنگــرە توانی بەســەر دوژمنەکانیــدا زاڵبێت و بزووتنەوەکەیانــی کوژانــدەوە. ڕزگارکردنــی ئەندامانــی کۆنگــرە و بــڵاوە پێکردنــی خۆپیشــاندەرەکان دەگەڕێتــەوە بــۆ ئەفســەر ناپلیــۆن کــە ئەرکــی پاراســتنی کۆنگــرەی پــێ ســپێردرابوو، کــە بەبــێ سـڵەمینەوە خۆپیشــاندەرەکانی دایــە بــەر ڕێژنــەی ئاگــر و نزیکــەی دووســەدی لێکوشــتن.

## کارەکانی کۆنگرەی نیشتیمانی:

پــاش تەواوبوونــی ســەردەمی تۆقانــدن کۆنگــرە خەریکــی دانانــی دەســتوورێکی نــوێ بــوو بــۆ وڵات بــە دەســتووری ســاڵی ســێیەم لــە ســاڵی ١٧٩٥ز هێنایــەدی و دواتــر ئاشــکرای کــرد کــە کاری تــەواو بــوو.

نکووڵــی ناکرێــت کــە کۆنگــرەی نیشــتیمانی گەلێــک خزمەتــی پێشــکەش بــە فەرەنســا کــرد (کــە ســەرەڕای ڕزگارکردنــی وڵات لــە مەترســی دەرەوە و زاڵبوونــی بەســەر شۆڕشــەکانی ناوخــۆدا و پارێزگاریکردنــی لــە بیروباوەڕەکانــی شــۆڕش و کۆمــار). لەگــەڵ ئــەو کۆســپ و تەگەرانــەی دەوریــان دابــوو، کەچــی توانــی گەلێــک چاکســازی بــە ئەنجــام بگەیەنــێ لــە بــواری کۆمەڵایەتــی و ئابوورییــەوە لەوانــە (**یاســای مەدەنی فەرەنسا دانــا، مۆزەخانــەی لۆڤــەری لــە پاریــس دامەزرانــد، گەلێــک فێرگــەی بــاڵ دروست کــرد، بــەزۆر خوێندنــی چەسپاند، وسیستەمێکی نوێی بۆ پێوان و کێشــان دانــا، ئەویش ڕژێمی دەیــی یــان مەترییە کە تــائێســتاش کاری پێدەکرێت، لەگــەڵ چەندین چاکســازی دیکــەدا**).

# حکومەتی بەڕێوەبردن

دەسەڵاتی یاسادانانی نوێ بەپێی دەستووری ١٧٩٥ز (دەستووری ساڵی سێیەم) لە دوو ئەنجوومەن پێکهات:

**یەکەمیان:** ئەنجوومەنی نوێنەران یان (ئەنجوومەنی پێنج سەدی) و ژمارەی ئەندامەکانی پێنج سەد ئەندام بوو کە بەکاروباری یاسادانان هەڵدەستان.

**ئەویتریان:** ئەنجوومەنی پیران بوو کە ژمارەی ئەندامەکانی٢٥٠ئەندام بوو کە تەمەنیان لە ٤٠ ساڵی کەمتر نەبوو، کارەکەشی بژارکردن و چەسپاندنی یاساکان بوو.

بەڵام دەسەڵاتی جێبەجێکردن درا بە ئەنجوومەنێکی پێنج ئەندامی کەناسران بە بەڕێوەبەرەکان کەلە کۆبوونەوەیەکی هاوبەشدا هەردوو ئەنجوومەنەکە هەڵیان دەبژێرن و هەموو ساڵێک ئەندامێکیان بە هەڵبژاردن لێ دەگۆڕێت. ئەم ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنە وەزیرەکان دادەنێت و بەرامبەری لێپرسراو دەبن و یاساکان جێبەجێ دەکات و فەرمانبەرە گەورەکان و سەرکردەکانی سوپا دادەنێت، لە دەقێکی دەستوورەکەدا هاتبوو کە دەبێت دوو لەسەر سێی دەسەڵاتی یاسادانان لە خولی یەکەمیدا لە ئەندامەکانی کۆنگرە بێت بۆ یاریدەی مانەوەی حوکمی کۆماری و ڕزگارکردنی وڵات لە دەسەڵاتداریەتی توندڕەوەکان یان کۆنەپەرستەکان.

ئەو بارودۆخەی حکومەتی بەڕێوەبردنی پێدا تێپەڕی سەخت بوو، باری ئابووری وڵات و دارایی حکومەت بەشێوەیەکی تایبەتی بەرەو تێکچوون دەڕۆیشت.جەنگی دەرەوە هێشتا هەر بەردەوام بوو. حکومەتیش هەموو کۆششێکی تەرخان کردبوو بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتن لە جەنگەکانی دەرەوە. (کانۆ) کە بەرێکخەری سەرکەوتن ناسراوبوو، دیارترین و بەتواناترین ئەندامەکانی حکومەتی بەڕێوەبردن بوو و بەردەوام بوو لە ئامادەکردنی سوپا کاتێک حکومەت بڕیاریدا هێرش بەرێتە سەر نەمسا لە ئیتاڵیادا و سوپایەکی بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکرد (ناپلیۆن پۆناپارت) بۆ سەرکردایەتی کردنی هەڵبژارد. کە پێشتر سوپای بەریتانیای بەرپەرچ دایەوە کە لە ساڵی ١٧٩٣ز کاتێ بەندەری (تۆلۆن)یان گەمارۆ دابوو،لە بەرگریکردنی لە کۆنگرەی نیشتیمانی ساڵی ١٧٩٥ز ڕۆڵی کارای هەبووە.

ناپلیۆن سەرکردایەتی سوپای کرد لە چیاکانی (ئەلب) و سوپای سەردینیای شکاند و بەسەر (تۆرینۆ)ی پایتەختیدا کشاو پادشاکەی ناچارکرد شەڕی لەگەڵ ڕابگیرێت و واز لە ساڤۆی ونیس بێنێت بۆ فەڕەنسا، پاشان ناپلیۆن لە ڕووباری (پۆ) پەڕیەوە و دەشتەکانی (لۆمباردیا)ی لە سوپاکانی نەمسا داگیرکرد و چووە (میلانۆ)وە وهەردوو میری (بارما)و(مۆدینا) سەریان بۆ شۆڕکرد، هەروەها (پاپا)ش کەوازی لە هەندێک ویلایەتەکانی ئیتاڵیا هێنا بۆ فەڕەنسا و ناپلیۆن دەستی کرد بە پێشکەوتن بەرەو (ڤیەننا)، ئەوەش نەمسای ناچارکرد **پەیمانی** (**کۆمبۆفۆرمیۆ**)لە ١٧ تشرینی یەکەمی ١٧٩٧ز داببەستێت و بەگوێرەی ئەم پەیمانە نەمسا دانی بەوەدانا، ڕووباری ڕاین سنووری فەڕەنسا بێت و وازی لە زەویە نزمەکان نەمسا و دوورگەکانی ئەیۆنیا هێنا، هەروەها لە میلانۆش بەرامبەر کۆماری بوندقییە کە بخرێتە پاڵ نەمسا، هەروەها دانی بەو گۆڕانکاریانەدا هێنا کە ناپلیۆن لە باکووری ئیتالیادا کردبووی. بەم جۆرە پەیمانبەستنی یەکەمی دژی کۆماری فەڕەنسی لەناوبرد.

## هێرشی فەڕەسا بۆ سەر میسر

تەنیا بەریتانیا مابووە دژی فەڕەنسا چەکی هەڵکێشابوو، حکومەتی بەڕێوەبردن بڕیاریدا، بۆ لێدانی بەریتانیا هەلێکی باش وەدەست بێنی. کاتێک شۆڕشی ئیرلەندی ساڵی ١٧٩٨ز بەرپابوو، هەوڵیدا یارمەتی بدات، بەڵام نەیتوانی جارێکی تریش هێرشێکی بۆ لێدانی بەریتانیا ڕێکخست، بەڵام بەهۆی هێزو تواناکانی کەشتیگەلی بەریتانیا لە دەریادا نەیتوانی بەریتانیا داگیربکات. حکومەتی بەڕێوەبردن بیری کردەوە کە باشترین هۆ بۆ لێدانی بەریتانیا داگیرکردنی میسرە، بەمەش هەڕەشە لەڕێگای هاتوچۆی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا بۆ هیندستان دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا میسر لەلایەن مەمابیوکانەوە حوکم دەکرا و بەناویش هێشتا لە ژێر دەسەڵاتی سوڵتانی عوسمانی دابوو، سەرکردایەتی هێرشەکە درا بە ناپلیۆن بۆناپۆرت ساڵی ١٧٩٨ کە ناوبانگی لە داگیرکردنەکانی ئیتاڵیا دەرکردبوو، بەڵام هێرشەکە شکستی هێناو نەیتوانی هیچ کام لە ئەنجامەکانی بەدی بهێنێ، بۆیە ناپلیۆن سووپاکەی لەمیسر بەجێهێشت و خۆیشی بەنهێنی گەڕایەوە فەڕەنسا بۆ ئەوەی کوتادەیەک ئەنجام بدات دەسەڵات بگرێتە دەست.

## بەشی دووەم

# ناپلیۆن پۆناپرت

### ١-ژیانی:

ناپلیـۆن پۆناپـۆرت لـە شـاری (ئەجاکسـێو)ی پایتەختـی دوورگـەی کۆریسـکا لـە ١٥ەی ئابـی سـاڵی ١٧٦٩ز دا لـە دایـک بـووە، بـە فەڕەنسـی لەدایـک بـووە، چونکـە فەڕەنسـا ئـەم دوورگەیـەی پێـش لەدایـک بوونـی کڕیبـوو. ناپلیـۆن لـە فەڕەنسـا خوێندوویەتـی و لەبیـرکاری و هونـەری جەنگیـدا سـەرکەوتوو بـووە و بـە پلـەی مولازمـی دووەم دەرچـوو، بیرباوەڕەکانـی (جـان جـاک ڕۆسـۆ) و شۆڕشـی فەڕەنسـی کاری تێکـردوون و هـاوکاری لەگـەڵ پارتـی (یەعقوبیەکانیـدا) کـردووە، ڕەنگـە ئـەوەش بەهـۆی حـەزی خۆدەرخسـتن بووبێـت نـەک بڕواهێنـان بـە بیروباوەڕەکانـی شـۆڕش و دڵسـۆزی بـۆ ڕاکان بووبێـت و لەگەمارۆدانـی (تۆلـۆن) دا ناوبانگـی دەرکـرد، لـە سـاڵی ١٧٩٦ز دا (جۆزفیـن)ی خێزانـی یەکێـک لـە سـەرکردە کوژراوەکانـی سـوپای فەڕەنسـی هێنـا و ئەویـش یارمەتیـدا لـە ناسـینی یەکێـک لـە سـەرکردەکانی حکومەتـی بەڕێوەبردنـدا.

### ٢- ناپلیۆن پۆناپرت (کۆنسۆلی یەکەم)

### هاوپەیمانی دووەمی ئەورووپا دژی فەڕنسا:

ناپلیـۆن لـە میسـر بـوو کاتێـک هەڕەشـەی دەوڵەتـە ئەورووپییـەکان دژی فەڕەنسـای بیسـت، کـە هاوپەیمانـەکان هاوپەیمانیەتـی دووەمیـان پێکهێنـا لـە بەریتانیا و نەمسـا و ڕووسـیا بـە خێرایـی گەڕایـەوە، توانـی کوتادەیـەک (هەڵگەڕانەوەیـەک) لـە نـاو حکومـەت بەڕێوەبـردن بەرپـا بـکات لـە سـاڵی ١٧٩٩ز دا لـە کاتێکـی وا لەبـاردا خـۆی بکاتـە فەرماندەیەکـی هەرەبـەرز.

## دەستووری کۆنسوڵییەت:

پاش ئەوە دەستوورێکی دانا و تیایدا کۆماری ئاشکرا کرد و خۆی بووە کۆنسوڵی یەکەم، بەڵام بەپێیی دەقی ئەم دەستووره حکومەت لە (سێ کۆنسۆل) و **ئەنجومەنێکی پیران** پێکدێت کە پێدێت کە کۆنسوڵی یەکەم ئەندامەکانی دادەنێت. ئەنجومەنی یاساکان دەکۆڵێتەوە بێ ئەوەی دەنگیان لەسەر بدات و ئەنجوومەنی یاسادانان دەنگ لەسەر ئەو یاسایانە دەدات بێ ئەوەی لێی بکۆڵێتەوە، کاری ئەنجومەنی پیران بریتییە لە چاوخشاندنەوە دەستووریەتی ئەو یاسایانە.

بەڵام پێشنیاری یاساکان لە دەسەڵات کۆنسوڵی یەکەمەوە، وادەردەکەوێت شێوەی ئەم حکومەت لەسەر بنچینەی هەڵبژاردنی گەلەوە دامەزرێت، بەڵام ڕاستییەکەی لە ئەنجامدا لە دەستی کۆنسوڵی یەکەمدا کۆبۆتەوە، هەروەها وای لێهات کە باڵ بکێشێت بەسەر بەڕێوەبردن و سیاسەتی دەرەوە و سەرکردایەتی سوپاشدا.

## لە ناوبردنی پەیمانبەستنی دووەم:

ناپلیۆن خۆی تەرخان کرد بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هاوپەیمانی دووەم، و توانی ڕووسیا والێبکا، کە لەو هاوپەیمانیەتی بکشێتەوە هاریکاری لەگەڵ ئەو و پروسیا و سویدا بکا بۆ بەگژداچوونەوەی بەریتانیا، بەو شێوەیە ناپلیۆن توانی ئامادە و دەستخاڵی ببێ بۆلێدانی نەمسا، ئیتاڵیای داگیر کردوو، لە **شەڕی مارنگۆ** (Marengo) حوزەیرانی ساڵی ١٨٠٠ز دا .

بەسەر نەمسا سەرکەوت و ناچاری کرد کە **ڕێکەوتنی لونڤیل** (Luneville)ی لەگەڵ ببەستێ کە دانی بەبەندەکانی **پەیماننامەی** (**کۆمبۆفۆرمیۆ**) دا نەیتوانی لە دەریادا بەسەری زاڵبێت، هەروەها بەریتانیاش دیسان نەیتوانی لەوشکانیدا ناپلیۆن بشکێنێت و لەبەر ئەوە هەردوولا لەم ناکۆکییەدا بێزاربوون، بۆیە پەیماننامەی ئاشبوونەوەیان لەساڵی ١٨٠٢زدا بەست کەپێی دەوترێت **پەیماننامەی ئەمیان** (Amien) بەپێی ئەم پەیماننامەیە بەرتانیا پەیمانی دا شوێنە داگیرکراوەکان کەلەکاتی جەنگدا دەستی بەسەریاندا گرتبوو بیگێڕێتەوە بۆ فەڕەنسا، جگە لە هەردوو دوورگەی سیلان لە (ئاسیا) و ترینیداد لە (ئەمریکا)، و واز لەماڵتەش بێنێت بۆ دانیشتوانی، بەڵام ئەم دوورگەیە لە ڕاستیدا هەر بەدەستی بەریتانیا مایەوە و ئەوەش لە هۆکانی ئەو ناکۆکییە بوو کە دواتر لە نێوان بەریتانیا و ناپلیۆندا پەیدا بوو.

## ٣- کردارەکانی ناپلیۆن

ناپلیۆن لەکاتی کونسوڵیەتی یەکەمی لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتیدا گەلێ کاری گرنگی ئەنجامدا بەتایبەتی پاش پەیماننامەی ئەمیان وە، دەتوانین ئەم کاروکردەوانە لەمانەی خوارەوەدا کورت بکەینەوە:

**یەکەم:** ناپلیۆن بەردەوام بوو لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی شۆڕشی فەڕەنسی، لەکاتی جەنگەکانیدا وڵاتەکانی بەناوی (**ڕۆڵەی شۆڕش**)ەوە دەگرت و بیروباوەڕەکانی بڵاودەکردەوە، ئەوەش یاریدەیدا هەڵستێت بە ڕزگارکردنی ئەو شوێنانەی لە ئەوروپادا کە هێشتا شوێنەواری سەدەکانی ناوەڕاستی لێ مابوو.

**دووەم:** ناپلیۆن بایەخی بەڕێکخستنی حکومەت و بەڕێوەبردندا و هەموو دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی بەرپرسیار بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی ویلایەت دانا. ناپلیۆن خۆی ئەو بەڕێوەبەرانەی دادەنا، واتە ناپلیۆن سەرۆکەکانی دادەنێت و ئەوانیش کارگێڕی تر دادەنێت، بەو شێوەیە جۆرە هەرەمێک کە پێکدێت ناپلیۆن لە پۆپەی دایە.

**سێیەم:** ناپلیۆن گرنگی بەکاروباری دارایی دا و توانی داهاتی حکومەت بەڕێکخستنی کۆکردنەوە باجەکان زیاد بکات و لە دەستی ئەو فەرمانبەرانە بدات کە بەخراپی دەسەڵاتی داراییان بەکارهێناوە، ڕۆڵی هەبوو لە دامەزراندنی (**بانکی فەڕەنسا**) ساڵی ١٨٠٠ز کەبە بەهێزترین دام و دەزگای داراییەکانی جیهان دادەنرێت، چاکەی ئەم دامەزراندنەش بۆ ئەم دەگەڕێتەوە.

**چوارەم:** ناپلیۆن توانی لەگەڵ (پاپا) دا ڕێک بکەوێت، و پەیوەندی لە نێوان ئەو و دەسەڵاتی ڕامیاریدا دیاری بکات پاشئەوەی لە کاتی شۆڕشی فەڕەنسادا خراپ ببوو، ئەویش بەبەستنی **ڕێککەوتنی کۆنکۆردات** (Concordat) ساڵی ١٨٠١ز، کە پاپا دانی نا بەدەست بەسەراگرتنی موڵکەکانی کڵێسەو داخستنی دێرەکان لەلایەن حکومەتی فەڕەنساوە بەمەرجێک حکومەتی فەڕەنسا لە خەزێنەی دەوڵەت مووچە بەپیاوانی ئایینی.

**پێنجەم:** هەروەها ناپلیۆن گرنگی بە چاککردنی دادوەریدا، سیستەمی دادوەری لە فەڕەنسادا شێواز بوو، گەلێک سیستەمی جیاجیا هەبوون کە پاشماوەکانی

سـەردەمی پێـش شـۆڕش بـوون. ناپلیـۆن لیژنەیەکـی دادوەری ڕاسـپاردنی بـۆ دانانـی یاساکانی مەدەنـی گشـتی کـە لەسـاڵی ١٨٠٤زدا دەرچـوو پێـی دەوتـرا **یاسـای ناپلیۆن** (Co de Napoleon) کـە ئـەم یاسـایانە گرنگتریـن بیروڕاکانـی شۆڕشـی فەڕەنسـی لـە خۆگرتبـوو و هەندێـک لـە نەتەوەکانـی تـری ئەورووپـا سـوودیان لێوەرگـرت.

**شەشـەم:** هەروەهـا ناپلیـۆن گرنگـی بـە چاکسـازییە گشـتییەکان دا بـە تایبەتـی کردنـەوەی ڕێـگای هاتووچۆ وشـککردنی زەلـکاوەکان و دروسـتکردنی پـرد و کردنـەوەی جۆگـەی ئاودێـری و دروسـتکردنی کۆشـکی نایـاب و قەشـەنگ، گرنگـی بەکاروبـاری زانیاریـدا. هانـی خوێندنـی زمانـی فەڕەنسـی و زانیـاری دا و خانـەی بـاڵای مامۆسـتایانی دامەزرانـدن بـۆ پێگەیاندنـی مامۆسـتا بـۆ فێرگـە گشـتییە فەڕەنسـییەکان و فێرگـە سـەرەتایی و باڵاکانـی خسـتە ژێـر چاودێـر حکومـەت.

## ٤- ئیمپراتۆریەت

ناپلیـۆن بـوو بـە فەرمانـڕەوای فەڕەنسـا و زۆری نەمابـوو ببێتـە ئیمپراتـۆر تەنیـا ناوەکـەی نەبێـت و ئـەوەش لـە سـاڵی ١٨٠٤ زدا بـۆی ڕەخسـا کاتێـک ئەنجوومەنـی پیـران ئـەو نازنـاوەی پێبەخشـی، ئەمجـا لـە هەڵبژاردنێکـی گشـتییدا گەلـی فەڕەنسـی بڕیـاری لەسـەر ئـەوە داو ئاهەنگێکـی تـاج لەسـەر نـان لـە کڵێسـەی نۆتـردام سـازدراو پاپـا ئامـادەی بـوو، بـەڵام ناپلیـۆن خـۆی تاجەکـەی بەرزکـردەوە و لەسـەری خـۆی نـا بـەو جـۆرە بەنازنـاوی (ئیمپراتۆڕیەتـی ناپلیۆنـی یەکـەم) ناسـرا.

ناپلیـۆن ڕاگەیانـد ڕایگەیانـد کەبـە پێـی بیروباوەڕەکانی شۆڕشـی فەڕەنسـا هەڵسـوکەوت دەکات و بیروباوەڕەکانـی شـۆڕش (**ئـازادی و برایەتـی و یەکسـانی**) بەسـەر هەمـوو زەمانێکـەوە بـوو و ئـاڵا ڕەنگاوڕەنگـە شێگۆشـەییەکە بـە ئـاڵای دەوڵـەت مایـەوە، بـەڵام هەندێـک لـە ڕواڵەتـەکان گـۆڕدران کـە ڕۆژمێـری خـۆری (هەتـاوی) کاری پێکرایـەوە لـە جیاتـی ڕۆژمێـری شـۆڕش و نازنـاوی (میسـۆ) شـوێنی (هاونیشـتمانی) گرتـەوە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا ڕژێمـی حوکـم گەلێـک گۆڕانـی بەسـەر داهـات، ئەوەبـوو ڕۆژنامـەکان چاودێریـان خرایـە سـەر، گـەل کەوتـە ژێـر چاودێـری، تـاوای لێهـات ناپلیـۆن بـوو بـە فەرمانڕەوایەکـی سـتەمکار زیاتـر لەسـتەمکاری بنەماڵـەی بۆربـۆن.

ناپلیۆن سـەردەمی کۆنسـۆلیەتی لە چاکسـازییەکانی ناوخۆ و بەهێزکردنی فەڕەنسـادا بەسـەر بـرد، بـەڵام بەدەسـەڵاتداریەتی بەسـەر فەڕەنسـادا ڕازی نەبـوو، بەڵـکو ویسـتی دەسـت بگرێـت بەسـەر هەمـوو وڵاتەکانـی ئەوروپـادا، و ئـەم بەرزەفڕیـەی کاتێـک دەرکـەوت کـە بـوو بـە ئیمپڕاتـۆر، هەمیشـە خـۆی بـۆ جەنـگ ئامادەدەکـرد هەمـوو دەرامەتەکانـی فەڕەنسـا و دەوڵەتـە ژێـر دەسـتەکانی لـە پێنـاوی هێنانـەدی ئامانجـە فراوانەکانیـدا بەکاردەهێنـا وێـڕای ئـەوەی گەلـی فەڕەنسـا ئـارەزووی لـە ئاشـتی و دوورکەوتنـەوە لـە جەنـگ بـوو، چونکـە هیـچ سـوودێکی تیـادا نەدەبینـی.

## ٥- جەنگەکانی ناپلیۆن

پەیماننامـەی (ئەمیـان) کـە لەنێـوان بەریتانیـا و ناپلیۆنـدا بەسـترا تەنیا ئاگربەسـتێک بـوو دوو سـاڵی خایانـد، چونکـە لـەو ماوەیـەدا هـەردوولا خۆیـان بـۆ جەنـگ ئامـادە دەکـرد، بـەڵام ناپلیـۆن ئامانجەکانـی گەورەتـر بوو، دەسـەڵاتی گەیشـتە زەوییـە نزمەکان و ڕایـن و ئیتاڵیـا ودەسـتی گـرت بەسـەر ڕووبـاری میسسـپی لـە ئەمریـکادا. بەریتانیـا لـە بەهێـزی فەڕەنسـا و فراوانبوونـی دەسـەڵاتی مەترسـییەکانی زیاتربـوون و هەسـتی کـرد بازرگانـی و داگیرگەکانـی لەمەترسـیدان.



ئـەم هۆیانـە دووبـارە جەنگـی نـوێ کـردوە و بەریتانیـا سـاڵی ١٨٠٤ز جەنگـی دژی فەڕەنسـا هەڵگیرسـاند و ناپلیۆنیـش ئەمـەی پێخـۆش بـوو و هەوڵیـدا لـە پێنـاوی هێنانـەدی ئامانجەکانیدا بەریتانیـا لەناوبەرێت. ناپلیـۆن لەپێشـەوە ویسـتی دوورگەکانی بەریتاینـا بگرێـت و بـۆ ئـەو مەبەسـتە بـە یارمەتـی ئیسـپانیا (کـە دەسـت بەسـەر پورتوگاڵـدا بگرێـت) هێرشـێکی ئامادەکـرد، بـەڵام کەشـتیگەلی بەریتانـی تەفـر و تونـای کـرد و پرۆژەکـەی بـۆ داگیرکردنـی دوورگەکانـی بەریتاینـا شکسـتی هێنـا.

## هاوپەیمانی سێیەمی ئەوروپا:

لـەم کاتانـەدا لـە بەریتانیـا **ولیـەم پـت** (Willam pitt) هاتـە سـەر حوکـم کـە بەناوبانـگ بـوو بەدوژمنایەتـی ناپلیـۆن و توانـی بەرەیـەک لـە بەریتانیـا و نەمسـا ڕووسـیا و سـوید لـە دژی فەڕەنسـا پێکبێنێـت لـە سـاڵی ١٨٠٥ز کەبـە هاوپەیمانـی سـێیەم) ناسـرا، بـەڵام ناپلیـۆن وازی لـە داگیرکردنـی بەریتانیـا هێنـاو ڕووی کـردە کوشـتاری دوژمنەکانـی لـە ئەوروپـادا، لەگـەڵ نەمسـادا جەنـگاو لەشـەڕی (**ئولـم**) دا بەسـەریدا سـەرکەوت و بەسـەربەرزی لـە تشـرینی یەکەمـی سـاڵی ١٨٠٥ز چـووە ڤێنـاوە، بـەڵام بەریتانیـا لەهەمـان کاتـدا بەرهەڵسـتی ناپلیۆنـی لـە دەریـادا دەکـرد و (لۆردنلسـۆن) بەسـەر کەشـتیگەلەکەیدا لـە جەنگـی (**ترافلـگار**) (trafulgar) زاڵبـوو لێدانێکـی کوشـندەی لـە هـەردوو کەشـتیگەلی فەڕەنسـی و ئیسـپانی دا، لـەم شـەڕەدا لـۆرد نلسـۆن کـوژرا پـاش ئـەوەی کەشـتیگەلەکەی سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـا.

ئینجـا ناپلیـۆن بـەردەوام بـوو لەبەرهەڵسـتی کـرد دوژمنەکانـی لـە ئەوروپـادا و لـە (**جەنگـی ئوسـترلیتز**)دا (Austerlitz) بەسـووپاکانی فەڕەنسـیس دووەمـی ئیمپڕاتـۆڕی نەمسـا و ئەسـکەندەری یەکەمـی قەیسـەری ڕوسـیا گەیشـت. لـە کانونـی یەکەمـی سـاڵی ١٨٠٥ز دا ناپلیـۆن ئـەم جەنگـە لـەو شـکانیدا بـردەوە، کـە نەمسـا ناچـار هاوپەیمانیەتـی سـێیەم کشـایەوە پـاش ئـەوەی هەمـووی دەسـەڵاتێکی دۆڕانـد ودانـی بەناپلیۆنـدا نـا وەکـو پادشـایەک بەسـەر ئیتاڵیـا. پروسـیاش چـووە پـاڵ هاوپەیمانیەتـی سـێیەم، هەروەهـا هانۆڤـەری دەسـت نەکـەوت کـە ناپلیـۆن پەیمانـی پەیدابـوو، لەبـەر ئـەوە ناپلیـۆن لەگەڵیـدا جەنـگا و لـە (**جەنگـی یێنـا**) سـوپای فردریـک ویلیەمـی

سێیەم پادشای پروسیای لە تشرینی یەکەمی ١٨٠٦ز دا بەسەریدا سەرکەوت و (**پەیمانبەستنی تلست**) (tilist) لە نێوان ناپلیۆن و ئەسکەندەردا بەسترا و ئەسکەندەر لەکاتی وتوێژدا کەوتە ژێر کاریگەری ناپلیۆنەوە و هەردوو لایان لەسەر جەنگی بەریتانیا ڕێککەوتن و ناپلیۆن پەیمانیدا دەستی ئەسکەندەر لە فینلەندە و دەوڵەتی عوسمانی والا بکات بەرامبەر پەیماندانی ئەسکەندەر کە بچێتە پاڵ ناپلیۆن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بەریتانیا و گەمارۆی بدەن، ناپلیۆن توانی هاوپەیمانیەتی سێیەم تێک بشکێنێت و کەس لە جەنگدا لەگەڵیدا نەمایەوە، بێجگە لە بەریتانیا و سوید نەبێت، بەڵام سوید هێرشێکی فەڕەنسی لە دانیمارکەوە و یەکێکی ڕووسی لە فنلەندەوە کرایە سەر، ناچار بوو ڕێککەوتنێکیان لەگەڵدا ببەستێت و پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ بەریتانیا بپچڕێنێت.

## گەمارۆدانی کیشوەری:

کەس نەمابوو چەک بەڕووی ناپلیۆندا بەرزبکاتەوە بێجگە لە بەریتانیا کە هێشتا لە دەریادا بەرهەڵستی دەکرد. ناپلیۆن هەموو سەرکەوتنەکانی لە وشکانیدا بەدەست هێنا، بەڵام نەیتوانی لە دەریادا بەریتانیا بشکێنێت، لەبەر ئەوە بیریکردەوە بەرهەڵستی بەریتانیا بکات بەسەپاندنی گەمارۆ بەسەریدا و پچڕاندنی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ وڵاتە ئەوروپییەکانی تر، چونکە هێزو توانای بەریتانیا بەندە بە پیشەسازی و بازرگانی لەگەڵ ئەورووپا و داگیرگەکاندا، ئەگەر ناپلیۆن توانی ڕێ لەکەلوپەلی بەریتانیا بگرێت نەیەتە ئەورووپا و نەهێڵێت کەرەسە سەرەتاییەکانی بگاتێ، ئەوا پیشەسازی حکومەتەکەی ڕیسوا دەکات. حکومەتەکەش ناچار داوای ڕێککەوتن دەکات، ئەو کاتە ناپلیۆن چۆنی بوێت مەرجەکانی بەسەردا دەسەپێنێت. ناپلیۆن دەستی کرد بەچەسپاندنی ئەم پرۆژەیە کە ناسرا بە (گەمارۆدانی کیشوەری) و لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٠٦زدا مەرسوومەکان بەرلینی بڵاوکردەوە بۆ جێبەجێکردنی گەمارۆکە و دابڕینی بازرگانی بەریتانیانی و بەندەرەکانی ئەورووپا بەڕووی کەشتییەکانی بەریتانیا داخران ، ناپلیۆن بڵاوی کردەوە کە هەر کەلوپەلێکی بەریتانی لە وڵاتە ژێر دەستەکانی خۆیدا ببینرێت دەستی بەسەر دادەگیرێت یان

دەسوتێنرێت، بەڵام بەریتانیا وەڵامی کردەوەکەی ناپلیۆنی دایەوە بەدەرکردنی چەند بڕیارێک لە دەقەکەیاندا هاتووە (کە پێویستە هەرکەشتییەک بازرگانی لەگەڵ فەرەنسادا بکات بگیرێت)، بەو جۆرە نەیهێشت بەرهەمە پیشەسازییە بیانییەکانی بۆ بچێت، لەبەر ئەوەی فەرەنسا و ئەورووپا جارێ بزوتنەوەیەکی پیشەسازییان تیادا دروست نەبوو بوو، کارێکی زۆری کردە سەریان و یارمەتیدەری سەرنەکەوتنی ناپلیۆن بوو لە بەجێهێنانی پرۆژەی گەمارۆدانی کیشوەریدا.

## ٦- هێرش بۆسەر ڕووسیا

گیانی ڕاپەرین دژی ناپلیۆن بەیەکجاری دەرنەکەوت تا بەتەواوەتی پەیوەندی نێوان ئەو و ئەسکەندەر تێکنەچوو. ناپلیۆن مەبەستی بوو جێبەجێکردنی گەمارۆدا کیشوەریەکەی دژی بەریتانیای بۆی بچێتە سەر، ئەو پەیمانەی کە بە ئەسکەندەری دابوو دەربارەی پۆلەندا و سوید نەیبردە سەر، ئەوەی ئەم پەیوەندییانەی زیاتر گرژتر کرد ئەو زیانانە بوو کە لە ڕووسیا کەوت لە ئەنجامی گەمارۆدانی کیشوەری، وای لەگەڵی ڕووسیا کرد لە سیاسەتی قەیسەر نارەزا بێ، ئەمیش ناچار بوو پاشگەز ببێتەوە و دەرگای بازاڕەکانی وڵاتەکەی بەڕووی بازرگانی بەریتانی بکاتەوە، ئەم کارەش ناپلیۆنی تووڕەکرد بەکردەوەیەکی دوژمنکارانەی دژ بەخۆی دانا. لەبەر ئەوە ناپلیۆن ساڵی ١٨١٢ز خۆی بۆ هێرشی سەر ڕووسیا ئامادەکرد و سوپایەکی لە فەرەنسا و نەمسا و پروسیا و ئیتاڵیا و پۆلەندە کۆکردەوە و ژمارەی سەربازانی هێرشەکە لە ٦٠٠،٠٠٠ سەرباز تێپەڕی. ناپلیۆن لە حوزەیرانی ١٨١٢زدا هێری بردە سەر ڕووسیا، بەڵام قەیسەری ڕووسیا بڕیایدا لە شەڕێکی ڕووبەڕوودا خۆی لە ناپلیۆن نەدا، بەڵکو کشانەوەی بە چاکترزانی بەرامبەر دوژمنەکەی تارایکێشی بەرەو ناوەوە تادەگاتە دەشتە سارد و سڕەکانی ڕووسیا. ناپلیۆن هیچ بەرهەڵستێکی وای نەدی شایەنی باسکردن بێت بەرەو ناوەوە کشا تا گەیشتە مۆسکۆ و ئەو شەوەی گەیشتە مۆسکۆ شارەکەی سووتاندی و زۆربەی بەرهەمە خواردەمەنییەکانی فەوتاند و سووتاندنەکە بووە مایەی ڕق و قینەی جوتیارانی ڕووسی بەرامبەر ناپلیۆن و لە بەرامبەر کەمی خواردەمەنی و سەرمادا نەیتوانی زستان لەوێ هەڵبکات و ناچار

بکێشێتەوە، ئەم کشانەوە گەورەترین کارەسات و ناهەموارترین شکاندن بوو مێژوو، بینیبێتی و ئەوەبوو سووپا کشاوەکە ئازاری سەرما و برسێتی زۆری چەشت و ناچار بوو چی لە رێگای بوایە تالانی دەکرد و بەوە بوو بەگاڵتەجاری دانیشتوان و بەدەیان هەزاریان لەرێگای گەڕانەوەدا مردن و ناپلیۆنیش لەم هێرشەدا نزیکەی نیو ملیۆن سەربازی لە دەست چوو.

## هاوپەیمانی چوارەمی ئەوروپا:

قەیسەری ڕووسیا تەنیا بەشکاندنی ناپلیۆن ڕازی نەبوو، بەڵکو بڕیاریدا بەردەوام بێت لەڕوانانیدا و بە تەواوی لەناوی بەرێت بەریتانیا و پروسیا و سوید لەگەڵیدا ڕێککەوتن و هاوپەیمانیەتی چوارەمیان بەست، بەڵام ناپلیۆن هەوڵیدا گەلەکۆمەکی دوژمنەکانی لەناوبەرێت و هەندێک سەرکەوتنی لەچەند شەڕێکدا وەدەست هێنا و نەمسا لەلای دوژمنەکانی هەوڵی بۆدا ببێتە ناوبژکەریان و ڕێکەوتنێکی گونجاو ببەستن، بەڵام لەوەدا سەرنەکەوت، چونکە ناپلیۆن بە سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە نەبێت بەسەر دوژمنە ڕازی نەبوو. بۆیە نەمساش چووە پاڵ هاوپەیمانیەتی چوارەم و جەنگی لە نێوان ناپلیۆن و هاوپەیمانیەتی چوارەمدا دەستی پێکرد و شەڕێک لە (**لایبزک**) لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨١٣زدا ڕوویدا کە ناوبرا بە (**شەڕی میللەتان**) (معرکە الامم) و ناپلیۆن شانێکی خراپ شکاو گەڕایەوە بۆ فەڕەنسا و پروسیا لەم جەنگەدا لە دەسەڵاتی ناپلیۆن ڕزگاریی بوو. ئەوجا هاوپەیمانەکان لە ڕێرەوەکەیاندا بەردەوام بوون سنووری فەڕەنسایان بڕی و لە ئازاری ١٨١٤ .دا چوونە پاریسەوە و ناپلیۆن ناچار لەتەخت دابەزی و پەیماننامەیەکی مۆرکرد بە گوێرەی ئەو پەیماننامەیە وازی لە هەموو مافەکانی لە تەختی فەرنسادا هێنا و ڕێگە پێدرا لە دوورگەی (ئەلبا) دا بمێنێتەوە و ساڵانە ملیۆنێک فرەنک وەربگرێت، ناپلیۆن فەڕەنسای بەرەو بارەگا نوێیەکەی بەجێهێشت و نازناوی ئیمپراتۆریشی هەر پێوە مابوو.

## ٧- ماوەی سەد ڕۆژەکە و کەوتنی ناپلیۆن

پاش نەمانی دەسەڵاتی ناپلیۆن لویس هەژدەم لە بنەماڵەی بۆربۆن لەسەر تەختی فەڕەنسا دانرا و سنووری فەڕەنسا لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٧٩٣زدا چۆن بوو وای لێکرایەوە و لویسی هەژدەم دەستوورێکی بەگەلەکەی بەخشی کە بیروباوەڕەکانی شۆڕش فەڕەنسای تیادابوو، بەڵام لویس لە ڕازیکردنی گەلەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو، بۆیە نارەزایی بڵاوبۆوە بەتایبەتی لەناو لایەنگرانی ناپلیۆندا کە هەمیشە چاوەڕوانی گەڕانەوەیان دەکرد.

ناپلیۆنیش دڵتەنگ بوو ولە دوورگەی (ئەلبا)دا خۆی نەدەگرت و زانیبووی گەل هێشتا دەیانەوێت. لە شوباتی ١٨١٥زدا بە نهێنی هەڵهات و لەکەناری فەڕەنسادا دابەزی. لویسی هەژدەم خێرا سووپایەکی نارد بۆ گرتنی، بەڵام نەیتوانی لەشکرەکەی بەبینینی ئیمپراتۆرەکەی بەجلی سەربازییەوە ڕوویان تێکرد و لویس کە گوێی لەوە بوو هەڵهات بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت.

ناپلیۆن بە گەیشتنی بۆ پاریس ئاشکرای کرد **کە گەڕاوەتەوە بۆ ڕزگارکردنی فەڕەنسا لە دەسەڵاتی خانەدانەکان و زەوی دەداتەوە بە جوتیار و مافەکانی مرۆڤ کە شۆڕشی فەڕەنسی ڕاگەیاند بوو دەچەسپێنێت و حوکمەکەی بۆ فەڕەنسا حوکمێکی دەستووری دەبێت و واز لە سیاسەتی جەنگ و داگیرکردن دەهێنێت،**

بەڵام هاوپەیمانەکان لە ڤیەنا دا بۆ دانانی بنچینەکانی ئاشتی کۆببوونەوەو لەسەر ئەوە ناکۆکیان تێکەوتبوو، بەڵام کاتی هەواڵی گەڕانەوەی ناپلیۆنیان بیست بۆ فەڕەنسا بیسشت وازیان لە هەموو ناکۆکییەکانیان هێنا و دژی دوژمنە هاوبەشەکەیان یەکیان گرت بۆ لەناوبردنی بەیەکجاری هەر چوار دەوڵەتە هاوپەیمانەکە، پەیمانەکەیان نوێ کردەوە و سەر فەڕەنسا کۆکردەوە، بەڵام پلانی ناپلیۆن بریتی بوو لە بڵاوەپێکردنی دوژمنەکانی تالێدانی ئەو سوپایانەی هەریەکەیان بەجیا بۆی ئاسان بێت و خێرا چووە ناو بەلجیکاو لە ١٨ حوزەیراندا لە (**واترلۆ**) دوا جەنگی بەرپاکرد، چواردەوری ناپلیۆنیان دا و سوپاکەی پەرش و بڵاوبۆوە- واترلۆ بە گەورەترین جەنگەکانی مێژوو دادەنرێت، چونکە کۆتایی بە ناپلیۆن و دەسەڵاتەکەی هێنا.

ناپلیۆن بەشکاوی گەڕایەوە بۆ پاریس، بەڵام هاوپەیمانەکان دوای کەوتن و چوونە پاریسەوە لەگەڵ خۆشیاندا لویسی هەژدەمیان گێڕایەوە و پەیمانبەستنێکی نوێ لە نێوان فەرەنسا و هاوپەیمانیەکاندا بەسترا (**پەیمان بەستنی دووەمی پاریس**) سنووری فەرەنسا وەکو باری پێش شۆڕشی فەرەنسی لێکرایەوە و پێ بژاردنێکی گەورەی جەنگیش بەسەر فەرەنسادا سەپێنرا، بەڵام ناپلیۆن هەڵهات و دواتر خۆی دابەدەست سەرکردەی کەشتیەکی بەریتانی و خێرا نێردرا بۆ دوورگەی (**سانت هێلانە**) لە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی خوارووا. پاش ئەوەی پێنج ساڵ و نیوی لەوێ لە تەمەنی بەسەربرد، ساڵی ١٨٢١ز کۆچی دوایی کرد.

## ٨- هۆیەکانی کەوتنی ناپلیۆن:

**دەتوانین لە خوارەوەدا هۆیەکانی کەوتنی ناپلیۆن بەو جۆرە کورت بکەینەوە:**

**یەکەم:** ناپلیۆن زۆر باوەڕی بەخۆی بوو، بەڵام نەیتوانی پاش فراوانبوونی ئیمپراتۆرییەتەکەی هەموو شتێک لە ئەستۆی خۆی بگرێت و هەرجارێک سەرکەوتنێکی وەدەست هێنابایە، چەند بڕوای بە توانای خۆی زیاتر دەبوو و ئەوەندەش گومانی لەلایەنگرەکانی پەیدا دەکرد تا وای لێهات گومانی لە بەتواناترین ئەو پیاوانەی دەکرد کە جێی بڕوای خۆی بوون بەتایبەتی تالیران وەزیری دەرەوەی وفۆشێە (Fouche) وەزیری ناوخۆی.

**دووەم:** ناپلیۆن ئەرکێکی وا گرانی خستبووە سەرشانی فەرەنسا و نەتەوە ژێر دەستەکانی هەرگیز لە توانایاندا نەبوو هەڵی بگرن. جگەلە جەنگە زۆرەکانی هەموو ئەو سامانە مەزنانەی لەبن هێنا کە لە دارایی فەرەنسا خەرجی دەکرد لە پێناوی هێنانەدی هێرشەکانیدا تاوای لێهات نەیدەتوانی ئەرک و ئامادەییەکی وابەدەست بێنێ کە بەربەرەکانی هەموو ئەوروپا بکات.

**سێیەم:** گەمارۆدانە کیشوەرییەکەی دژی بەریتانیا و چەسپاندنی بە زۆرەملێ بێ ئەوەی بتوانێت لەسەری بەردەوام بێت، بووە هۆی ئەوەی ئەورووپییەکان لێی دووربکەونەوە، هەرکاتێک لەو سەپاندنەدا کۆسپێکی بهاتبایە ڕێی، بەزیادەڕەوی هێزی بەکاردەهێنا تا ناچار بوو لەگەڵ ئەسکەندەری هاوڕێی بجەنگێت لەبەر

ئـەوەی ئەسـکەندەر نەیتوانـی لەگەمارۆدانەکـەدا بـەردەوام ببێـت، چونکـە وڵاتەکـەی کشـتوکاڵی بـوو، لـە توانایـدا نەبـوو پەیوەندییـە بازرگانیەکانـی لەگـەڵ بەریتانیـای پیشەسـازیدا بپچڕێنێـت.

**چـوارەم:** ڕاپەڕینـی گیانـی نەتەوایەتـی دژی ناپلیـۆن و زیادەڕۆیـی لەدەسـت بەسـەراگرتنی نەتەوە شـکاوەکاندا و دەسـت خسـتنە چارەنووسـی نەتەوە ئەوروپییەکان و دابەشـکردنی تەخـت و تـاج بەسـەر خزمەکانیـدا و سـەر لـە نوێ ئەوروپای ناوەڕاسـتی ڕێکخسـتەوە بەجۆرێـک لەگـەڵ دەسـت بەسـەراگرتنەکەیدا بگونجێـت و بەربەرکانێکردنـی توندی گیانـی نەتەوایەتـی بەتایبەتـی لـە ئیسـپانیا و پروسـیادا، بوونـە هـۆی ڕاپەڕینـی گیانـی نەتەوایەتـی لـە پێنـاوی ڕزگاربـوون لـە دەسـەڵاتەکەی و لەناوبردنـی.



## بەشی سێیەم

# ئەورووپا پاش شۆڕشی فەڕەنسی و دەسەڵاتداریەتی کۆنەپەرستی

## ١- کۆنگرەی ڤیەننا

هاوپەیمانەکان بۆ یەکەمجار کەچوونە پاریسەوە پەیمانبەستنی یەکەمی پاریسیان بەست کە فەڕەنسا بە گوێرەی ئەمە زیانێکی زۆری لێنەکەوت، دواتر وارێککەوتن کە کۆبونەوەکەیان ببنە ڤیەننا بۆ چارەنووسی چاککردنە گشتییەکانی ئەورووپا و دانانی بنچینەیەک و ئاشتییەکی هەمیشەیی و بەردەوام و لە پێشدا و ڕێککەوتبوون نەهێڵن فەڕەنسا بەشداری لە کۆنگرەکە بکات، بەڵام تالیران وەزیری دەرەوەی فەڕەنسا توانی ناکۆکییەکانی نێوان هاوپەیمانەکان بقۆزێتەوە واخۆی دەرخست کە دەیەوێت هاوسەنگی نێوانیان[٦] بپارێزێت، بەوجۆرە فەڕەنسا لە دواییدا بۆ کۆنگرەکە بانگ کرا. لە کاتێکدا وتوێژەکانیان بەردەوام بوو، ڕاکردنی ناپلیۆن لە دوورگەی (ئەلبا) وڕاکردنی لویسی هەژدەم لە پاریس بە ئەندامەکانیان ڕاگەیەنرا و ترس و لەرزیان لێنیشت، بەڵام کۆنگرەکە لە کۆبوونەوکانیدا هەربەردەوام بوو، و ماوەی سەد ڕۆژەکە بەدوا تێکشکاندنی ناپلیۆن لە واترلۆ و گەڕانەوەی لویسی هەژدەم بۆ تەخت کۆتایی هات پەیماننامەی دووەمی پاریس بەسترا کەبەگوێرەی ئەمە گەلێک مەرجی قورستری لە وانەی پێشووتر بەسەر فەڕەنسادا سەپێنرا، بەڵام ئەو بڕیارانەی کۆنگرەی ڤیەننا کەپەوەندییان بە چاککردنە گشتییەکانی ئەورووپاوە هەبوو لە ٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٨١٥زدا دانرا، واتە پێش شەڕی واترلۆ بەچەند ڕۆژێک ئەو پرەنسیپانەی (بیروباوەڕەکانی) کۆنگرە بۆ دانانی بڕیارەکانی لەسەری دەڕۆیشت ئەمانە بوون:

---

[٦] هاوسەنگی نێوان دەوڵەت: واتا ڕێ نەدرێت بەهیچ وڵاتێک کە خۆیان بسەپێنن بەسەر وڵاتێکی تر نەوەکو دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەورووپادا بگرێت وەکو چۆن فەڕەنسا لەسەردەمی ئیمپڕاتۆریەتەکەی ناپلیۆندا کردی.

**یەکەم: گێڕانەوەی کۆن بۆ دۆخەکەی جارانی:**

بۆ جێبەجێکردنی بنەمای هاوسەنگی نێوان وڵاتان (١)کەدەوڵەتە گەورەکان لە ئەنجامی جەنگەکانی ناپلیۆندا ناهاوسەنگیان تیا بینی و تالیران لەسەر ئەم بنەمایە ڕێسای مافە ڕەواکانی دانا بۆ پاراستنی مافی بنەماڵەی پادشاکان، بەوەش ویستی بەرگری لە بنەماڵەی بۆربۆن بکات و ئەنجامی هەموو ڕووداوەکان بخاتە ئەستۆی ناپلیۆن نەوەک فەڕنسا.

**دووەم: بنەڕەتی قەرەبووکردنەوەی:**

بنەڕەتی (گێڕانەوەی کۆن بۆ دۆخی جارانی) هەندێک گۆڕانی تیاداکرا، ئەویش ئەو دەوڵەتانەی لە ئەنجامی جەنگەکانی ناپلیۆندا و بۆ لەناوبردنی ناپلیۆن زیانیان لێ کەوتبوو، بۆیان ببژێرن و بەگوێرەی بنەڕەتی بژاردنەکە بەریتانیا هەردوو دوورگەی (ماڵتە) و (سیلان) و داگیرگەی (کاب) بوونە موڵکی.

## ٢- بڕیارەکانی کۆنگرە:

بەڵام بڕیارە گشتییەکانی کۆنگرە ئەمانەن:

### یەکەم: بڕیارە تایبەتییەکان سەبارەت بە دەوڵەتە گەورەکانەوە:

ڕووسیا هەندێ بەشەکانی پۆڵەندەی پروسی (دۆقیەی وارشۆ)ی دەسکەوت، پروسیا ناچار وازی لە بەشێک لە پۆڵەندەی پروسی (دۆقیەی وارشۆ) هێنا بەرامبەر ئەوەی هەرێمی ڕاین و نزیکەی نیوەی سەکسۆنیا بخرێتە پاڵ ویلایەتەکانی ئەڵمانیا کە یەکێتی جێرمانی لێپێکهاتبوو کەمکرانەوە بۆ نزیکەی سی و نۆ ویلایەت، بەڵام دەسەڵاتەکانی نەمسا لە ئیتاڵیادا گەلێک زیاتر بوون لەوانە، ڤینیسیا (ویلایەتی بوندقییە) بوو بە موڵکی و لۆمباردیاشی سەندەوە. میرنشینەکانی ئیتاڵیا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان لاوەکی کەوتنە ژێر دەسەڵاتی نەمساوە، بەڵام بیدمۆنت جەنەوەی خرایە پاڵ و هێزێکیان لێ دروست کرد بەرامبەر فەڕەنسا، و دەوڵەتی پاپا گەڕێنرایەوە، و پاشانشینی (ناپۆلی) خرایە ژێر رکێفی بنەماڵە (بۆربۆن)ەوە، (مۆتەرنیخ) سەرۆک وەزیرانی نەمسا لەگەڵ پاشای (ناپۆلی)دا ڕێککەوت بەو مەرجە پادشای ناپۆلی دەستوور بەگەلەکەی نەدا.

## دووەم: بڕیارە تایبەتییەکان سەبارەت بە دەوڵەتە بچووکەکان:

کۆنگرە بڕیاری یەکخستنی هەردوو دەوڵەتی (هۆڵەندا و بەلجیکا) و پێکهێنانی (پاشانشینی یەکگرتووی زەوییە نزمەکانی) دا، بۆ ئەوەی ببێتە شوورە و بەربەستێکی بەهێز بەرامبەر فەڕەنسا و تەختی ئەم پاشانشینەش پێشکەش بە (ولیەم ئۆرانج) کرا، هەروەها دۆقیەی (لۆکسمبۆرگ)ی درایە و بەریتانیا داگیرگەی جاوەی بۆ ئەم ئەم پاشانشینە گێڕایەوە و دوو ملیۆن (جونەیهی) (پاوەند) بەقەرز دایەتابتوانێت سنوورەکانی بەڕووی فەڕەنساوە قایم بکات، بەڵام بەلجیکییەکان ڕقیان لە هۆڵەندییەکان دەبۆوە و دوایی توانیان پاش ماوەیەکی کەم لێیان جیاببنەوە، بەڵام سویسرا بوو بە دەوڵەتێکی یەکێتی (فدراسیۆن) کە پێکهاتبوو لە ٢٢ هەرێم و سەربەخۆیی و بێلایەنی هەمیشەیی خۆی ئاشکراکرد و دەوڵەتەکانی تریش پەیمانی دەستەبەرکردنی ئەم سەربەخۆیی و بێلایەنیەیاندا و ئیسپانیاش گێڕدرایەوە بۆ سنوورە کۆنەکەی خۆی پێدرایەوە.

کۆنگرە بڕیاریدا نەرویج لە دانیمارک جیابکاتەوە و بیخاتە پاڵ سوید، ئەمەش لەسەر بەڵێنێکی پێشوو، چونکە سوید چووبوە نێو پەیمانبەستنەوە دژی ناپلیۆن، بەڵام سوید (بومیرانیا)ی ڕۆژئاوای لەکیس چوو کە خرایە پاڵ پروسیا، و فنلندا خرایە پاڵ ڕووسیا.

## سێیەم: بڕیارە تایبەتییەکانی قەرەبووکردنەوە:

ڕووسیا پۆڵەندەی پروسی – دوقیەی وارشۆ و فنلەندای وەرگرت، بەڵام بەریتانیا دوورگەی هێلکۆلاند و دوورگەکانی ئەیونی وسیلان و ترینیداد و کاب و بەشێک لە کینیای وەرگرت.

## چوارم: بڕیارەگشتییەکان:

کۆنگرە بڕیاری دا بازرگانی کۆیلە لابەرێت بەو پێیە کەوا (ناگونجێت لەگەڵ (بیروباوەڕەکانی) مەدەنی و ڕەوشتی گشتیدا) و پەیمانی بە دەوڵەتەکاندا بیوەستێنێت، کۆنگرە هەندێک بڕیاری گشتی دانا، کە تایبەتن بەنوێنەرایەتی دبلۆماسی و پلەی نوێنەرە دبلۆماسییەکان و بەڕێوەبردنی ڕووبارە نێو دەوڵەتییەکان.

گەلێک ڕەخنەی توند و تیژ ئاراستەی بڕیارەکانی کۆنگرە کران سەرکردەکانی بەکۆنەپەرست و بەرهەڵستکەری بیری ئازادی تاوانبارکران. بۆیە گرنگترین ڕەخنەکان ئەمانەن:

**یەکەم:** بڕیارەکانی کۆنگرە جەنگێک بوون دژی بیری ئازاد و بیروڕا دیموکراتییەکان و پادشاکان (مافە تایبەتیەکانیان) درایەوە میللەتان لە مافی هاوبەشکردنی حوکمدا بێبەش کران. ئەوەی یاریدەی بەشداربوونی کۆنگرەی دا بگەنە ئامانجەکانیان ئەو بارە ترسناکە بووکە باڵی بەسەر ئەورووپادا کێشابوو لە ئەنجامی جەنگەکانی ناپلیۆندا و ئاوات خواستنە گەرمەکانی میللەتان بوو لە پێناوی ئاشتیدا، کۆنگرە ئەم ئاوات خواستنەی بۆ خۆی بە هەلزانی بۆ دانانی ئاشتییەکی کۆنەپەرستانە بەرامبەر نرخێکی گران، کە میللەتان لە ئازادی و شکۆمەندی خۆیان دایان.

**دووەم:** کۆنگرە گیانی نەتەوایەتی پشتگوێ خست کە لە کاتی شۆڕش و جەنگەکانی ناپلیۆندا لەناو میللەتانی ئەورووپا بڵاوببۆوە، سەرکردەکانی کۆنگرە دەستیان کرد بە گۆڕینی سنووری (پاشانشینەکان) و لەمیانی دادەبڕی و دەیانخستە سەر ئەوی تر لە پێناوی ڕەزامەندی بنەماڵەی پادشاکاندا، بەڵام ئارەزووی میللەتان و داواکارییەکان لە رزگاربوون و سەروەری نیشتیمانی پشتگوێ خرا و ڕەنگە ئەمە ئەوپەڕی کردەوەی کۆنگرە بووبێت کەجێی ڕەخنەبێت کەلە پاش تەواوبوونی کۆنگرە زۆری پێنەچوو، ڕووداوەکان ناڕاستی ئەو ڕێگایەیان سەلماند، بۆ نموونە یەکێتی (هۆڵەندا و بەلجیکیا) لە پانزە ساڵ زیاتری خایاند، شۆڕش لە ئیتاڵیا و ئەڵمانیا بەرپابوو، لە پاش نزیکەی نەوەد ساڵ یەکێتی نەرویج و سوید تێکچوو.

**سێیەم:** کۆنگرە داواکاری دەوڵەت بچووکەکانیشی پشتگوێ خست کە گەلێک قوربانیان بە مافی خۆیان دابوو لە پێناوی بەرژەوەندی دەوڵەتە گەورەکاندا. ولایەتەکانی ئیتاڵیا بوونە تالانی نەمسا و ئیسپانیا ترینیدادی دۆڕاند. لەسەر داخوازی ڕووسیا پۆڵەندە بۆ جاری چوارەم دابەش کرایەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک بڕیاری تایبەتی کۆنگرە هەیە شایەنی ئەوەیە پیایاندا هەڵبدەیت وەکو (لابردنی بازرگانی کۆیلە و بڕیارە تایبەتییەکان بە نوێنەرایەتی دیبلۆماسی و بنچینە تایبەتییەکانی بەڕێوەبردنی ڕووبارە دەوڵەتییەکان). کە بڕیارە گرنگەکانی سەدەی نۆزدەهەم بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی دەوڵەتان دادەنرێت.

ئەنجامەکانی کۆنگرە ئەوەی سەپاند، کەسەدەی نۆزدەهەم جەنگی دەوڵەتانی وەکو جەنگەکانی ناپلیۆنە بەخۆیەوە نەدی، جگە لە جەنگی (قرم)دا، بەڵام گەلێک شۆڕش لە دژی زۆرداری پادشاکان و داواکردنی ئازادی نیشتیمانی و دیموکراتی بەرپابوو.

## ٣- گەڕانەوەی پادشایەتی ستەمکار:

### فەرەنسا:

لە بیروباوەڕەکانی کۆنگرەی ڤیەننا (گەڕانەوەی کۆن بۆ دۆخەکەی جارانی) و (مافە ڕەواکانی) بوون، لەبەر ئەوە هاوپەیمانەکان لویسی هەژدەمیان دووبارە گێڕایەووە بۆ تەختی فەرەنسا، بەمەش کۆنەپەرستی و هێزەکانی (لایەنگری پادشا ویستە توندڕەوەکان) بووژانەوە و گەلی فەرەنسی دابەشبوون بۆ ئازادیخوازان و کۆنەپەرستان، ئازادیخوازەکان پابەند بوون بە بیروباوەڕەکانی شۆڕشی فەرەنسیەوە لەوەشدا جوتیاران و چینی بورجوازی (ناوەند) پشتگیریان دەکرد. کۆنەپەرستەکانیش بریتیبوون لە پشتگیرانی پادشا و خانەدانەکان و هەندێک پارێزگاران لە لادێکاندا. لویسی هەژدەمیش کەوتبووە نێوان پاڵەپەستۆی ئەم دووپارتەوەو نەیتوانی ڕێکیان بخات، بەڵام بڕیاریدا ڕێگایەکی ناوەند بگرێت و دانی بەچاکسازییەکانی ناپلیۆن لە ڕووی کارگێڕی و یاسادا و لەهەمان کاتیشدا دانی نا بە خانەدانەکان و هەندێک مافەکانی بۆ گەڕانەوە.

ئینجا لویسی هەژدەم لە سیاسەتی کۆنەپەرستی پاشگەز بۆوە و دوای سیاسەتێکی مام ناوەندی کەوت و وەزارەتێکی لە میانڕەوەکاندا پێکهێنا، بەڵام ئەم حکومەتە میانڕەوەکان پاش ساڵی ١٨٢٠ز لە حوکم دا نەما، چونکە کۆنەپەرستەکان ڕووداوی کوشتنی برازای پادشایان لە لایەن ئازادیخوازەکانەوە بەهەل زانی و لەئەنجامی کاردانەوەی ئەو ڕووداوەدا جڵەوی حوکمیان گرتەدەست و کۆنەپەرستان بەخوێن گەرمی حوکمیان دەست پێکرد و بەرهەڵستی هەموو ڕواڵەتێکی ئازادیان دەکرد. ئەو بەندانەی دەستوورەکە تایبەتی بوون بە ئازادی تاکەوە لە کاریان خست و دەنگی ڕۆژنامەکانیان کپ کرد و یاسای هەڵبژاردنیان بە جۆرێک گۆڕی لە ئەنجوومەندا،

کەزۆرینەیان تێدا مسۆگەر کرد، لەم خولەدا فەرەنسا بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی ئیسپانیا هەڵبژارد و ڕاسپێردرا بۆ گێڕانەوەی فردیناند بۆ تەختی شاهانە، هەرچەندە لویسی هەژدەم زۆر نەژیا و لەساڵی ١٨٢٤زدا دوایی کرد پاش ئەوەی نزیکەی دەساڵ حوکمی کرد. پاش لویسی هەژدەم براکەی **کۆنت ئارتوا** (Artois) لە حوکمدا شوێنی گرتەوە و بەناوی دەیەم چووە سەرتەخت، شارل ئۆرۆستوکراتێکی ستەمکاربوو بۆ نموونە خراپترین شێوەبوو لە شێوەکانی کۆنەپەرستی و ڕێگای بۆ کۆنەپەرستی خۆش کرد و حوکمەکەی شارل بێ سنوور (مطلق) بوو و بڕوای بە ڕژێمی پەرلەمانی نەبوو، ڕێگای لە ڕۆژنامەکان گرت و مافەتایبەتییەکانی خانەدانەکانی گێڕایەوە و چ موڵکێکیان لە کاتی شۆڕشدا لە دەست چووبوو بە خەرجکردنی ملیۆنێک فرەنگ لە خەزێنەی گشتی بۆی بژاردن و ڕێگای بە (**جزویت**)[7]**ەکان** دابگەڕێنەوە بۆ فەرەنسا، بەڵام فەرەنسییەکان توانیان خۆیان لە حوکمی شارل ڕزگار بکەن پێش ئەوەی نەمساوییەکان لە حوکمی موتەرنیخخۆیان ڕزگاربکەن، ئەویش کاتێک ئازادیخوازە فەرەنسییەکان ساڵی ١٨٣٠ز ڕاپەڕین و (شارل)یان لە تەخت هێنایە خوارەوە و لویس فیلیپ حوکمی گرتە دەست و ئەویش لە بنەماڵەی بۆربۆن بوو، بەڵام لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسیدا لە ڕیزی ئازادیخوازەکاندا دەجەنگا.

## ئیسپانیا:

لە ئیسپانیا بنەماڵەی بۆربۆن دەسەڵاتیان وەرگرتەوە و دەسەڵاتی ئەرستۆکراتییەکان و پیاوەئاینییەکان وەکو جارانیان لێهاتەوە، بەڵام ئازادیخوازانی ئیسپانیا هەر لە تێکۆشاندا بوون تا ناچار فردینانـدی هەفتەم داواکارییەکانی جێبەجێ کردن و بزووتنەوەی ئازادیخوازن لە ئیسپانیادا کە لە سەردەمی جەنگەکانی ناپلیۆندا دەستی پێکرد گەلێ بەهێزتر و توندڕەو تربوو لەوانەی لە ناوەڕاستی ئەوروپادا دەرکەوتن ئەوەبوو ئاگری شۆڕشیان هەڵگیرساند و فەرەنسای ناچارکرد سوپایەک بنێرێتە سەریان.

[7] لە توندڕەوەکانی بانگهێشت کردن بۆ بڕوابوون بە پاپا بە دەسەڵات و سەروەری پاپا بوون و ئەوانە داوای پێویست بوونی یەک دەسەڵاتیان دەکرد بەسەر جیهان دەکرد

## ناپۆلی:

فردیناند، کە بە چەوساندنەوەی ئازادیخوازەکان بەناوبانگ بوو گێڕدرایەوە بۆ تەختی ناپۆلی، بەڵام ئازادیخوازەکان ناچاریان کرد دەستووریان بداتێ و بە ناچاری لە ساڵی ١٨٢١زدا بۆیانی جێبەجێ کرد، ئەویش جێی ناڕەزایی موتەرنیخ بوو کە پەیمانی بە فردیناندا سوپایەکی نەمساوی بنێرێت بۆ لە ناوبردنی بزووتنەوەی ئازادیخوازەکان لە وڵاتەکەیدا لەو ڕاستیدا ئەم سوپایە دەستی کرد بە کاری خۆی و بەهێز ئازادیخوازانی ناپۆلی ملکەچ کرد.

نەمساش هەر لەسەر هەمان سیاسەتی توندوتیژی لەبوندقییە (ڤینیسیا) لۆمباردیا و ئەڵمانیادا دەڕۆیشت و بەرهەڵستی ئازادی و بزووتنەوە دەستوورییەکان و دیموکراتییەکانی دەکرد و بەندیخانەکانی بە ئازادیخوازەکان پڕکرد. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم سیاسەتی زەبر و زەنگە و خوێنڕشتنە بەسەر بیروباوەڕی ئازادیدا سەرنەکەوت و هەر زوو ئەو بیروباوڕ و بزووتنەوە دەستووریانە پاش مردنی موتەرنیخ سەریان هەڵدایەوە، بەڵام موتەرنیخ بایەخی بەئەنجامی ئەم کردەوانە نەدایەوە و تەنیا توندوتیژی کردبووە داردەست بۆ بەرهەڵستی ئازادیخوازان. لە بەشێکی داهاتوودا باسی ئەنجامی کردەوەکانی موتەرنیخ لە نەمسا و ئیتاڵیا و ئەڵمانیادا دەکەین.

# پرسیارەکانی بەندی یەکەم

١- باسی گرنگترین نیشانەکانی بووژاندنەوەی ڕووناکبیری لە سەدەی هەژدەمیندا بکەو کاریگەری ئەم بوژاندنەوەیە لە ئاراستەکردنی خەڵکیدا دەربخە.

٢- باسی کاریگەری هەریەک لە ڤۆلتێر و مۆنتسکیۆ و ڕۆسۆ بۆ وریاکردنەوەی خەڵکی دەربارەی خراپییەکانی کۆمەڵگەی ئەورووپی لە سەردەمی خۆیاندا بکە.

٣- ئایا دەتوانین ڕووخاندنی باستیل بە سنوورێک دابنێین لە دوو سەردەمدا. بۆچی؟

٤- بۆچی حکومەتی شۆڕشی فەڕەنسی لەگەڵ دەوڵەتە دراوسێکانیدا کەوتە جەنگەوە؟

٥- بەراورد لە نێوان دەستووری ساڵی یەکەم (١٧٩١) و دەستووری ساڵی سێیەم بکەو ڕووەلێکچووەکان و جیاوازییەکانی نێوانیان دیاری بکە؟

٦- چۆن شۆڕشی فەڕەنسییەکان بەسەر پادشایەتیدا و ڕازی بونیان بە ناپلیۆن وەکو ئیمپراتۆری فەڕەنسا دەگونجێت؟

٧- بۆچی بەریتانیا بەرهەڵستی ناپلیۆنی کرد؟ ئایا سیاسەتی هاوسەنگی نێوان وڵاتان کاریگەری بۆ ئەوە هەبوو؟

٨- گرنگترین هۆکارەکانی بێهێزی و کەوتنی ناپلیۆن بژمێرە و یەکێکیان بە درێژی باس بکە.

٩- گرنگترین ئەو بیروباوەڕانە بەڵگەنامەکانی مافی مرۆڤ گرتبوونییە خۆی کامانەن و کاریگەریان بۆ سەر مێژووی نوێ چییە؟

١٠- بیروباوەڕەکانی شۆڕشی فەڕەنسی کامانە؟ شۆڕشی تا چ ڕادەیەک توانی ئەو بیروباوڕانە بهێنێتە دی؟

١١- هەندێکیان دەڵێن (هۆکانی شۆڕشی فەڕەنسی سیاسیین) ڕات بەرامبەر ئەم واتایە چییە؟

## چالاکی

خوێندکار ڕاپۆرتێک لەبارەی یەکێک لەو کەسایەتییانە بنووسێ کە پێی سەرسام بووە لە مێژوودا ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە، لەو کەسایەتییانەی لەم بەندە دا ناویان هاتووە.

## بەندی دووەم

# شۆڕشی پشەسازی و پەرەسەندنە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان

## بەشی یەکەم

### شۆڕشی پیشەسازی

### ١-باری ئەوروپا پێش شۆڕشی پیشەسازی:

کشتوکاڵ پێش شۆڕشی پیشەسازی دیارترین سیمای ژیانی ئەوروپا بوو لە هەمان کات دەرامەتی سەرەکی سامانی نەتەوەکان بوو، هەروەها سامانی دەوڵەمەندە گەورەکان بەتایبەتی خانەدانەکان لە موڵکدارییەتی زەوی پێکهاتبوو، بەڵام سەرمایە گەورەکان لە ڕێگای بازرگانییەوە پەیدادەبوو، بەتایبەتی بە هاوبەشیکردنی لەگەڵ ئەو کۆمپانیا بازرگانیە گەورانەی بازرگانی هیندستان و جیهانی نوێیان قۆرخ کردبوو.

بەڵام دانیشتوانی ئەوروپا لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەمدا ژمارەیان لە (١٨٠) ملیۆن کەس تێنەدەپەڕی.

شارەکان وەکو ئێستا دانیشتوانیان زۆر جەنجاڵ نەبوو بۆ نموونە دانیشتوانی پاریس لە ٧٠٠٠٠ کەس زیاتر نەدەبوون، بەڵام شارە پیشەسازییە گەورەکانی ئێستا وەکو مانچستەر و پەرمەنگهام لە بەریتانیا، و لیل و لیۆن لە فەرەنسا، چەند شارێکی بچووک بوون و هیچ گرنگەکانیان نەبوون، هەروەها زۆربەی ئەو شارە ناسراوانەی ئەمڕۆ مۆرکی کشتوکاڵیان پێوەبوو، تەنیا پایتەختەکان هەندێک جەنجاڵییان پێوە دیاربوو، هەروەها بزوتنەوەی بازرگانی یان پیشەسازیان تێدابوو. بەشێوەیەکی تایبەتی خانەدانەکان و کۆمپانیا هاوبەشەکانی تیادا نیشتەجێ بوون، بەڵام لادێکان بە تەواوی لە شارەکان دابڕابوون بەهۆی کەمی هۆی گواستنەوە و خراپی ڕێگاکانی هاتوچۆوە، ژیان تیایاندا کشتوکاڵی ڕووت بوو، ژیانی کۆمەڵایەتی دواکەوتوو بوو کۆیلەی زەویان تیادا زۆر بوو، جوتیاریش ملکەچی دەسەڵاتی دەرەبەگەکان بوو لە خانەدانەکان و پیاوانی کلێسە سەرەڕای ئەوەش ژیانی گشتی ئەوروپا پەرەی سەند بەتایبەتی کاتێک بزوتنەوەی

پیشەسازی کەوتە قۆناغی گەشەکردنی، بەڵام ئەم پێشکەوتنە زۆر لەسەرخۆبوو لەبەر ناڵەباری ژیانی ئابووری و نەبوونی هۆیەکانی بەرهەمهێنان، لەبەر ئەوە لە پێشدا بەرهەمهێنان لەسەر ئیشی دەستی و هەندێک کەرستە و ئامێری ئاسایی بەندبوو، خاوەن پیشەسازییەکان سەرمایەیەکی وایان نەبوو یاریدەی دامەزراندنی کارگەی گەورە وەکو شێوەی ئەمڕۆ دەبینین دابمەزرێن. پوختەی قسە ئەوەیە پێشکەوتنی ژیانی ئابووری پێش شۆڕشی پیشەسازی زۆر لەسەرخۆبوو لەچاو ئەو پێشکەوتنەی ئەم شۆڕشە لە پاشاندا بەرپای کرد.

## ٢- شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیا:

### ئەو هۆیانەی بەریتانیا پێش وڵاتانی دیکە خست لە شۆڕشی پیشەسازیدا:

سەرەتاکانی شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیادا پێش دەوڵەتانی تر ئەوروپا کەوت و لەوێوە گوێزرایەوە بۆ دەوڵەتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا و وڵاتانی تری ئەوروپا.

**هۆیەکانی دەرکەوتنی شۆڕشی پیشەسازی لە بەریتانیادا پێش شوێنانی تر دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێک گرینگترینیان:**

**١- سەقامگیری باری رامیاری:**

لەساڵی ١٦٦٨ زدا شۆڕشێکی مەزن لە بەریتانیا بەرپابوو، بووە هۆی جێگیربوونی پادشایەتی و پەرلەمان، ئینجا پارتە ڕامیاریەکان بە هێزبوون و سیستەمی ئەنجومەنی وەزیران دانرا و بەریتانیا دوورخستەوە لە کودەتا (انقلاب) کتوپڕەکان و کارەساتی جەنگەکانی شۆڕشی فەرەنسی و ناپلیۆنەوە، گەر مەترسی نەکەوێتە سەر بەرژەوەندییەکانی نەچێتە ناو شەڕەکە. بەو جۆرە باری ژیان جێگیربوون دانیشتوانیش گرنگیان بە باری ئابووری و پیشەسازی دا.

**٢- گەشەکردنی سەرمایەداری بەریتانی:**

لە ئەنجامی سوود و قازانجی کشتوکاڵ و بازرگانی سامانێکی زۆر لە بەریتانیا کەڵەکە بوو، لە ئەنجامی بەرپابوونی شۆڕشی بازرگانی و پەیڕەوکردنی (ڕامیاری بازرگانی ئازاد) سەرمایەداری تیایدا پەرەی سەند و وەبەرهێنانی سەرمایەکان بۆ دامەزراندنی کارگە و کردنەوەی تۆکەند و کانەکانە و ....هتد خرانەکار.

### ٣- دەرکەوتنی بزووتنەوەی داهێنان:

یاسای بەریتانیا مافی داهێنان و موڵکداریەتی دەپاراست و هەردوو زانکۆ (گلاسکۆ) و (ئەنبەر) گرینگیان بە زانستیيە تیۆرییەکان و کردارییەکاندا (پراکتیکییەکان)دەدا. کۆمەڵە زانستییەکان پاداشتی دارایی بۆ داهێنەرەکان خەرج دەکرد هەروەها خاوەن سامان و کارگەکان ئامادەیی خۆیان بۆ سوود وەرگرتن لەو داهێنراوانە پیشاندا و بە شێوەیەکی فراوان لەبواری چاککردنی ڕێگەکانی بەرهەمهێنان بەکارهێنران، ئەم داهێنانەش سەرەتا لە چاککردنی شێوەکانی ڕستن و چنین و ئینجا بەکارهێنانی هەڵم بۆ کارپێکردنی ئامێرە میکانیکییە جیاجیاکان بەکاردەهێنران چ ئەوانەی بەکاردەهێنران لەبەرهەمهێنانی پیشەسازیدا یان لە هۆیەکانی گواستنەوەدا.

### ٤- دابینبوونی کارکردنی هەرزان

کاتێک کۆچکردن لە لادێکان بەرەو شار دەستی پێکرد. کارکردن بە نرخێکی کەم و هەرزان دەستدەکەوت و ژیان و منداڵان لە کارکردندا ململانێی پیاوانیان دەکرد، بە نرخێکی هەرزانتر لەوان کاریان دەکرد. کاری هەرزان قازانجی گەورەی بۆ سەرمایەدارەکان دابین کردو هانیدان سامانەکانیان لە پرۆژەی نوێدا وەبەربهێنن.

### ٥- زۆری کانزاو سووتەمەنی بە تایبەتی ئاسن و خەڵووز:

لەوانەیە بوونی خەڵووز لە نزیک ئاسنەوە لەو فاکتەرە گرنگانە بێت کە بوونە هۆی سەرکەوتنی پیشەسازی لە بەریتانیا، ئەویش لەبەرئاسانی بەکارهێنی لە پیشەسازیە گەورەکاندا. لەپێشدا تەختە و دار لە کارگەکاندا وەکو سووتەمەنی بەکاردەهێران و ئەمەش بەگران ڕادەوەستا، بەڵام خەڵووز یاریدەی پێشکەوتنی پیشەسازیدا بە هۆی زۆری و توندی گەرمییەکەی و گونجانی لەگەڵ ئامێرە نوێکاندا.

### ٦- ئاوو هەوای بەریتانیا و شوێنە جوگرافییەکەی:

ئەم هۆکارە یاریدەی ئەوەیدا کە لە مەیدانی پیشەسازیدا پێش وڵاتانی تر بکەوێت، چونکە پێکهاتنی لە کۆمەڵە دوورگەیەکی دابڕاو و لە کیشوەری ئەورووپادا و ئینجا گەیشتنی لە ڕێگەی دەریاوە بە داگیرگەکانی و دەسەڵاتداریەتی لە دەریادا، ئەوانە هەموو یارمەتی دا، کەلوپەلی زۆر بنرێتە دەرەوە و کەرستەی سەرەتایش بەدەست بهێنێت، هەروەها ئاوو هەوا شێدارەکەی ئەوسا و ئێستاش بۆ هەندێک پیشەسازی بەتایبەتی پیشەسازی ڕستن و چنین گونجاوە.

## ٣- داهێنراوە میکانییەکان و سیستەمی کارگەکان:

بنچینەکانی شۆڕشی پیشەسازی لەسەر دوو بزووتنەوەی گرنگ بەندە، یەکەمیان بزووتنەی داهێنان و بە کرداری جێبەجێ کردن لە کشتوکاڵ و پیشەسازی و سوود لێوەرگرتنی لە ڕێگاوباندا، بەڵام بزووتنەوەی دووەم بەسیستەمی کارگەکان ناسراوە.

### ١-بزووتنەوەی داهێنان:

ئەو داهێنراوە گرنگانەی لە خۆررئاوا دەرکەوتن بەرهەمی بیری بەشێکی کەمی داهێنەرەکان نەبوون، بەڵکو کۆششی چەند داهێنەرێک بوون کە هاوکاری تەواوکردن و پێگەیشتنیاندا. ساڵی ١٧٣٨زدا جۆن کای (Gonh Kay) توانی ئامێرێکی نوێ دابهێنێت پێی دەوترا (مەکۆکی باڵدار) کە بەهۆیەوە کرێکار دەتوانێ مەکۆکەکە بە خێراییەکی زۆر بجوڵێنێت، ئەویش بەهۆی تاڵە دەزوویەک کە پێوەی بەستراوە، بەوەش خێرایی ڕستن زۆرتر بوو، هەروەها کرێکار دەیتوانی چنراوی پانیش دروست بکات. هەروەها جێمس هاگرێفز Hagreaves Game لەساڵی ١٧٧٠زدا ئامێرێکی نوێی بەناوی (جینی) وە داهێنا، ئەویش تەشیلەیەکی لێکدراوە بەهۆیەوە کرێکار دەتوانێت لەیەک کاتدا سەرپەرشتی هەشت تەشیلەیەکی لێکدراوە بکات و ئاشکرایە ئەم ئامێرە چەند گرنگی هەیە لە زیادکردنی خێرایی ڕستن و هەزاران بونیدا، دواتر چەند چاککردنێکی تر بەسەر ئەم تەشیلەدا هات بەزیادکردنی ژمارەی تەشیلە و تەونەکان، ئەوەش هەنگاوێکی گرنگ بوو لە ڕێگای دامەزراندنی کارگەکاندا.

یەکێک لەو داهێنەرانەی کە ناوی بەداهێنانی جووڵێنەری هەڵمەوە لکا (جێمس وات) (Games Watt)١٧٣٦ز – ١٨١٩ز بوو، لەساڵی ١٨٠٧ف دا ڕۆبێرت فۆڵتن (Robert Fulton) توانی کەشتییەک دروست بکات و بەسەرکەوتوویی لە ڕووباری هدسن، ئیشی پێ بکات. لە ساڵی ١٨٣٨زدا یەکەم کەشتی هەڵمی دروست کرا کەلە (١٥) ڕۆژدا زەریای ئەتڵەسی بڕی، واتە بەنیوەی ئەو ماوەیەی ئەوکاتە کەشتییە چارۆکەدارەکان دەیانبڕی. دەستپێشخەری و چاکی لەبەرکاهێنانی جووڵێنەری هەڵمی بۆ کارپێککردنی شەمەندەفەری ئاسنین بۆ (جۆرج ستیفنسن) دەگەڕێتەوە.

### ٢- سیستەمی کارگەکان:

بەڵام سیستەمی کارگەکان پاش دەرکەوتنی داهێنراوەکان هاتە کایەوە کە لە پیشەسازیدا سووردی لێ وەرگیرا. خاوەن پیشەسازییەکان پێش شۆڕشی پیشەسازی بەزۆری کاریان لە ماڵەکانیدا دەکرد، ژنان و منداڵان لە زۆربەی کارەکاندا هاوبەشی

پیاوانیان دەکرد. کاتێک داهێنراوە نوێکان دەرکەوتن بەتایبەتی ئەوانەی بەهێزی هەڵم دەجولاًنەوە. ئیتر ماڵەکان بۆ کارکردن نەدەگونجان و وردە وردە پیشەسازییە ناوماڵەکان لە ناو دەچوون و کارگە گەورەکان بە ئامێرە مەزنەکانیانەوە کە هەزاران کرێکار کاریان تێدا دەکردن شوێنیان دەگرتنەوە. بەو جۆرە بەرهەمە پیشەسازییەکان بە هۆی ئامێری میکانیکیەکانەوە دروست دەکران لەسەر بنچینەی پسپۆری لە کار و بەرهەمدا بە شێوەیەکی فراوان.

سیستەمی کارگەکان لەسەر بنچینەی کۆکردنەوەی سامان دامەزراوە کە کەسانێکی زۆر هاوبەشی کۆکردنەوەکە دەکەن، چونکە لە توانای کەسێکدا نییە ئەو جۆرە کارگە گەورانە بکرێت و بەڕێوەی بەرێت، بۆ هێنانەدی ئەم ئامانجە هەر دەبێت هاوکاری لەگەڵ کەسانی تر بکرێت. ئەم پێویستییە بووە هۆی هاوکاری کردن بۆ پێکهێنانی کۆمپانیا پیشەسازییە هاوبەشەکان بۆ کۆکردنەوەی سەرمایەی پێویست و ڕێکخستنی کار.

ئەم سیستەمە تازەیەی کارگەکان چەندین خاڵی باشی هەیە وەکو بەکارهێنانی ئامێرە میکانیکییە گەورەکان کە یارمەتی بەرهەمهێنانیان دەدا، بە شێوەیەکی فراوان و بەوەش نرخی تێچوون کەم دەبۆوە و نرخی بەرهەمهێنراوەکان هەزاران دەبوو، هەروەها یارمەتی پسپۆری لەکاردا دەدا، کە کرێکار دەتوانێت بەکارێکی دیاری کراو هەڵستێت و لەئەنجامدا وردەکاری تێدا بکات و بەخێرایی و چاپووکی بەرهەمی بێنێت.

بەڵام بزووتنەوەی پیشەسازی زیانێکی زۆری لە کشتوکاڵدا، ئەویش کاتێک جوتیارەکان وازیان لەکشتوکاڵ هێنا و کەوتنە کۆچکردن بۆ شارەکان و کارکردن لە کارگەکاندا. شارە پیشەسازییەکان جەنجاڵ بوون و ئەو وڵاتانە نەیاندەتوانی بۆ پێویستی ژیانی خۆیان پشت بە بەرووبوومە کشتوکاڵیەکانیان ببەستن و ناچاربوون لە دەرەوە بەرووبووم و خواردەمەنی بێنن.

پوختەی قسە، ڕەنگە سیستەمی کارگەکان پاش داهێنراوە میکانیکیەکان،گرنگترین هۆی پێشکەوتنی پیشەسازی بووبێت، ئەو پێشکەوتنەی بووە هۆی گۆڕینی مۆرکی کشتوکاڵی کۆمەڵگەی ئەورووپی بۆ مۆرکی پیشەسازی بەتایبەتی لە دەوڵەتە گەورەکانی بەریتانیا و ئەڵمانیا و فەڕەنسادا.

## ٤- گواستنەوەی شۆڕشی پیشەسازی بۆ کیشوەری ئەورووپا:

شۆڕشی پیشەسازی سەرەتا لە بەریتانیا دەرکەوت، بەڵام زۆری پێنەچوو لە دەوڵەتانی ئەورووپای ڕۆژئاواشدا دەرکەوت، بزوتنەوەی پیشەسازی لە فەڕەنسا بەشێوەیەکی فراوان لە سەردەمی (لویس فیلیب) و (ناپلیۆنی سێیەم)دا بڵاوبۆوە، بەڵام لەوڵاتەکانی تری ئەورووپا لە ڕێگای بەریتانیا و فەڕەنساوە بڵاوبۆوە و لەوانە داهێنراوە میکانیکییەکان و سیستەمی کارگەکانیان وەرگرت. هەروەها سوودیان لە شارەزاییە پیشەسازییەکانیان وەرگرت بەتایبەتی ئەو چاککردن و وردەکاریانەی بەسەر ئامێرەکاندا هێنا لە ئەنجامی بەکارهێنانیان لە پیشەسازیدا پێش دەوڵەتانیتر. لەبەر ڕۆشنایی ئەم تاقیکردنەوانە بزووتنەوەی پیشەسازی لەبەلجیکا و ئەڵمانیا و نەمسا و مەجەڕ و ئیتاڵیا و ڕووسیادا بڵاوبۆوە.

پیشەسازی بوارێکی بەرفراوانی زۆری بۆ بڵاوبوونەوە نەدەبوو ئەگەر بۆ دامەزراندن و بڵاوبوونەوەی مەرجە پێویستەکانی دابین نەکرایە. لەبەرئەوە ئەم بزووتنەوەیە لە خۆرئاوا و ناوەڕاستی ئەورووپادا دەبوو بە خێرایی بڵاوببێتەوە لەبەربوونی خەڵووز و ئاسن (بەتایبەتی ئەگەر کانەکانیان نزیک یەک بوونایە) و بوونی سەرمایە و شارەزایی هونەری و بازاڕ بۆ فرۆشتنی بەرهەم هێنراوەکان لە کاتێکدا لە هەندێک بەشەکانی ئەورووپای خۆرهەڵاتدا لەبەر بوونی ئەم هۆیانە بڵاوبوونەوەی دواکەوت.

## ٥- ڕواڵەتەکانی شۆڕشی پیشەسازی:

شۆڕشی پیشەسازی بەشێوەی هێنانی هەندێک داهێنراوەی نوێ بۆ مەیدانی پیشەسازی و چاککردن ئامێرە کۆنەکان دەستی پێکرد، بەڵام ئەنجامەکانی ئەو شۆڕشە تەنیا بزووتنەوەی پیشەسازی نەگرتەوە، بەڵکو بە هەموو بوارەکانی ژیانەوە دیاربوو، لە خوارەوە هەندێک لە ڕواڵەتەکانی ئەم شۆڕشە دیاری دەکەین:

### یەکەم: زۆربوون سامان:

لە ئەنجامی بەکارهێنانی ئامێرەمیکانییەکان و فراوانبوونی بزووتنەوەی دامەزراندنی کارگەکان سامانێکی زۆر لە دەوڵەتە پیشەسازییەکان کەڵەکەبوو، کەیارمەتی زۆربوونی بەرهەمهێنانی داو ئەمیش بەدەوری خۆی یارمەتی هەرزانی بڵاوبوونەوەی کەلوپەلەکانیدا کەبووە هۆی ئەوەی خاوەن کارگەکان سوودێکی زۆرگەورە وەدەست بێنن.

هەروەها بزووتنەوەی پیشەسازی لە فەرەنسا و ئەڵمانیادا بووە هۆی فراوانبوونی سامان و زیادبوونی بەرهەم، بەڵام لە بوارێکی تەسکتردا لەوەی لە بەریتانیا، چونکە شۆڕشی فەرەنسی و جەنگەکانی ناپلیۆن، فەرەنساو ئەوروپای بۆ ماوەیەک واخەریک کردبوو کە گوێ نەدەنە بزووتنەوەی پیشەسازی، لەبەر ئەوە ئەم بزووتنەوەیە لە فەرەنسادا تا دوای ساڵی ١٨٤٠ ز دواکەوت.

### دووەم: زیادبوونی دانیشتوان:

شتێکی ئاسایی پیشەسازی بێتە هۆی زیادبوونی دانیشتوان، چونکە پەرەی بە بەرهەمهێنان و سامانی گشتنی داو لە توانای زۆرترین ژمارەی خەڵک دابوو بتوانن لە ژێر سایەی ئەم سیستەمە ئابوورییە نوێیەدا بژین زیاتر لەو توانایەی کە پێش هەبووە لە خشتەکەدا بەراوردێکی دانیشتوانی دەوڵەتە گەورەکانە لە ساڵە ١٨٠٠ و ١٨٧٠زدا.

| دەوڵەت | ژمارەی دانیشتوانی ساڵی ١٨٠٠ | ژمارەی دانیشتوانی ساڵی ١٨٧٠ |
|---|---|---|
| بەریتانیا | ١٤ ملیۆن | ٣١ ملیۆن |
| فەرەنسا | ٢٧ ملیۆن | ٣٦ ملیۆن |
| ئەڵمانیا | ٢١ ملیۆن | ٢٧ ملیۆن |
| ئیتاڵیا | ١٨ ملیۆن | ٣٨ ملیۆن |

لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کاریگەری شۆڕشی پیشەسازی بۆ زیادبوونی دانیشتوانی دەوڵەتە پیشەسازییەکان چەندە و ئەم زیادبوونەش تەنیا لە زیادبوون بەهۆی لە دایک بوونەوە نییە، بەڵکو لە ئەنجامی باشبوونی باری تەندروستی ئەو وڵاتانەوەیە کە بووە هۆی کەمبوونەوەی مردن، گومانی تێدا نییە کە ئەم زیادبوونی دانیشتوانە لە لادێکان و ناوچە کشتوکاڵیەکاندا ڕووی نەدا، بەڵکو زیاتر ناوچە پیشەسازییەکانی گرتەوە، هەروەها هۆیەکی تریش کە یارمەتی زیادبوونی

ژمارەی دانیشتوانی شارەکانیدا ئەویش کۆچکردنی جوتیارەکان بوو لە لادێکانەوە بە ئامانجی وەدەستهێنانی کرێیەکی بەرزتر لەکارکردندا کە لە توانایدا نەبوو لە پیشەی کشتوکاڵ کردندا بەدەستی بێنن. بەم جۆرە ژمارەیەکی زۆری جوتیاران کۆچیان کرد و کێڵگەکانیان بەجێهێشت بەرەو شارەکان تا لە کارگەکاندا کار بکەن لە ئەنجامی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان وای لێهات پەیدابوونی شاری پیشەسازی گەورەی لێکەوتەوە کە لە پێش شۆڕشی پیشەسازیدا چەند شارێکی بچووک یان لادێکی بێ بایەخ بوون وەکو (مانچستەر و بەرمەنگهام و شیفلیلد لە بەریتانیا، لیل و لیۆن لە فەرەنسا، بەرلین و کۆلۆن و فرانکفۆرت لە ئەڵمانیا).

## سێیەم: ئاسانی هاتووچۆ:

جولێنەری هەڵمی تەنیا کاری نەکردە سەر گۆڕینی شێوەی بەرهەمهێنان، بەڵکو هاتووچۆشی گرتەوە و شۆڕشێکی قووڵی تیادا بەرپاکرد، ئاسانی و خێرایی هاتوچۆکردن بە گرنگترین ڕواڵەتەکانی ئەم شۆڕشە دادەنرێت، چونکە سیستەمی کارگەکان و شێوەی بەرهەمهێنان فراوان و بەئاشکرا دەریخست کە پێویستی بە هۆی باش و خێرایی هۆیەکانی گواستنەوە هەبووە بۆ گواستنەوەی کەرستە سەرەتاییەکان بە خێرایی بۆ کارگەکان و لەوێوە کەلوپەلەکان بنێردرێتە بازاڕەکان، بازرگانی ناوەخۆ و دەرەکی بەتەواوی پشتی بە هاتووچۆ و خێرایی و کەمی نرخەکەی دەبەست.

بەریتانیا لەبەکارهێنانی جولێنەری هەڵمی بۆ بۆ ئاسانکردنی هاتووچۆ پێش هەموو وڵاتەکانی تر کەوت. لەساڵی ١٨٢٥زدا یەکەم هێڵی ئاسنی لە جیهاندا لە نێوان ستۆکن (Stocten) و دارلنگتۆن (Darilington) دامەزراند. بەڵام لە فەرەنسادا بزووتنەوەی دامەزراندنی هێڵەکانی ئاسن ئەمیش لەلایەن کۆمپانیاکانەوە بووە، بەڵام لە ژێر چاودێری حکومەتەکان و یارمەتی داراییان بووە.

کارتێکردنی شۆڕشی پیشەسازی تەنیا هاتووچۆی وشکانی نەگرتەوە، بەڵکو هاتووچۆی دەریایشی گرتەوە کە سەرەڕای بەکارهێنانی جولێنەری هەڵمی بۆ لێخوڕینی کەشتییەکان، لە دروست کردنیشیاندا لە جیاتی تەختە، ئاسن بەکارهێنراو وایان لێهات قەوارەکەیان لە کەشتییە چارۆکەدارەکاندا گەورەتر بوو، سەرەڕای خێراتر بوو ئەو پێشکەوتنە گەورەیەبووە هۆی خێرایی گواستنەوە و نزمبوونەوەی نرخی بار گواستنەوە لەوڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر

و فراوانبوونـی بازرگانـی، هەروەهـا ئـەم پێشـکەوتنە یارمەتـی ڕێکوپێکـی کاتـی گواسـتنەوە و دەستنشـان کردنـی کاتـی ڕۆیشـتنی پاپـۆڕکان، کـە سـوود و قازانجێکـی زۆری بـە بـازرگان و هاتووچـۆی خەڵـک گەیانـد، چەندیـن کۆمپانیـا دامـەزرا بـۆ ئاسـانکاری هاتوچـۆی سەرنشـینان و بارکردنـی کەلوپـەل بـۆ هەمـوو لایەکـی جیهـان دروسـت بـوو.

## چوارەم: فراوانبوونی بازرگانی:

ئـەو گۆڕانکاریـەی شۆڕشـی پیشەسـازی لەبـواری هاتوچۆکـردن وشـێوەی بەرهـەم هێنانـدا هێنایەکایـەوە، کاریگـەری زۆری بۆسـەر فراوانبوونـی بزووتنـەوەی بازرگانـی هەبـوو، پێویسـتی وەدەسـت هێنانـی کەرەسـە سـەرەتاییەکان و دۆزینـەوەی بـازاڕ بـۆ فرۆشـتنی کەلوپەلـە پیشەسـازییەکان و خسـتنەگەڕی سـەرمایە، گەلێک یاریـدەی فراوانبوونـی بازرگانیانـدا بەشـێوەیەک مرۆڤ پێـش شۆڕشـی پیشەسـازی خەویشـی پێـوە نەدیبـوو، بەریتانیـا لەهەمـوو دەوڵەتانـی تـر زیاتـر سـوودی لـەم فراوانبوونـی بازرگانیـەوە وەرگـرت بەتایبەتـی لـە ناوەڕاسـتی سـەدەمی نـۆزدەم.

فراوانبوونـی بازرگانـی دەرەوە بـوو بەهـۆی دامەزراندنـی گەلێک بانکـی گـەورە بـۆ ئاسـانکردنی گۆڕینـەوە لەنێـوان وڵاتـە جیاجیاکانـدا کاتێک بانکـەکان ژمارەیـان زۆر بـوو لەسـاڵی ١٨٧٠دا ڕێبازێکـی نـوێ هاتەکایـەوە، ئەویـش دامەزراندنـی بانکـە حکومییـەکان بـوو بـۆ چاودێری بانکـەکان و ڕێکوپێکـی مامەڵـە دەرکردنـی پـارە، ئـەم بانکانـە گەلێک خزمەتیـان پێشکەشـی کۆمپانیـا پیشەسـازی و بازرگانییـەکان کـرد، ئەویـش بەقـەرز پێدانیـان تـا بتوانـن هەسـتن بەکردنـەوەی پـرۆژەی پیشەسـازی و بازرگانـی هەموجـۆر.

لـە ڕواڵەتەکانـی فراوانبوونـی بازرگانـی بڵاوبوونـەوەی ڕێبـازی ئـازادی بازرگانـی بـوو. لەسـەدەی هەژدەمـدا سـەراپای دەوڵەتـە ئەورووپییـەکان ڕێبـازی ڕامیـاری پاراسـتنیان گرتـووە بـەر، ئەویـش بەدانانـی باجێکـی گومرگـی بـەرز بەسـەر داهاتەکانـدا، بـەڵام لەسـەدەمی نۆزدەمـدا ڕامیـاری ئـازادی بازرگانـی دەسـتی کـرد بەبڵاوبوونـەوە، بەهـۆی هەوڵدانـی ئـەو ئابووری ناسـانەی دەیانویسـت بیروڕاکانی (ئامادەم سمث) ئابووریناسـی بەریتانـی وخـاوەن کتێبـی سـامانی نەتـەوەکان (wealth of nations) بڵاوبکەنـەوە.

## پێنجەم: باری ژیانی کرێکاران:

شۆڕشی پیشەسازی سەرەتا کارێکی باشی نەکردە سەر ژیانی کرێکاران، چونکە باری تەندروستیان خراپتر بوو. ئاستی گوزەرانیشیان لەچاو زۆربوونی سامانی گشتیدا کەمێک نەبێت ئەوەندە بەرز نەبۆوە لەگەڕەکی پەرپووت و ماڵی تەنگەبەری وادا نیشتەجێبوون هیچ مەرجێکی تەندروستیان تێدا نەبوو، ژنان و منداڵان شەو و ڕۆژ کاریان دەکرد بەنرخێکی وا هەرگیز تێری نەدەکردن. خاوەن کارگەکان هەموو هەوڵدانێکی چاککردنیان ڕەت دەکردەوە ئەگەر لەڕێگای یاسادانانیشەوە بوایە، بە دەست درێژیان دادەنا بۆسەر مافی موڵکداریەتی تاکەکەس، تەنانەت کرێکاران لەسەرخۆ دەمردن لەبرساندا و لەئەنجامی کاری گران و هەڵسوکەوتی دوور لە مرۆڤانەی خاوەن کارگەکان لەسەرخۆ دەمرن کەباڵی بەسەردا کێشابوون، بەڵام لەنیوەی دووەمی سەدەمی نۆزدەمەوە باری ژیانیان باشتر بوو بەهۆی گرنگیدانی حکومەتەکان بەباری تەندروستی کرێکاران و دوورخستنەوەی منداڵ لەکارکردن لەکانەکاندا وهەندێک پیشەسازی قورس.

باری ژیانی کرێکاران بەرەو باشتر چوو کاتێک ڕێگایان پێدرا جڤات (نەقابە) دابمەزرێنن و کرێکاران لەچواریەکی یەکەمی سەدەمی نۆزدەمدا کۆبوونەوەیان لێ قەدەغە کرابوو، ئەمجا لەساڵی ١٨٤٤زدا لە بەریتانیادا یاسای کۆبوونەوە لابرا، ئیتر کرێکاران بۆیان هەبوو کۆمەڵە و جڤاتەکانیان پێک بێنن بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان وبڕیاری دیاریکردنی نرخی کرێ دەربکەن و داوای زیادبوونی لەخاوەن کارگەکان بکەن تا وایان لێهات مافی مانگرتنیان بەکار دەهێنا لەکارکردن بۆ بەرگریکردن لە داواکارییەکانیان بەرامبەر خاوەن کارگەکان.

# بەشی دووەم

## پەرەسەندنە ئابووری وکۆمەڵایەتییەکان پاش شۆڕشی پیشەسازی

### ١- گەشەکردنی چینی بۆرجوازی (ناوەند):

ئـەم چینــە پێــش شۆڕشــی پیشەســازی هەبــوو، بازرگانــەکان و خــاوەن پیشــە جۆربەجۆرەکانــی دەگرتــەوە، بــەڵام ئــەم چینــە بایەخــی پێنەدرابــوو، شــان بەشــانی چینــی خانــەدان و جوتیــاران، بــەڵام چینــی بورجــوازی (ناوەنــد) لەدوای ئەمانــەوە بوون، لەگــەڵ ئەوەشــدا وردە وردە گەشــەی دەکــرد و هێزوتوانــای لەزیــاد بوونــدا بــوو ئــەوەش بەڵگەبــوو کــە دواڕۆژدا دەبێتــە چینێکــی بایەخــدار لەکۆمەڵــدا، چونکــە پێشــکەوتنی زانســتی گەلێکـ هەنــگاوی گــەورەی لەپێنــاوی کەمکردنــەوەی بــاری ســەرشــانی مرۆڤـ و ئاســانکردنی کارەکانیــدا نابــوو.

ئەمــە ســەرەڕای کاری گیانــی ئــازادی و بڵاوبوونــەوەی بیــری نەتەوایەتــی کــە چەنــد چینــی بورجوازیــان (ناوەنــد) بەهێزکــرد و پایەداریــان کــرد. ئازادیخــوازان و هەڵگرانــی بیــری نەتەوایەتــی لــە نووســەران پشــتی ئــەم چینەیــان دەگــرت و بەپشــتیوانی نەتــەوەو هێــزی وڵاتیــان دادەنــا. ئەمجــا ئەمیــش بــەدەوری خــۆی پــارەی بــۆ ڕۆژنامــە و گۆمەڵــەو پارتییــەکان هەڵڕشــت تــا پشــتی بگــرن و بەرگــری لێبکــەن و وا لــە حکومــەت بکــەن دوای ڕامیارییەکـ بکەوێت لەگــەڵ بەرژەوەندیەکانیانــدا بگونجێــت.

لەبــەر ئــەوە ئــەم چینــە بــەو دەســەڵاتدارییەی لەجیهانــی مــادی و بیــردا وەدەســتی هێنابــوو نەوەســتا، بەڵکــو دەســتوبرد کەوتــە داوای ئــەوەی لــە کاروبــاری دەوڵەتیشــدا دەســەڵاتی هەبێــت، کاتێکـ ئــاوڕی لــێ نەدرایــەوە و گوێــی لــێ نەگیــرا پەنــای بــردە بــەر گەلەکۆمەکــێ، ئەویــش بەپێکهێنانــی پــارت و کۆمەڵــەکان تــاداوای مافەکانــی بــکات. زۆربــەی داواکارییەکانــی بریتــی بــوون (لەئاشــکراکردنی ئــازادی و ســەربەســتی بازرگانــی و دەســت تێوەرنەدانــی حکومــەت لــە کاروبــاری پیشەســازیدا تــا بتوانێــت

بەرهەمــە پیشەســازییەکانی بنێرێتــە داگیرگــەو هەرێمەکانــی تریــش تــا لەئەنجامــدا سوودو قازانجێکی زۆریـان لـێ وەدەسـت بێنـی، ئەمجـا داوای هاوبەشـی ڕۆڵەکانـی لـە حوکمـدا کـرد، بـۆ ئەمـەش ئـەم چینـە پەنـای بـردە بـەر داواکردنـی حوکمـی دەسـتووری نوێنەرایەتــی پەرلەمانــی).

لەڕاســتیدا مێــژووی ئەورووپــا لەســەدەی نۆزدەمــدا تەنیــا بریتــی بــوو لــە مێــژووی ململانــێ نێــوان ئــەم چینــە لەگــەڵ دەرەبەگایەتیـدا لەپێنـاوی چەسـپاندنی قــەوارە و بیروباوەڕەکانـی خـۆی و مسـۆگەرکردنی بەرژەوەندیـە چینایەتییەکانـی، بەهـۆی هێـزی پێگـە و توانـا مادییەکەیـەوە توانـی سـەربکەوێت وچـی ویسـت بەدەسـتی بێنـی، و هـەر کارتێکردنـی ئـەم چینـە بـوو چاکسـازیە دەسـتوورییەکانی سـاڵی ١٨٣٢ز لـە بەریتانیـا و سـاڵی ١٨٧٥ز لـە فەرەنسـا وپاشـان لەئەڵمانیـا دوای یەکگرتنەکـەی و لەئیتاڵیـا پـاش یەکێتییەکـەی هاتنـە دی.

### ئەم چاکسازییە دەستوورییە ئەم خاڵانەی گرتۆتەوە:

١- فراوانبوونـی مافـی هەڵبـژاردن بەجۆرێکـ بەپلـەی یەکـەم ڕۆڵەکانـی چینـی بورجـوازی (ناوەنـد) بگرێتەوە.

٢- زیادکردنـی دەسـەڵاتی پەرلەمـان بەجۆرێکـ نوێنەرانـی ئـەم چینـە کارێکـی وابکـەن گوێڕایەڵـی قسـەکانیان بکرێـت وئامانجەکانیـان بهێنرێتـە دی.

٣- پادشـا لێپرسـراو نەبێـت ئەویـش بـۆ بێهێزکردنـی چینی ئەرسـتۆکراتی کـەدژ بەچینی بورجـوازی بوو.

## ٢- دەرکەوتنی چینی کرێکاران و گیروگرفتەکانی:

لەکاتـی سـەرهەڵدانی شۆڕشـی پیشەسـازیدا چینـی کرێـکاران هیـچ بایەخێکیـان پـێ نـەدەدرا، چونکـە ئەندامەکانـی تێکـەڵ بەچینـی بورجـوازی (ناوەند)بـوو بـوون، ئـەم شۆڕشـە بەشـان بازووی ئەوان بەرپابوو و پایەدار و فراوانبوو و هەرئەوان هەڵسـوڕێنەری ئامێـرەکان بـوون و کەلەپەلیـان بـە بەرهـەم دێنـا و سـامانیان بـۆ خـاوەن سـەرمایەکان و بازرگانـە دەوڵەمەنـدەکان بەدەسـت دەهێنـا، پـاش ماندووبونێکـی زۆر بەرامبـەر کرێیەکی دیـاری کـراو. ئەمانـە کاتێکـ سـەرچاوەی ژیانیـان لـە دەسـت دا بەهـۆی بەدەرکەوتنـی ئامێـرکان و دامەزراندنـی کارگـەکان کـە پیشەسـازییە تاکەکەسـییەکانی لەناوبـرد و مـاڵ و لادێکانیـان بەجێهێشـت و پەنایـان بـردە بـەر شـارەکان بـۆ بـە دەسـتهێنانی پـارەو پولێـک ژیانیـان بەکارگەکانـەوە بەسـترایەوە، لەپێشـدا شـتێکی ئاسـایی بـوو بەپێـی ئـەو بـارە پشـتگیری سـەرمایەدارەکانیان لەداواکارییەکانیانـدا بکردایـە بەئومێدی چاکبوونـی بـاری مـادی و مەعنەویـان.

بـەڵام کاتـێ بینیـان خـاوەن کارگـە و کۆمپانیـاکان ئاوڕیـان لـێ نادەنـەوە و هـەر سـوودی تایبەتـی خۆیـان لا گرنگـە ئەوانیـان تەنیـا وەکـ هۆیەکـ بـۆ زیادکردنـی سـوود و زۆرکردنـی سـامانەکانەکانیان بەکارهێنـاوە، نائومێـد بـوون لێیـان وئەوکاتـە کرێـکاران کەوتنـە خۆیـان بـۆ بەرگـری کـردن لـە بەرژەوەندییەکانیـان و داواکردنـی مافـە جۆراوجۆرەکانیـان و بـۆ ئـەم مەبەسـتە چەنـد کۆمەڵێکـ و جڤاتێکیـان پێکهێنـا و بـەو جـۆرە چینێکـی تـری کۆمەڵایەتـی پەیدابـوو ناسـرا بـە چینـی کرێـکاران کەکەوتنـە داواکاری لەحکومەتـەکان تـا مافەکانیـان بپارێـزن وبەرگریـان لێبکـەن دژی خـاوەن کارگـەکان و سـەرمایەدارەکان کەئەوانـە هیـچ هۆیەکـی تەندروسـتی وڕۆشـنبیریان بـۆ نەڕەخسـاند بـوون ژیانیـان مسـۆگەر بـکات ، بـەڵام لەپێشـدا چینـی فەرمانـڕەوا داواکارەکانیانـی جێبەجـێ نەدەکـرد، بەڵکـو کۆسـپی زۆری لەڕێگایانـدا دانـا و یاسـای کۆبونەوەیـان دانـا بەگوێـرەی ئـەم یاسـایە ڕێـگای کۆبوونـەوە لـە کرێـکاران گیـرا و لـە مافـی پێکهێنانـی جڤاتـەکان بـۆ بەرگـری لـە مافەکانیـان بێبـەش کـران، بـەڵام ئـەو هەڵوێسـتە ناڕەوایانـە وای لێکـردن زیاتـر سـووربون لەسـەر تێکۆشـان لەپێنـاو بارێکـی باشـتری کارکـردن.

## ٣- پێشکەوتنی تەندروستی:

یەکێک لە ڕواڵەتەکانی شۆڕشی پیشەسازی ئەو زیادبوونە خێراییەی دانیشتوان بوو کەئەنجامەکەی گۆڕانی جۆری ژیانی مرۆڤ لە کشتوکاڵەوە بۆ پیشەسازی بوو ئەم زۆربوونە لەگەڵ کارکردنی خاوەن پیشە تاکەکەسییەکان لەکارگەکاندا بەنرخێکی هەرزان، بووبە هۆی بڵاوبوونەوەی دەردو نەخۆشی کەلەپێشدا نەبوون، ئەمەوای لەزانایان کرد بکەونە جەنگەوە لەگەڵ ئەم نەخۆشییانە و شێوازی پزیشکی سەرکەوتوو بۆ بەرهەڵستی بڵاوبوونەوەی بدۆزنەوە و لەناویان ببەن و هۆی پاراستنی ئاسان بکەن ولەناو جەماوەردا بەهەموو هۆیەکی گونجاو بڵاوی بکەنەوە، لەوەوە ئەدواردجنەر (Edward jener) هات و کوتانی دژی نەخۆشی ئاوڵە بەکارهێنا کە ژمارەیەکی لەڕادەبەدەری خەڵکی لەناوبردبوو. هەروەها هۆکانی نەشتەرگەریی برینەکان بەهێمنی ولەسەرخۆ باشتربوون کەنەخۆشەکانی هاندا بەدڵنیایی وبێ ترس بچنە پێشەوە، بەڵام گەورەترین دەسکەوتی پزیشکی ئەوەبوو زانای کیمیاوی فەڕەنسی پاستۆر (Pasteur) بنچینەی سەرەکی نەخۆشییەکانی دۆزییەوە.

ئەم زانایە لەساڵی ١٨٦٣زدا دەری خست کە هەموو نەخۆشییەکان دەگەڕێنەوە بۆ گیانلەبەرێکی زۆر بچکۆڵە کە بە بەکتریا دەناسرێت. دواتر (کوخ)ی ئەڵمانی میکرۆبی سیلی دۆزییەوە، هەروەها زانایانی تر میکرۆبەکانی وەناق و سی ئاوسان و،،،، هتد چەندانی دیکە.

## ٤- پەروەردە وفێرکردن:

دوای شۆڕشی پیشەسازی، پەروەردە وفێرکردن تاڕادەیەکی زۆر کاریگەر بوونی بەو بیروڕانەی لەو کاتەدا لەجیهاندا باوبوون، بۆیە کاری پەروەردە تەنیا ئامادەکردنی مرۆڤ نەبوو بۆ جیهانی دووەم و نەگەڕانەوەبوو بۆ دواوەو تێڕوانین نەبوو بۆ رابردوو و زیندوونەکردنەوەی ئەو بیروڕایانە بوو کە لەوکاتەدا باوبوون و پابەندنەبوون بەجێبەجێکردنی تەنیا پرەنسیپەکانی سرووشتەوە، بەڵکو بەتێڕوانینێکی واقیعی و هەست پێکراوانە تەماشای ژیانی دەکرد و گیانی لەپێشکەوتنی زانستییە سروشتییەکانەوە وەردەگرت، هەروەها لەدۆزینەوەکان وداهێنراوە نوێیەکان.

لە گرنگترین نیشانەکانی شۆڕشی پیشەسازی گرنگیدان بوو بە بابەتە زانستییەکان و چۆنیەتی بەدەستهێنانی و بایەخدان بەو دیاردە سروشتییەکان و کاریگەری و وای دادەنێت لەبنچینەدا زانستەکان لە سروشتەوە وەرگیراوە، ئەو پایە بەرزی و پێشکەوتنەی مرۆڤ کە پێیگەیشتووە لە سایەی زانستەکان بووە. ئەمە نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کەپێشکەوتنی زانستی دەروون چ کارێکی دیاری لە پێشکەوتنی تێورە پەروەردەییەکاندا هەبووە، وای لێکردووە لەگەڵ پێداویستەکانی سەدەی نوێدا بگونجێت. جالەبەر پێشکەوتنی هەموو بارەکانی زانستی و هونەر، بۆیە زانایانی دەروون وایان دەبینی کەپەروەردە ڕێگایەیەکە بۆ نەشونماکردنی ئەندام لەبارەی لەش و هۆش و ڕەوشت، هەروەها دەیان بینی لێکۆڵینەوەی (غەریزەی) (ڕەمەکی) منداڵان و زانینی باری دەروونیان باشترین یاریدەدەری هێنا پێچەوانەی ئەوەنەبوو کە کۆمەڵناسان و سیاسییەکان لەپەروەردەیان دەویست، چونکە ڕێگایەک بوو بۆ پاراستنی کۆمەڵناسان و سیاسیەکان لەپەروەردەیان دەویست، چونکە ڕێگایەک بوو بۆ پاراستنی کۆمەڵ و پێشکەوتنی شان و شکۆی و کەرەسەشیان بریتی بوو لەلێکۆڵینەوەی ئەو سیستەم و کار و پێداویستیانەی کۆمەڵەکان بوو.

سیاسـییەکانیش درکیـان بـەوە کردبـوو کەپـەروەردە چ پەیوەندییەکـی بەهێـزی، بەسـەرکەوتنی حکومەتـان و پێشـکەوتنی گەلانـەوە هەیـە و کەڵێکیـان ڕوونیـان کردبۆوە کەمانـەوەی شـێوە نوێکانـی حکومەتـە دیموکراتییـەکان بەنـدە بەپـەروەردەی میللەتـان و کردنـەوەی مێشـکیان بـە زانیـاری و زانسـتییەکانەوە، ئەنجامـی ئـەوە زۆربـەی حکومەتـەکان فێرکـردن و خوێندنـی سـەرەتاییان کـرد بـە گشـتی و زۆرەملـێ و خۆڕایـی.

گەورەتریـن ئـەو زانایانـەی لـە پـەروەردەدا کاریـان کـردووە و بـەرەو ئاراسـتەیەکی زانسـتییانەیان بـردووە، پـەروەردەکاری بەناوبانـگ (بستالۆتزی) (١٧٤٦ز-١٨٢٧ز) یکـە بەمەزنتریـن پێشـڕەوی پـەروەردە ئـەو چاککارانـە دادەنرێـت کـە مێـژوو ناسـیوێتی لەسـەردەمی ڕێنسانسـی بیرکردنـەوە لـە ئەورووپـادا. کـەوا کاریگەریەکـی وای لەچاکسـازیی پـەروەردەی سـەرەتایی لەسویسـرا و ئەورووپـادا هەبـوو هیـچ کەسـێکی تـر لـە پێشـڕەوانی پـەروەردە لـە پێـش ئـەودا نەیـان بـووە، هەروەهـا جـۆن فردریکـ هربرتـی ئەڵمانـی (١٧٧٦ز-١٨٤١ز) خاوەنـی لێکۆڵینـەوە نوێکانـە لـە دەروونناسـی بیـروڕا ڕاسـت و ڕەوانـەکان لـە هونـەری فێرکردنـدا، ئەمجـا فرۆبـل (١٧٨٢ز-١٨٥٢ز)کـە هونـەری دامەزراندنـی باخچـەی سـاوایانی بـۆ دەگەڕێتـەوە.

## ٥- بزووتنەوەی ئافرەتان:

شۆڕشـی پیشەسـازی خزمەتـی وای پێشکەشـی بزووتنـەوەی ئافرەتـان کـردووە هەرگیـز نکۆڵـی لـێ ناکرێـت، چونکـە ئـەو تێکۆشـانە ئابووریـەی لـە فراوانبووندا بـوو، ئافرتانیـش تیایـدا هاوبەشـییان تێداکرد، بەڵام هیچ دەسـتکەوتێکیان لەخـاوەن کارگەکان بەدەسـت نەهێنـا بـاری سەرشـانیان سـووک بـکات و بەهەمـوو کارێکـ هەڵدەسـتان بـێ جیـاوازی نێـوان ئـەوان وپیـاوان، پـەڵام بـەرز بوونـەوەی دەنگـی کرێـکاران و داواکردنیان لەحکومەتـەکان کەبـاری ژیانیـان چاکـ بکـەن و گرنگییـان پێبـدەن و زوڵـم و سـتەمی خـاوەن کارگەکانیـان لەسـەر کـەم بکەنـەوە، کاربەدەسـتیان ناچـار کـرد بـۆ ئـەم مەبەسـتە بێنـە کایـەوە وبـاری ژیانیـان چاکـ بکـەن و ژن وەکـو پیـاوە هاوڕێیەکـەی هەندێکـ مافـی تایبەتـی وەرگـرت ئەمەبـوو بـاری ئافرەتـی کرێـکار.

بەڵام باری ژیانی کۆمەڵایەتی ئافرەت بەو شێوەیە نەبوو ئیرەیی پێ ببری، پشتگوێ خرابوو و لەکۆمەڵدا هیچ کەسایەتییەکی نەبوو، بەڵام دەرکەوتنی بزووتنەوە سۆشیالیستەکان وایان ئافرەت بێتە پێشەوە، بوون و خودی خۆی ئاشکرا بکات، چونکە سۆشیالیستەکان پشتگیری ئافرەت بوون و داوای ئازادیان بۆ دەکرد ولەچەند بارێکی تایبەتیدا هەندێک مافی تایبەتییان پێ بەخشی و ئەمە هانی پشتگیری ئافرەتیدا لەهەردوو چینەکە هەندێ مافی کۆمەڵایەتی و ڕامیارییان بۆ وەدەست بێنن.

لەپێشدا داوای فێرکردنی کچان و ئافرەتیان کرد، قوتابخانە و زانکۆکان دەرگایان بۆ کردنەوەو وەریان گرتن، بۆیە ژمارەیەک ڕووتاکبیری پایە بەرز تیایاندا هەڵکەوت کە هاوبەشی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و زانستییان بەگورج وگۆڵی کرد، بۆ نموونە لەوانە (مەدام ئەکرمەن لویز) کە هۆزانڤان و نووسەری فەلسەفە بووە. کاتێک ڕاپەڕینی ئافرەتان گەشایەوە و ئەو کۆمەڵانە لەپێناویدا تێدەکۆشان، زۆربوون، حکومەتەکان ناچاربوون چاودێری خۆیان بخەنە کار بۆ بڵاوکردنەوەی زانستی لەنێوان نێر و مێ و لەنێوان چینەکاندا بەتایبەتی زانستی سەرەتایی وەدەستی کرد بەدامەزراندنی قوتابخانە گشتی و خۆڕاییەکان، ئەمجا کار بەمەشەوە نەوەستا ساڵی ١٨٦٨ز. زانکۆی پاریس دەرگای بۆ وەرگرتنی کچان خستەسەر پشت و بەرهەمی خوێندنی زانستییە جیاجیاکان لەلایەن ئافرەتەوە ڕاپەڕینێکی فراوانی لەو سەردەمەدا بەرپاکرد.

ڕاپەڕینی ئافرەتان لە بەریتانیادا لەناو خانەدانەکاندا بڵاوبۆوە بەریتانییەکان لەو بارەیەوە بوون بەدوو بەشەوە. پارێزگار و نوێخواز، بەڵام گیانی ئەو سەردەمە ئاراستەی بەرە و بڵندی پایەی ئافرەت و پیاو بوو پشتگیری بیری نوێخوازەکانی کرد و ژنە بەریتانییەکان لەهەموو چینەکانەوە ڕێڕەوی وەدەست هێنانی زانستیان گرتەبەر.

# بەندی سێیەم

## بزووتنەوەی نەتەوەیی و دیموکراتی(١٨١٥-١٩١٤ ز)

## بەشی یەکەم

### بەریتانیا و چاکسازیی دەستووری

### ١- پێشەکی:

بەریتانیا مەزن ئەو هەڵگەڕانەوە بە هێزەی نەدی لە ڕژێمی حوکمیدا وەک شۆڕشی فەڕەنسی، چونکە ئەو ڕژێمە گەلێ ئاڵوگۆڕ و دەستکاری بە خۆیەوە دیو هیچ شوێنەوارێکی لە حوکمی ڕەها تیا نەمایەوە تا پێویست بە شۆڕش بکات. ڕژێمی حوکم لە بەریتانیادا وا دادەنرا کەوا ڕژێمێکی دیموکراتی سەربەستە، بە تایبەتی لە چاو میللەتەکانی تری ئەورووپادا کە لە ژێر باری ڕژێمێکدا دەیان ناڵاند کە موتەرنیخ و هاوڕێ کۆنەپەرستەکانی لە پیاوە گەورە سیاسییەکانی ئەورووپایی بەسەریان داسەپاندبوون.

بەڵام ئەگەر ئێمە بە وردی لە ڕژێمی حوکمی بەریتانی ورد ببینەوە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەم دەبینین دوورە لە ڕژێمی دیموکراتی، بەڵکو بە ڕژێمێکی دیموکراتی لە قەڵەم دەدرا لە چاو ڕژێمی دیموکراتی، بەڵکو بەڕژێمی دەوڵەتە زۆردارەکانی دیکەی کیشوەری ئەورووپادا.

ئەگەر سەیری تاقمی فەرمانڕەوا بکەین دەبینین تەنیا نوێنەری بەشێکی کەمن لە کۆمەڵگای بەریتانی. بێگومان ئەنجومەنی (لۆردەکان) نوێنەری چینی ئورستوکراتی بوون و ئەنجوومەنەکەی تر (ئەنجوومەنی گشتی) هەر لە ژێر دەسەڵاتی ئەم چینەدا بوو کە بە هیچ جۆرێک نوێنەری کۆمەڵانی خەڵک نەبوون تەنیا بە ناو نەبێت، ئازادیخوازەکانی بەریتانیاش نەیانتوانی وا لە حکومەت بکەن کەوا چاکسازی بکات. دەوری کۆنەپەرستیش لە بەریتانیا درێژەی کێشا هەر لە ساڵی ١٨١٥ز تا ساڵی ١٨٣٢ز، بەڵام دوای ئەم مێژووە کەمێک بێ هێز بوو.

## ٢- داواکاری بۆ چاکسازی:

شۆڕشی پیشەسازی کە یەکەم جار لە بەریتانیادا سەری هەڵدا کاری کردە سەر کۆمەڵگای بەریتانی، چونکە دەرفەتی لەبەردەم چینی بورجوازی رەخساند کە لە رووی ئابوورییەوە بەهێز بێت. لەبزووتنەوەی ئازادیخوازان و نووسەران و رووناکبیران و هەوڵی چاکەخوازانەوە هۆکارێک بوو بۆئەوەی رەخنە لە حکومەت بگرن و داوای چاکسازی سیستەمی هەڵبژاردنی لێبکەن، بۆئەوەی حکومەتێکی دیموکراتی نزیکی بخەنەوە. وە بۆ ئەوەی بزانین تا چ رادیخوازان لە رژێمی حوکم ناڕازی بوون، دەبێت چاوێک بە یاسای پەرلەمانی بەریتانی بخشێنین لەسەرەتای سەدەمی نۆزدەمەوە.

### یاسای پەرلەمانی لە بەریتانیا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە

ژمارەی ئەندامانی پەرلەمانی بەریتانیا (٦٥٨) ئەندام بوو (١٨٦) ئەندام نوێنەری ناوچە لادێ نشینەکان بوون و (٤٦٧) ئەندام نوێنەری شارەکان بوون و (٥) ئەندامیش نوێنەری زانکۆ گەورەکانی بەریتانیا بوون، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە جیاوازی زۆرە لە نێوان نوێنەرانی شارەکان و لادێ نشینەکان دا هەیە، ئەمە جگە لەوەی کە نوێنەری شارەکان لە نێو هەموو دانیشتووانی شارەکان هەڵنەدەبژێردران بەڵکو مافی هەڵبژاردن تەنیا بەند بوو بە چینێکی کەمەوە کە سامانیان هەبوو. ژمارەی دانیشتووانی دوورگەکانی بەریتانی لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەمەوە خۆی لە ٢٠ ملیۆن کەس دەدا، کەچی تەنیا یەک ملیۆن مافی هەڵبژاردن و نوێنەرایەتی هەبوو لە پەرلەماندا و ئەوانی دیکەش بە تەواوی بێبەش بوون لەو مافەدا، بەڵام شۆڕشی پیشەسازی رێگای بۆ چینێکی دیکەی دەوڵەمەند و چالاک خۆشکرد کە ئەویش چینی بورجوازییە بۆ ئەوەی داوای چاکسازی و بەدیهێنانی مافەکانی خۆی بکات لە پێش سەدەی نۆزدەمدا، ئەگەر جەنگەکانی شۆڕشی فەرەنسی و ناپلیۆن نەبوونایە کە بەریتانیای مەزنی خەریک کرد و ئاراستەی میللەتی وەرگێڕا لە بایەخدان بە کاروباری سیاسەتی ناوەوە بۆ رووبەڕوو بوونەوەی مەترسی دەرەوە، کاتێکیش حکومەتی بەریتانی بۆی کرا کە بەسەر دوژمنەکەیدا زاڵ بێت، پارتی

(تۆری) ئەو کاتە لە حوکمدا بوو دەسەلاتی بەریتانیا گەلێ زیادی کرد، بۆیە زۆر کەس، بەتایبەتی لە پارێزگاران وایان دادەنا کە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ بەهێزی ڕژێمی حوکم. پارێزگاران (المحافظين) لەسەرەتاوە هەموو ڕێگەیەکیان گرت بۆ ئەوەی لە دەستی ئەوانە بدەن کە داوای چاکسازی دەکەن، بەلام هەوڵ و کۆششی ئازادیخوازان، پارێزگارانیان ناچارکرد بۆ ئەوەی وەلامی داواکانیان بدەنەوە و هەندێ یاسای چاکسازی جێبەجێ بکەن کە بووە هۆی گۆڕینی ڕژێمی حوکم. پەیدابوونی (جۆرج گەننگ) (George Ganning) لە مەیدانی سیاسەتدا کارێکی زۆری کرد بۆ ئەوەی پارتی پارێزگاران سیاسەتێکی کەمتر کۆنەپەرست و کەنارگرتوو (محافظ) لە جاران بگرێتە بەر. ئەم وەزیرە سیاسەتێکی ئازادیخوازانەی لەگەڵ دەوڵەتە ئەوروپاییەکاندا گرتەبەر لە پەیمانی پێنج قۆڵی کشایەوە، چونکە باوەڕی و ابوو کە موتەرنیخ و هاوڕێکانی بۆیە دەستیان وەردابووە کاروباری ناوەخۆی ئیسپانیا تا شۆڕشە ئازادیخوازەکەی لەناوبەرن. هەروەها لە کەمکردنەوەی باجی گومرگی لەسەر گەنم ساڵی ١٨٢٣ز سەرکەوت بەو جۆرە ڕێگای ئاسان کرد بۆ هێنانی گەنم لە دەرەوە بە زۆری. ئەمە جگە لە هەوڵ و تەقەلاتی (سێر ڕۆبرت پیل) (Robert peel) سەرەک وەزیرانی تازە کە لە ساڵی ١٨٢٨ز هەوڵی دا بۆ لابردنی هەندێ یاسا کە ڕێگای لە کاسۆلیکەکان و ئەوانی تر گرتبوو کە بە هەموو مافە مەدەنیەکانیان شادبین. بۆ ئەمانەش هەموو مافە مەدەنییەکان پێ بەخشرا، وەک گشت براکانیان لە لایەنگرانی کڵێسەی ئینگلیزی.

## ٣- چاکسازییەکانی پەرلەمان:

ئەو بارودۆخە کۆمەلایەتی و ئابوورییە نوێیە، حکوومەتی ناچار کرد کە ملکەچی داواکارییەکانی گەل بێت بۆ چاککردنی یاسای هەڵبژاردن لە ساڵی ١٨٣١ز حکومەتێکی لە پارتی ئازادیخوازان دروست بوو بە سەرۆکایەتی (لۆرد گرای) (Lord Gray) کە گەلالەنامەی چاکسازیی ئامادە کرد و بووە هۆی قەیرانیک لە نێو حکومەتدا. کاتێکیش پادشا هەڕەشەی لە ئەنجوومەنی لۆردەکان کرد بۆ ئەوەی ژمارەیەکی تەواو لە لۆردەکان بخاتە ئەنجوومەنەکەیان بۆ پەسند کردنی گەلالەنامەکە، بەگەلالەنامەی چاکسازی ساڵی ١٨٣٢ز ناسرا (The Reform Bill١٨٣٢)

گەلاڵەنامەی چاکسازی ساڵی ١٨٣٢ز دادەنرێت بە گرنگترین ئەو گەلاڵەنامەی کە دانران بۆ گۆڕینی ڕژێمی پەرلەمانی کە سێ خاڵی سەرەکی تێدا دەبینرێت:

**یەکەم:** دووبارە دابەشکردنەوەی کورسی پەرلەمانی لەسەر شارەکان، ئەویش بەوەرگرتنی ١٤٣ کورسی لە شارە بچووکەکان و دابەشکردنەوەیان بەسەر شارە گەورەکاندا.

**دووەم:** مافی هەڵبژاردن لەلادێکان بدرێتە هەر کەسێک کە موڵکێکی هەبێ و داهاتی ساڵانەی لە دە (جونەیە) کەمتر نەبێت، بەڵام لە شارەکان مافی هەڵبژاردن درایە هەر کەسێک کە خانوویەکی هەبێ یاخود خانوویەکی بەکرێ گرتبێت ساڵی بە دە جونەیە.

**سێیەم:** چاککردنی ڕێگای دەنگدان کە پێویستە هەڵبژاردن تەنیا دوو ڕۆژ بخایێنێت کە جاران پانزە ڕۆژی دەخایاند.

لە ڕاستیدا ئەم گەلاڵەنامەیە تەنیا بەرژەوەندی چینی بورجوازی هێنانە دی کە وای لێهات قەوارەیەکی هەبێت کە پێشتر بە خۆیەوەی نەدیبوو، فراوانکردنی مافی هەڵبژاردن وای لێهات کە ژمارەی هەڵبژێراو دوو ئەوەندە بێت. (پارتی ویگ) (whig) هەوڵی جێبەجێکردنی ئەم گەلاڵەنامەی چاکسازییەی لەپەرلەماندا، بۆیە یەکسەر کە هاتە سەر حوکم لە دوای هەڵبژاردن دەرکەوت کە زۆربەی نوێنەرەکان لە ئازادیخوازان بوون. چینی بورجوازی یارمەتی ئەم پارتەی دەدا کە وای لێهات بە (پارتی ئازادیخوازان) ناو ببرێت لە جیاتی پارتی (ویگ)، بەڵام پارتی ( تۆری) ناوی نرا بەپارتی ( پارێزگاران).

## بزوتنەوەی چارتیست:

گەلاڵەنامەی چاکسازی ساڵی ١٨٣٢ز بەرژەوەندی چینی بۆرژوازی هێنایەدی، بەڵام بەرژەوەندی کرێکاران هەر قووت درا، چونکە ژیانیان هەر بە خراپی مایەوە، بۆیە لە نێوان ساڵانی ١٨٣٨ز و ١٨٤٨ز لە نێو کرێکاراندا بزووتنەوەیەکی چاکسازیی پەیدابوو ناونرا بە بزووتنەوەی چارتیست (chartist mocemente) ئامانجی ئەوە بوو کە پەرلەمان گەلاڵەنامەی تر دەربکات مافە سیاسییەکانی کرێکاران دابین بکات. کورتەی داواکارییەکانی ئەم بزووتنەوەیە ئەمانەن:

١- دەنگدانی گشتی بۆ نێرینە.

٢- کۆبوونەوەی پەرلەمان ساڵانە بێت.

٣- دابەشکردنی وڵات بۆ چەند ناوچەیەکی هەڵبژاردنی و یەکسان.

٤- دەنگدان نهێنی بێت.

٥- نەهێشتنی مەرجەکانی موڵکدارێتی بۆ ئەندامانی پەرلەمان.

٦- مووچە بە ئەندامانی پەرلەمان بدرێت.

کرێکاران بۆ ئەم بزووتنەوەیە بەگوڕوتین بوون و بڕیاریان دا کە لە ساڵی ١٨٣٩ز کۆبوونەوەیەک ساز بکەن کۆنگرەیەکی نیشتمانی و سکاڵانامەیەک پێشکەش بە پەرلەمان بکەن تیایدا داوا سەرەکییەکانیان ئاشکرا بکەن، بەڵام پەرلەمان ئەو سکاڵانامانەی ڕەتکردەوە، ئنجا سکاڵانامەیەکیان پێشکەش کرد کە پێنج ملیۆن کرێکار ئیمزای کردبوو، دوایی بڕیاریان دا کە بەخۆپیشاندان بەرەو پەرلەمان بکەن تاوایان لێ بکەن قایل ببن. کاتێ دەنگ و باس گەیشتە حکوومەت لە ئەنجامەکەی ترسا دەسەڵاتی دایە (دۆق ولنگتۆن) پاڵەوانی (واترلۆ) سەرۆکایەتی سوپا بکات بۆ ئەوەی بڵاوە بە جەماوەری کرێکاران بکات. دۆق بەم کارە هەڵسا و جەماوەری کرێکارانی بەهێز بڵاوە پێ کرد بەم جۆرە بزووتنەوەکە سەرنەکەوت. بەشێک لەکرێکاران بۆ چاککردنی باری ژیانیان چوونە نێو جڤاتی کرێکارانەوە.

دوای چارەکە سەدەیەک لەم بزووتنەوەیە هەر دووپارتی ئازادیخوازان و پارێزگاران پێشبڕکێیان لە فراوانکردنی مافی هەڵبژاردن بۆ گەل دەکرد، ئەوەی کە سەیرە ئەوەیە پارێزگاران خۆیان لە سەردەمی (دزرائیلی گەڵاڵەنامەی دووەمی چاکسازییان ئامادەکرد، کە ئەویش گەڵاڵەنامەی ساڵی ١٨٦٧ز بوو بۆ فراوانکردنی مافی هەڵبژاردن و زیاد کردنی ژمارەی هەڵبژێراوان.

پەرلەمان قایل بوو بەو گەڵاڵەنامەیە و کرێکارانی جڤاتەکان مافی هەڵبژاردنیان دەستگیربوو. هەندێ لەو کۆت و پێوەندانەی کە گەڵاڵەنامەی ساڵی ١٨٣٢ز دابینابوو هەڵیگرت دوایی چاکسازیی پەرلەمانی تر لە سەردەمی وەزارەتی ئازادیخوازان بە سەرۆکایەتی (گلادستۆن) هاتەدی و ئەو مەرجانەی کە پابەندبوون بە داراییەوە

لەسەر ئەو کەسەی کە مافی دەنگدانی هەیە لابرا، بۆیە ژمارەیان زیادی کرد، گرنگترین گەڵاڵەنامە چاکسازییەکانی تر هەر دوو گەڵاڵەنامەی ساڵانی ١٨٨٤ز و ساڵی ١٨٨٥ز بوو کە کرێکاران بەو پێیە مافێکی فراوانیان دەستکەوت لە نوێنەرایەتی پەرلەمانی، لەوەوە دەبینین هەر دوو پارتی ئازادیخوازان و پارێزگاران هەردووکیان هەوڵی چاککردنیان دا تاوای لێهات ڕژێمی حوکم لە بەریتانیادا دا نزیکتر بوو لە دیموکراتییەت لە پێشتر، ساڵی ١٩١٨ز مافی دەنگدان درا بە ئافرەتان کە تەمەنیان گەیشتە سی ساڵ، ئەم گەڵاڵەنامەیە ساڵی ١٩٢٨ز گۆڕاو تاوای لێهات مافی هەڵبژاردن بۆ ژن و پیاو وەک یەک بێت، واتا ئەوەی گەیشتە تەمەنی ٢١ ساڵان مافی هەڵبژاردنی دەبێت.

## ٤- چاکسازییە کۆمەڵایەتییەکان:

### أ- چاککردنی باری ژیانی کرێکاران:

لەمەوپێش باسمان کرد کەیەکێ لە ئەنجامە ڕاستەوخۆکانی شۆڕشی پیشەسازی کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆربوو لە دانیشتووانی لادێکانەوە بۆ شارە پیشەسازییەکان، کە بووە هۆی جەنجاڵ بوونی دانیشتووان کە زۆریان ناچاربوون لەو شوێنانەدا بژین کە مەرجی تەندروستی تیانەبوو.

هەروەها زۆری ژمارەی کرێکاران وایکرد کرێ کەم ببێتەوە و کاتژمێری ئیشکردن زۆر بێت، وای لێهات ئاستی بژێوی چینی کرێکاران نزم ببێت و باری تەندروستییان خراپ بێت. تاوای لێهات حکومەت ناچار بکات لەمەسەلەکە نزیک ببێتەوە و هەوڵ بدات بۆ چاککردنی باری ژیانی ئەم چینە. لایەنی تەندروستیش دیارترین ئەو لایەنانە بوو کە حکومەتی بەریتانی بایەخی پێدا، بۆیە چاودێری ئەو خانووانەی دەکرد کە مەرجەکانی تەندروستی تێدا نییە.

مەرجیشی خستبووە سەر خاوەنی کارگەکان کەلە کارگەکانیاندا هۆیەکانی فێنک کردنەوەو گەرم کردنەوە دابین بکەن، هەروەها دەبوو فراوانی ئەو کارگانە لەگەڵ ژمارەی کرێکارەکان کە ئیشی تێدا دەکەن لەگەڵ یەکدا بگونجێن.

ئەمە جگە لەوەی لەساڵی ١٨٤٨ز یاسایەکی دیکەیان دەرکرد تیایدا کاتژمێری ئیشکردنیان لەکارگەکانی چنین دانا کە ڕۆژانە لە دە کاتژمێر تێ نەپەڕێت. وە لە ساڵی ١٨٧٤ز ڕێگای خاوەن کارگەکانیان نەدا کە منداڵی خوار ( دە ساڵان) لە کارگەو کانەکاندا ئیشیان پێ بکرێت. ئنجا حکوومەت ئاوڕی لە کرێی کرێکاران دایەوە، لەساڵی ١٩٠٩ز یاسایەکی دەرکرد بۆ دانانی لیژنەی تایبەتی لە خاوەن کارگەکان و کرێکاران بۆ دیاریکردنی ڕادەی کەمترین کرێ بۆ پیشە قورس و گرانەکان، دوایی یاسایەکی دی بەدوادا هات کە ڕادەی کەمترین کرێی بۆ کرێکارانی کانەکان دانا کە کرێی ڕۆژانەی هەر کرێکارێک لە پێنج شلن (چارەکە دینارێک) کەمتر نەبێت. (کە نزیکەی ١٤٠ دینار) دەکات.

## ب- فێرکردن:

لایەنی فێرکردن لەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتییە گرنگانە بوو کە حکوومەت بە گرنگییەوە لەم سەردەمەدا ئاوڕی لێدایەوە، چونکە زیاتر لە نیوەی منداڵانی میللەت بێ بەشبوون لەو مافە سروشتییە کە پێویستە هەبێت لە میللەتێکدا کە حکوومەتەکەی لەسەر بنچینەیەکی دیموکراتی بنیات نرابێت. بۆیە کەوتە خۆی بۆ تەرخانکردنی پارەیەکی زۆر بۆ فراوانکردنی فێرگە جۆر بە جۆرەکانی فێرکردن و یارمەتیدانی دام و دەزگاکانی فێرکردنی ئەهلیش، بۆ ئەوەی بتوانێت خوێندن لە هەموو وڵاتدا بڵاوبکاتەوە.

## ج- دەستەبەری کۆمەڵایەتی: (الضمان الاجتماعی):

دەتوانین بڵێین ئەو گەڵاڵەنامەیەی کە پێشکەش بە پەرلەمان کرا ساڵی ١٩١١ز کە تایبەت بوو بە دەستەبەری کرێکاران دژی بێکاری و نەخۆشی، کە بە گەڵاڵەنامەی (بیمەی نەتەوەیی) (التامین القومی) ناسرا، لە هەنگاوە بنچینەکانی چاکسازی دادەنرێت لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، دەستەبەرکرد. لەسەر کرێکاران پێویست بوو هەفتانە پارەیەکی کەم بدەن بە سنووقی دەستەبەری کۆمەڵایەتی و حکومەت و خاوەن کارگەکانیش بۆ ئەم مەبەستە پارەیان دەخستە سەر، ئەم گەڵاڵەنامەیە ئەو مەرجەی تێدا بوو کە پێویستە موچەیەکی دیاری کراو بدرێت

بەو کرێکارانەی بێکارن تا کارێک بۆ خۆیان دەدەۆزنەوە. هەروەها بۆ نەخۆش تا دەگەڕێتەوە سەر کارەکەی، هەروەها ئەو دەقەی تێدابوو کە پێویستە لە ڕووداوی ناکاو کە لە کاتی ئیش کردندا تووشیان دەبێت و بەپێی ئەو زیانەی کە لێیان کەوتووە بەسەر بکرێتەوە. بێگومان ئەم گەلاڵەنامەیە سوودێکی زۆری هەبوو بۆ چینی کرێکاران.

## ٥- ڕژێمی حکومەتی بەریتانی:

ڕژێمی بەریتانی بەوە دەناسرێت کە بەردەوام پەرەی دەسەند، چونکە لە ئەنجامی چەرخێکی دوور و درێژ لە دایک بووە کە بنەماکانی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەند. بۆ وێنە پەرلەمان هەر لە سەدەی سێزدەمەوە هەبووە، بەلام پەرلەمانێکی دیاری کراوبوو نەک هەڵبژێردراو، پادشاش دیکتاتۆر بوو کە دەسەلاتێکی دەستووری فراوانی هەبوو، دوایی وردە وردە سنووری بۆ دانرا هەر لەو کاتەی کە جۆنی پادشا ئیمزای لەسەر ماگناکارتا (Magna carta) ساڵی (١٢١٥)ز هەتا دەرچوونی گەلاڵەنامەی مافەکان ساڵی ١٦٨٩ز، ئەو کاتە دەسەلات بە تەواوی لە پادشاوە گوێزرایەوە بۆ پەرلەمان.

حکوومەتی بەریتانی بە چەندین رۆڵی جیا جیا تێپەڕی تا گەیشتە ئەو شێوەیەی کە ئێستا تێیدایە و ئێستاش لە پەرەسەندنی بەردەوام دایە.

### دەستووری بەریتانی:

ئەگەر لە دەستووری بەریتانیا ورد بینەوە دەبینین هەمووی لە یەک بەڵگەنامە تۆمار نەکراوە، بەڵکو لە چەند بەڵگەنامەیەک و بڕوانامەیەک کە لە سەردەمی جیاجیادا دەرچووە هەندێکیان لە شێوەی گەلاڵەنامە و هەندێکی کەشیان لە یاسای بنەڕەتی یان ئاساییدایە، هەڵەیە ئەگەر وا دابنێین دەستووری بەریتانی هەمووی تۆمار کراوە، چونکە هەندێکیان نووسراوەنەتەوە وەک سەردەمی مەزن ماگناکارتا (١٢١٥ز)و داواکار مافەکان لەساڵی (١٦٢٨)ز گەلاڵەنامەی مافەکان ١٦٨٩ز گەلاڵەنامەی چاکسازیی ساڵی ١٨٣٢ز. ئەمانە بێگومان چەند بەشێکی زۆر گرنگن لە دەستووری بەریتانی. یاسای دەستووری دیکەیش، نەنووسراونەتەوە وەکو ئەوانەی

کە تایبەتن بە مافی پادشا یان وەزارەت یان پەرلەمان یان پارتە سیاسییەکان کە ئەوانە نەنووسراون و بەشێکی گرنگی دەستووری بەریتانی پێکدەهێنن. لەمەوە دەردەکەوێت کە دەستووری بەریتانی لەم یاسایانە و یاساکانی دیکە بە درێژایی ڕۆژگار پەیدابوو، جا بە دانان بێت یان بەپێی نەریت، بەو پێیە دەستووری بەریتانی پێی دەڵێن (دەستوورێکی نەرم)، چونکە بۆی زیاد دەکرێت و بەیاسا هەموار دەکرێت واتە بە قاییل بوونی زۆرینە لە پەرلەماندا. هیچ جیاوازییەکی تێدا نییە لە نێوان ئەوەی کە یاسایەکی سەرەکییە وەیان ئاساییە لە ڕووی دانانەوە.

**حکومەت:**

**حکوومەتی بەریتانی پێکدێت لە: پادشا- پەرلەمان- وەزارەت**

پارتە سیاسییەکان لە بەریتانیا بە سیستەمی دەوڵەتەوە بەستراونەتەوە دەوڵەت کە ئەمە بنچینەیەکە لە ڕژێمی حوکمی دیموکراتیدا کە دەبێت هەرببێ ئەگەر لەسەر بنچینەی هەلبژاردنی ئازاد بنیات نرابێت، پارتەکانی بەریتانیا لە ئەنجامی پەرەسەندنی ڕژێمی حوکم لە ژێر دەسەڵاتی پادشاوە بۆ دەسەڵاتی پەرلەمانەوە نەشونمایان کردووە. ئەمیش لە ئەنجامی پەیدابوونی پارتی (ویگ) ەوە کە بەگژ پادشا (شارل)ی یەکەمدا چووە، لایەنگری دەسەڵاتی پەرلەمان بوو. بەڵام پارتی (تۆری) لەگەڵ پادشا بوو، لایەنگری دەسەڵاتە ڕەهاکەی بوو. ئەم ناکۆکییەش بە سەرکەوتنی لایەنگرانی پەرلەمان کۆتایی هات لە ئەنجامی شۆڕشی ساڵی ١٦٨٨ز کە ناونرا بە شۆڕشە مەزنەکە (The Glorious Revolution) ئەویش بە هاتنی (ولیەم) و (ماری) لە زەوییە نزمەکان و مۆرکردنی گەڵاڵەنامەی مافەکان ساڵی ١٦٨٩ز کە بە تەواوی بڕیاری لەسەر دەسەڵاتی پەرلەمان دا هەردوو پارتی ویگ و تۆری بە نۆرە تا سەدەی نۆزدەم حوکمیان دەکرد دوایی ناویان گۆڕا دوای دەرکردنی گەڵاڵەنامەی چاکسازی ساڵی ١٨٣٢ز کە پارتی ویگ بوو بە پارتی ئازادیخوازان و پارتی تۆری بوو پارتی پارێزگاران. ئەم دوو پارتە بەردەوام بوون لە فەرمانڕەوایەتی هەرچەندە پارتێکی سێیەم بەناوی کرێکارانەوە ساڵی ١٩٠٠ز پەیدابوو کە ئەم پارتە بۆی نەکرا کاروباری حوکم وەربگرێت تا ساڵی ١٩٢٣ز.

# بەشی دووەم

## کێشەی ئێرلەندە

**پێناسەکەی:**

کێشەی ئێرلەندە (ویستی خەڵکی ئێرلەندەیە لە جیابوونەوە لە بەریتانیا و بەرهەڵستیکردنی بەریتانیا بەو پێیەی کە ئێرلەندە بەشێکە لە دەوڵەتەکەی).

**هۆیەکانی پەیدابوونی کێشەی ئێرلەندە ئەمانەن:**

**١- هۆی ئایینی:** زۆربەی دانیشتووانی ئێرلەندە لە کاسۆلیک پێکدێن و بە دوای کڵێسەی کاسۆلێک لە ڕۆمادا دەکەون کە پاپا سەرۆکایەتی دەکات، بەڵام زۆربەی بەریتانییەکان لە پرۆتستانتن (لایەنگرانی مارتن لوسەر) کە بە دوای کڵێسەی ئینگلیزی دەکەون (کڵێسەی ئەنگلیکانی).

**٢- هۆی ئابووری:** بەریتانیا وڵاتێکی پیشەسازییەو شۆڕشی پیشەسازی و ئەنجامەکانی زۆر کاری لێکرد، بەڵام ئێرلەندە وڵاتێکی کشتوکاڵییە و زۆرکەم کاریگەری شۆڕشی پیشەسازی لەسەر هەبووە.

**٣- هۆی کۆمەڵایەتی:** داب و نەریت و زمانی دانیشتووانی ئێرلەندە زۆر جیاوازە لە ڕەوشت و نەریت و زمانی ئینگلیزی.

**٤- هۆی سیاسی:** ئێرلەندە لە کاروباری ناوەوە سەربەخۆ بوو پارێزگاری لە پەرلەمانە تایبەتییەکەی خۆی لە (دبلن) کرد بوو تا کۆتایی سەدەی هەژدەم هەرچەندە کە ئەو پەرلەمانە لەژێر ڕکێفی پەرلەمانی وێستمنستەردا بوو لە لەندەن، بەڵام مافی یاسادانانی هەبوو لە کاروباری تایبەتی ئێرلەندەدا.

بەریتانیاش ئەوپەرلەمانەی ساڵی ١٨٠١ز لابرد بەپێی یاسای یەکێتی، نوێنەرە ئێرلەندەییەکانیشی بە پاشکۆی ئەنجوومەنی گشتی بەریتانی لە لەندەن گرێدا.

**٥- گیروگرفتی زەوی وزار:** ئەم هۆیەش کاری ڕاستەوخۆ بوو بۆ ئاڵۆزکردنی گیروگرفتەکە، چونکە لە ئێرلەندەدا ڕووبەرێکی بەرفراوان هەبوو لە زەوی و زار کە کەوتە ژێر دەستی گەورە موڵکدارە بەریتانییەکان بە پشتاوپشت یان بەهۆی کڕین هەر لە سەردەمی کرۆمویل، زۆربەی ئەو موڵکدارانەش لە ئێرلەندەدا دانەدەنیشتن،

بەڵکو لە ئینگلتەرا دادەنیشتن و پێیان دەووتن **موڵکدارە نادیارەیان** (Absente land Lord) کە لە ئێرلەندەدا بەهۆی جێگرەکانیان (وەکیلەکانیان) کاروباری ئەو زەوی وزارانەیان بەسەر دەکردەوە و لەگەڵ جوتیارە ئێرلەندییەکاندا خراپ رەفتاریان دەکرد کە بووە هۆی بێزاری ئێرلەندییەکان و ئارەزوو پەیداکردنیان لە رزگاربوونی ولاتەکەیان لەژێر دەسەلاتی بەریتانیا.

## دەرکەوتنی کێشەکە و پەرەسەندنی:

کە بزووتنەوەی چاکسازی ئایینی لە بەریتانیادا جێگیر بوو سەرکەوتنی رێبازی پرۆتستانتی ئەو رێبازە بوو بە رێبازێکی رەسمی بۆ دەوڵەت، بەریتانیاش سیاسەتی سەپاندنی ئەم رێبازەی بەسەر ئێرلەندییەکاندا گرتەبەر.
کڵێسەیەکی پرۆتستانتی لە ئێرلەندەدا دامەزراند و پارەیەکی زۆری تیادا خەرج کرد تا ببێتە رێگایەک بۆ بلاوکردنەوەی ئەم رێبازە بەسەر ئێرلەندییە کاسۆلیکەکاندا.

## بزووتنەوەی نەتەوایەتی ئێرلەندا:

ئەم سیاسەتە بووە هۆی بێزاری تەواوی ئێرلەندییەکان و ئەنجامەکەی بە پێچەوانەی ئەوەوە شکایەوە کە جیاوازی نەهێڵێت لە نێوان بەریتانیا و ئێرلەندەدا، بۆ ئەوەی ئێرلەندییەکانیش واز لە رێبازی کاسۆلیکی بهێنن و تێکەلاوی بەریتانیابن لە ئایین و لە سیاسەت، زۆر لەم سیاسەتە بێزار بوون و زیاتر پابەند بوون بە رێباری تایبەتی خۆیانەوە و بە بیری پاراستنی سەربەخۆیی ناوەخۆیانەوە، ئەم بیرە پەرەی سەندو بووە هۆی دەرکەوتنی بزتنەوەی نەتەوایەتی ئێرلەندەی، ئیرلەندییەکانیش کۆمەڵەیەکیان پێکهێنا بە ناوی (**یەکێتی ئێرلەندییەکان**) کە زۆر لە ژێر کاریگەری بیرو باوەرەکانی شۆرشی فەرەنسادا بوو و توانی شۆرش لە ئێرلەندەدا بەرپابکات، بەلام بەریتانیا ئەم بزووتنەوەیەی بە زەبری هێز سەرکوتکرد. ئەم کۆمەڵەیەی لەناوبردو کەوتە نەهێشتنی پەرلەمانە تایبەتییەکەی ئێرلەندەو یاسای یەکێتی ساڵی ١٨٠١ز دەرکرد، ئێرلەندە بەو پێیە دەبوو نوێنەری بۆ پەرلەمانی بەریتانی لە وێستمنستەر بنێرێت، بەلام سیاسەتی بەریتانیا دەربارەی ئێرلەندە وای کرد کە زیاتر هەستی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی بورووژێنێت بە مەبەستی جیابوونەوەی تەواو لە بەریتانیا.

## دانیال ئوکۆنێل:

بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە ئێرلەندەدا گەلێ سەرکردەی بەخۆیەوە دی کە خەباتیان لە پێناوی جیابوونەوە لە بەریتانیادا کرد کە لە پێشەوەی ئەم سەرکردانە دانیال ئۆکۆنێل (Danniel O connel) بوو ١٧٧٥ز- ١٨٤٧ز کە کۆمەڵێکی لە کاسۆلیکە ئێرلەندییەکان پێک هێنا بۆئەوەی وا لە پەرلەمانی بەریتانی بکەن رەزامەند بێت بە لابردنی ئەو هەڵانەی کە لە رەفتارکردنی) دژ بە ئێرلەندە دا ڕوویداوە، توانی کە (**یەکییێتی کاسۆلیکی**) پێکەوەبنێو و الە پەرلەمانی بەریتانی بکەن بۆ دەرکردنی یاسای ڕزگاربوونی کاسۆلیک ساڵی ١٨٢٩ز، کە بەپێی ئەوە هەندێ کۆتی لەسەر کاسۆلیکەکان لابرد و وایان لێهات کە نوێنەریان لە ئەنجومەنی لۆردەکان و گشتیدا هەبێ و وای لێهات نازناوی لەلای ئیرلەندییەکان بە (ڕزگار کەر) دەرچوو. ئۆکۆنێل داوای لە پەرلەمان کرد کەوا یاسای یەکیتی لاببرێت و پەرلەمانێکی تایبەتی بۆ ئیرلەندە لە (دبلن) دابمەزرێت، بەڵام هەوڵ و تەقەڵای سەری نەگرت، چونکە وای لێهات حکومەتی بەریتانیا مەترسی لە داواکارییەکانی دەکرد، یەکێتی کاسۆلیکی هەڵوەشاندەوە و ئۆکۆنێلی بەندکرد. کاتێکیش کە شۆڕش لە ئیرلەندەدا بەرپابوو ساڵی ١٨٤٨ز حکوومەتی بەریتانی بە زەبری هێز لەناوی برد و سزای توندی بەرهەڵستکارانیشی دا.

بارودۆخی ئێرلەندە و شۆڕشە بەردەوامەکانی وای کرد کە (گلادستۆن) سەرکردەی لیبرالیەکان (ئازادیخوازان) سیاسەتێکی تازە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئێرلەندە دابنێ. کە لە ساڵی ١٨٦٨ز هاتە سەر حوکم لەبەریتانیا دەستی کرد بەجێبەجێ کردنی سیاسەتەکەی کەلەلایەکەوە بەرهەڵستی لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی و پەشێوی لە ئێرلەندەدا کرد، لەلایەکی دیکەوە کۆششی کرد کە نیشتمان پەروەرەکانی ئێرلەندەیی قایل بکات بەلابردنی هۆیەکانی ناڕەزایی و تووڕەیی لە سیاسەتی حکومەتی بەریتانی لە ئێرلەندەداو پشتگیری بۆ کڵێسەی ئەنگلیکانی لە ئێرلەندەدا وەستاند و وای کرد کە لە هەموو مافێکدا لەگەڵ کڵێسەی کاسۆلیکی یەکسان بێت، هەروەها فەرمانی دا بەیارمەتی دانی جووتیاری ئێرلەندی و چاککردنی باری ژیانی نالەباریان .

## پارنڵ:

ئەو کردارانە نەبوونە هۆی قایلکردنی نیشتمان پەروەرە ئێرلەندییەکان، چونکە سەرکردەیەکی دیکەکان بۆ پەیدابوو کەناوی پارنڵ (charless stewart parnell) بوو (١٨٤٦-١٨٩١)ز کە داوای لە حکەمەتی بەریتانی دەکرد ئێرلەندە ئوتۆنۆمی (هۆل ڕۆل)ی بدرێتێ (Home Rule). پارنڵ و هاوڕێکانی بەردەوام لە پەرلەماندا داوای ئۆتۆنۆمیان دەکردو پارێزگاران لە حوکمدا بەرهەڵستی ئەم بیرەیان بەتوندی دەکرد.

## گەلاڵەنامەی ئۆتۆنۆمی:

کە ئازادیخوازان بە سەرۆکایەتی (گلادستۆن) ساڵی ١٨٨١ز هاتنە سەر حوکم لەبەریتانیا ویستیان گەلێ چاکسازیی بۆ ژیانی جوتیاری ئێرلەندی دابین بکەن، بەڵام نیشتمان پەروەرەکانی ئێرلەندەو گەلاڵەنامەیەکی بەم بۆنەیەوە پێشکەش بە پەرلەمان کردو پارێزگاران بەرهەڵستیان کرد، ئەم گەلاڵەنامەیە بەرپەرچ درایەوەو گلادستۆن ناچاربوو کە دەست لەکار بکێشێتەوە، بۆ جاری سێیەم ئازادیخوازەکان هاتنەوە سەر حوکم ساڵی١٨٩٣ز دیسان گەلاڵەنامەی (هۆم ڕول) یان خستەوە بەرچاوی پەرلەمان و ئەنجوومەنی گشتی بڕیاری لەسەردا، بەڵام ئەنجوومەنی لۆردەکان ڕەتی کردەوە، گلادستۆن ناچاربوو دەست لە کاربکێشێتەوە و لەمەیدانی سیاسەتدا گۆشەگیر بێت کە پارێزگارانیش هاتنە سەرحوکم بڕیاری (هۆم ڕول) یان بە تەواوی خستە لاوەو ئامانجی نیشتمان پەروەرەکانی ئێرلەندەیان مایە پووچ کرد.

بەرهەڵستی پارێزگاران ئەم کێشەیەی ئێرلەندەی چارە نەکرد، بەڵکو زیاتر ئاڵۆزی کرد و زیاتر بیری نەتەوایەتی وروژاند، چونکە لە ساڵی ١٩٠٥ز دا پارتێکی تازەی دیکە دروست بوو لە گەنجە تێ گەیشتووەکانی ئێرلەندە بە ناوی پارتی (شین فین) (sinn Fein) بەواتا ئێمە خۆمان. (we oure selves)، کە بەرنامەکەی جیابوونەوە بوو لە بەریتانیاداو داوای کۆمارێکی سەربەخۆی یەکگرتووی دەکرد. یەکێک لە سەرکردەکانی ئارسەر گریفت (١٨٧٢ز- ١٩٢٢ز)بوو سەرکردەیەکی ناسراو بوو. ئەم پارتە یارمەتی پارتی ئازادیخوازانی بەریتانی دا. لە پەرلەمانی ساڵی ١٩١٠ز – ١٩١١ز بەهیوای سەرکەوتنی گەلاڵەنامەی (هۆم ڕول) ئەمجارەیان لە ئەنجوومەنی لۆردەکان دا.

وەزارەتــی ئازادیخــوازان ســاڵی ١٩١٢ز گەڵاڵەنامــەی دامەزراندنــی پەرلەمانێکــی سـەربەخۆی لـە (دبلـن) خسـتە ڕوو، بـەڵام لەژێـر ڕکێڤـی پەرلەمانـی وێستمنسـتەر دابێـت لـە کاروبـاری سـەربازی و دارایـی و هەنـدێ شـتی کـە.

ئەنجومەنـی گشـتی قایـل بـوو، بـەڵام ئەنجوونـی لـۆردەکان سـوور بـوو لەسـەر ڕەتکردنـەوەی. وە گەڵاڵەنامەکـە بـۆ جـاری دووەمیـش سـاڵی ١٩١٣ز هێنرایـە کایـەوە، ئەنجومەنـی گشـتی بڕیـاری لەسـەردا، بـەڵام ئەنجوومەنـی لـۆردات هـەر سـوور بـوو لەسـەر ڕەتکردنـەوەی. لەبـەر ئـەوەی لە چاکسـازیی دەسـتووری سـاڵی ١٩١١ز، داهاتووە کـە دەبێـت لـە سـێ خولـی بەردەوامـدا گەڵاڵەنامەکـە بخرێتـە ڕوو تـاوای لـێ بێـت بـە یاسـا بەبـێ قایـل بوونـی ئەنجوومەنـی لـۆردەکان، بۆیـە دەبـوو لەسـەر ئازادیخـوازان ئـەم گەڵاڵـە نامەیـە سـاڵی ١٩١٤ز جارێکـی کـە بخەنـەوە ڕوو، ئەمەیـان کـرد و بـوو بـە یاسـایەک کـە پێویسـتە جێبەجـێ بکرێـت.

## هەڵوێستی ئێرلەندییە پرۆتستانییەکان:

بـەڵام ئێرلەندییـە پرۆتسـتانییەکان لـە ئەلسـتەر [1] (Ulster) ترسـان لـە ئەنجامـی ئـەم گەڵاڵەنامەیـە و ناڕەزاییـان دژی دەربـڕی و لە بەریتانیـا بۆ بەرگری لە لەبەرژەوەندی ئابـووری و ئایینیـان ڕەتیـان کـردەوە لـە بەریتانیـادا جیاببنـەوە و بڕیـاری بەرهەڵسـتی کردنیـان بەتواندیـان، زۆر نەمابـوو کـە شـەڕی ناوخـۆ لـە نێـوان هـەردوولا ڕووبـدات، ئەگـەر جەنگی یەکەمـی جیهانـی سـاڵی ١٩١٤ز ڕووی نەدایـە. حکوومەتـی بەریتانیـا لـە جێبەجـێ کردنیـدا دوای خسـت و وەسـتاندی تـا دوای جەنـگ.

هەنـدێ لـە نیشـتمان پـەروەرە ئیرلەندییـەکان ناڕەزاییـان دەربـڕی لـە دواخسـتنی جێبەجێکردنـی یاسـاکە و وایـان دانـا کـە ئەمـە پاشـگەزبوونەوەیە لەلایـەن حکوومەتـی بەریتانیـاوە، بـەڵام هـەر چاودێـری ئەوەیـان دەکـرد جەنـگ تـەواو بێـت تاجێبەجـێ بکرێـت.

---

(١) ئەلسـتەر: ناوچەیەکە کە لە باکووری ئێرلەندەو دانیشـتوانی لە پرۆتسـتانن کە پایەتەختەکەی (بەلفاسـت)ە.

## کێشەی ئێرلەندە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی:

کاتێک جەنگ کۆتایی هات و هەڵبژاردن لە بەریتانیا و ئیرلەندە ساڵی ١٩١٩ز دەستی پێکرد بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمان، ئەندامانی (پارتی شین فین) لە هەموو ئەو کورسییانەی کە دانرابوون بۆ ئیرەلەندە تیایدا سەرکەوتن و شوێنی ئەو نوێنەرە کۆنانەیان گرتەوە کە داوای هاوکاریان دەکرد لەگەڵ بەریتانیادا.

ئامانجی ئەمانە بۆ بەشداربوون لە هەڵبژاردن چوونە پەرلەمانی لەندەن نەبوو، چونکە باوەڕیان بەهاریکاری کردن نەبوو لەگەڵ بەریتانیادا، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەیانویست بەشدارنەبن و توندو تیژی بەڕوویدا بەکار بهێنن، بۆیە ئەنجومەنێکی کۆماری تایبەتییان لە (دبلن) دامەزراند و ناویان نا (ئەنجومەنی ئێرلەندی) و بانگی کۆماری ئێرلەندەیان ڕاهێشت و ئەنجوومەنەکە (دی ڤالیرا)ی کرد بە سەرەک کۆمار و (گریفپ)بە جێگری کە هەردووکیان وەختی خۆی بەندکراو بوون لە بەریتانیادا. پێویست بوو لەو ئەنجوومەنەدا ناوچەی (ئەلستەر)ی لەگەڵدا بووایە بەڵام خەڵکی (ئەلستەر) نەچوونە پاڵ ئەو ئەنجومەنە بەهۆی هاندانی بەریتانیا و ڕقیان لە ئێرلەندەی کاسۆلیکی دەبۆوە.

## شۆڕشی ئێرلەندە ١٩١٩ز – ١٩٢١ز:

شۆڕش لە ئێرلەندە دەستی پێکردەوە ئەمجارەیان پارتی (شین فین) سەرکردایەتی کرد و لایەنگرانی بانگی دوورکەوتنەوەیان لە دام و دەزگای بەریتانی کرد و داوای دامەزراندنی دام و دەزگای تایبەتییان کرد وەک دامەزراندنی دەستەی دادوەری بۆ ئەوەی جێگای دادگاکانی بەریتانی بگرێتەوە (میشێل کۆڵنزا) دیارترین ڕێکخەری ئەم شۆڕشەو سەرکردەکانی بوو.

هەرچەندە بەریتانیا ڕێکەیەکی زۆر توندوتیژی گرت بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش، بەڵام دوو ساڵی هەر خایاند (١٩١٩ز-١٩٢١ز) کە پەرلەمانی بەریتانی ناچاربوو بۆ پەلەکردنی یاسای (ئۆتۆنۆمی) ساڵی ١٩٢٠ز، لابردنی یاسای کۆن کە لە پێش جەنگی جیهانی دەرچوو بوو کە حکومەتی بەریتانی جێبەجێ کردنی ئەو یاسایەی وەستاند بوو.

یاسای تازە ئێرلەندەی کرد بە دوو بەشەوە: یەکەمیان کە (ئەلستەر)ی گرتبۆوە یان بڵێین ئێرلەندەی باکوور، دووەمیان بریتی بوو لە ئێرلەندەی باشوور. پەرلەمانی ئەلستەر لە باکوور هاتەدی، بەڵام ئێرلەندەی باشوور یاسای تازەی ڕەت کردەوە و شۆڕشی شین فینی تێدا بەردەوام بوو. لەساڵی ١٩٢١ز (لوید جۆرج) سەرۆک وەزیرانی بەریتانی داوای لە شین فین کرد کە ئاگربەستێکی کاتی قبوڵ بکەن و دوای ئەو گفتوگۆ دەست پێ بکرێت بۆ هێنانەدی چارەسەرێک کە هەردوولا پێ قایل بن، داواکەی جێبەجێ کرا، نوێنەرانی بەریتانی و ئیرلەندییەکان لە لەندەن کۆبوونەوە و گفتوگۆ لە نێوان هەردوولا دەستی پێکرد لە ئەنجامدا گەیشتنە پرۆژەی ڕێککەوتن نامەیەک لەلایەن (**گریفث و کۆلنز**) **لە ئێرلەندە و** (**لوید جۆرج**) لە حکومەتی بەریتانیاوە واژۆیان کرد، هەرچەندە ئەو ڕێککەوتنامەیە دانی بو کۆماری ئێرلەندە دانەنا بەشێک لە ئۆتۆنۆمی پێ بەخشی زێدەتر لەهەر وڵاتێک لە وڵاتانی دۆمنیۆن لەگەڵ ئەوەشدا نوێنەرانی ئێرلەندە لە ژێر زەبری هەڕەشەی بەریتانیا پێی قایل بوون کە ئەگەر هاتوو ئەوان قایل نەبوون ئەوا شەڕ دەست پێ دەکاتەوە.

## پەیدابوونی دەوڵەتی ئێرلەندەی ئازاد:

لە ئێرلەنددەدا هات و هاوارێکی گەورە دەبارەی رێککەوتنامەکە روویدا، لایەنگرانی شین فین لە ناو خۆیاندا بوون بە دوو بەشەوە لە نێوان لایەنگری کردنی و بەرهەڵستکردنی، کاتێک ئەنجوومەنی ئێرلەندی ئەو رێیکەوتنامەیەی (بەزۆربەیەکی کەم) بڕیاری داو دەوڵەتی (ئێرلەندی ئازاد) هاتەکایەوە، شەڕی ناوخۆ لە نێوان لایەنگرانی پارتی شین فین ڕوویدا. بەڵام (**دی ڤالیرا**) (کە نوێنەری بەرژەوەندی چینی جوتیاری هەژار و رۆشنبیرە ئازادیخوازەکان و زۆربەی خەڵک بوو)، بەرهەڵستیکار بوو، گریڤت و کۆڵنز ( کە نوێنەری بەرژەوەندی چینی بورجوازی بوون کە بەرژەوەندی بازرگانی ئەم چینە لەگەڵ بەریتانیا دابوو) لایەنگربوون.

شەڕی ناوەخۆ چەندین مانگ درێژەی خایاند هەر دوولا زۆریان لێ کەوت بەریتانیاش یارمەتی لایەنگرانی ئەو رێککەوتنامەیەی دەدا بۆ ئەوەی مل بە دوژمنەکانی کەچ بکات.

هەرچەندە کە شەڕی ناوەخۆ وردە وردە توند و تیژییەکەی، بەڵام کۆمارویستەکان سوور بوون لەسەر بەشداری نەکردنی (دەوڵەتی ئازاد) و نوێنەرەکانیان کە بۆ پەرلەمانی (ئێرلەندەی ئازاد) هەڵبژێرا بوون و لەسەرووی هەموویانەوە (دی ڤالیرا) ڕەتیان کردەوە ئامادەی دانیشتنەکان ببن تا سوێندی دڵسۆزی نەخۆن بۆ پاشادی بەریتانی.

لە دواییدا (دی ڤالیرا) بڕیاری دا شێوازی خەباتی بگۆڕێ، لەگەڵ پیاوانی پارتەکەی چوونە ئەنجوومەنی ئێرلەندە و سوێندی دڵسۆزیان خوارد، بەڵام ڕایگەیاند کە ئەوەی تەنیا بۆ ئەوە کردووە تا پەیڕەوی کە بۆنە ئاساییەکان بکات و پاشگەز دەبێتەوە لەو سوێندە کاتێک زۆرینەی لە ئەنجوومەنی بۆ مسۆگەر دەبێت.

کاتێک هەڵبژاردن ساڵی ١٩٢٣ز دەستی پێکرد (دی ڤالیرا) بەزۆرینە لە پەرلەمان دەرچوو دەستی بەجێبەجێ کردنی ئەو بەرنامەیەی کرد کە بەڵێنی بەگەلی ئێرلەندە دابوو بە هەڵوەشاندنەوەی سوێندی دەستووری بۆ پادشای بەریتانی و وەستاندنی ناردنی پارەی ساڵانەی زەوی وزاربۆ حکومەتی بەریتانی (١).

ئەم کردەوانە هات و هاوارێکی زۆری لە بەریتانیا خستەوە، کەوای لە حکومەتی بەریتانیا کرد نارەزاییەکی توند پێشکەش بکات، کاتێک ئێرلەندە سووربوو لەسەر هەڵوێستی خۆی بەریتانیا شەڕێکی ئابووری بەسەردا سەپاند ئەوەبوو زۆری خستە سەر بەرووبوومی ئێرلەندە کە بۆ بەریتانیا دەنێردرێ

بە مەبەستی زیان پێ گەیاندی کشتوکاڵی ئێرلەندەو زۆر لە ئێرلەندە بکرێت تا لەو بڕیارەی کە داویەتی پاشگەز ببێتەوە، حکوومەتی ئێرلەندەش لەلای خۆیەوە باجێکی زۆری خستە سەر کەلە پەلی بەریتانی کە دەنێردرێت بۆ ئێرلەندە، ئەم شەڕە ئابوورییە زیانێکی زۆری لە جوتیار و خاوەن پیشەسازییەکان دا لە هەردوولا.

ئەنجامی هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٣٢ز کە (دی ڤالیرا) زۆرینەیەکی زیاتر لە جاری پێشوو دەرچوو زەبرێکی بەهێزبوو بۆ بەریتانیا و نیشانەیەک بوو کە ئەو سیاسەتەی لە هەڵگیرسانی ئەڕی ئابووری هیچ سوودێکی نەبووە بەرامبەر بە خۆڕاگرتنی گەلی ئێرلەندی و حکومەتەکەی، بۆیە زیاتر ملکەچی گفتوگۆ بوو لەگەڵ حکومەتی ئێرلەندە دا، لە نێوان هەردوو لادا ساڵی ١٩٣٨ز ڕێککەوتنامەیەک ڕوویدا بۆ کۆتایی پێ هێنانی شەڕی ئابووری کە چەند ساڵی خایاند.

---

(١) کاتێک زەوی و زار لە ئێرلەندەدا دەستی بەسەر داگیراو لەگەورە دەرەبەگەکان وەگیرایەوە وابڕیاردرا کە پارەیەکی زۆر بدرێت بە موڵکدارە بەریتانییەکان پەێنی قستی ساڵانە لەو جوتیارانەوە وەربگرێتەوە کە ئەو زەوییانەیان بەسەردا دابەشکراوە ولەبەرهەمی زەویەکانیان بیدەن ئەم پارەدانە ماوەیەکی زۆری خایاند تا (دی ڤالێرا) وەستاندی.

هەروەها ڕێککەوتنامەیەکی تازەیان مۆرکرد بەو پێیە چارەسەری گیروگرفتی ناردنی پارەی ساڵانەی زەوی و زارو پابەندیەکان دارایی کرا کە سوودێکی زۆری بۆ ئێرلەندەی ئازاد تێدابوو، بەم جۆرە دی ڤالیرا هەنگاوی فراوانی نا بەرەو ڕژێمی کۆماری بەبڕینی گەلێ لەو پەیوەندییانەی کە ئێرلەندەی بە حکومەتی بەریتانی و تاجی بەرییەوە بەستبوو سوێندی دڵسۆزی بۆ پادشای بەریتانی نەهێشت، ئێرلەندە چی دی پارەی ساڵانەی زەوی و زاری نەدا، هەروەها پایەی حاکمی گشتی بەریتانی لابرد.

تەنیا ئەو گیروگرفتەی کە ڕووبەڕووی ئێرلەندە مایەوە ناوچەی (ئەلستەر) بوو لە باکوور کە بخرێتە سەر ئێرلەندە. دی ڤالێراش نەیدەویست بۆ ئەو مەبەستە هێز بەکاربهێنێت، بەڵکو هەوڵی دەدا هەستی خەڵکی ئەو ناوچەیە بۆ لای خۆی ڕابکێشێ تا بیخاتە سەر یەکێتی ئێرلەندە، بەڵام خەڵکی ئەو ناوچەیە ئێستاش دژی یەکگرتنەن.

# بەشی سێیەم
## بزووتنەوەی نەتەوایەتی لە ئیتاڵیاو ئەڵمانیاو نەمسادا

## بزووتنەوەکانی ساڵی ١٨٤٨ز- ١٨٤٩ز

## ئیتاڵیا

ئیتاڵیا لە سەرەتای ساڵی ١٨٤٨ز یەکگرتوو نەبوو، هەروەها سەربەخۆش نەبوو، چونکە ئەو بەشەی کە دەوڵەمەند بوو بە میلانۆ و بوندقییەوە بەشێک بوون لە ئیمپڕاتۆریەتی ئەمسادا، لەباشووری ئەم ناوچە نەمساوییەدا، واتە لەناوەڕاستی ئیتاڵیادا سێ دۆقییەی سەربەخۆ هەبوون کە ئەوانیش ( بارما و مۆدینا وتۆسکانیا) بوون. هەریەکەیان میرێک لە بنەماڵەی هەبسبرگ تیایدا حوکمی دەکرد، و لە پاڵ ئەو نیمچە دەوڵەتی پاپاش هەبوو لەژێر دەسەڵاتی پاپا خۆی، بەڵام باشووری ئیتاڵیا کە پێکهاتبوو لە ناپۆلی و دوورگەی سەقەڵییە پێیان دەوتن (هەردووسەقەڵییە)، لەژێر دەسەڵاتی پادشاسەک بوو لە بنەماڵەی بۆربۆن کە نەمسا لەکاتی تەنگانەدا پاڵپشتی دەکرد وە لەهەموو ئیتاڵیادا دەوڵەتێکی سەربەخۆ نەبوو دوور لەدەسەڵاتی بیانی تەنیا شانشینی سەردینیا نەبێت کەبریتی بوو لە (بیدمۆنت جەنەوە دوورگەی سەردینیا).

بەڵام لەهەموو لایەکی ئیتاڵیادا لەنێوان ساڵانی ١٨٣٠-١٨٤٨ز بزووتنەوەیەک پەیدا بوو بەشێوەیەکی شاراوە لەپێناوی یەکێتی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی ئیشی دەکرد، هەرچەندە جیاوازی هەبوو لەنێوان خەباتگێرانی ئەم ڕێبازەدا، چونکە تاقمی **جۆزیف مازینی** (Joseph Mazzini) ١٨٠٥ز- ١٨٧٢ز دەیانویست یەکێتییەک بهێننەدی لەژێر سێبەری حکومەتێکی شۆڕشگێری کۆماری، پارتی پیاوانی ئاینیش دەیانویست یەکێتی ئیتاڵی لەژێر سەرۆکایەتی پاپادا دروست ببێت، تاقمی سێیەم

سەرۆکایەتی پادشا شارل ئەلبرتیان دەویست کە بیروباوەڕی ئازادیخوازانە بووە و سەرۆکی شانشینی سەردینیای سەربەخۆ بوو، بەڵام جیاوازی لەجۆری ئەو حکومەتەی کەدەیانەویست و سەرکردایەتی کردنەکەی هیچ کاری لەهەڵوێستی قین لێبوونەوە و بەرهەڵستکردنی دەسەڵاتی نەمسا کەم نەکردەوە، نەتەوەخوازەکان لەسەر جیاوازی بیروبۆچونیان کۆک بوون لەسەر ئەوەی کە پێویستە نەمسا لەخاکی ئیتاڵیادا دەربکرێت و دەسەڵاتی لە وڵاتەکەیان نەهێڵدرێت، کۆمەڵەی (ئیتاڵیای لاو) کە مازینی دروستی کردبوو دەیویست کۆمارێکی ئیتاڵی یەکگرتوو دابمەزرێنێت، بەپەلەی یەکەم ئامانجی رزگارکردن بوو لە دەسەڵاتی بیانیدا.

## شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨ز:

مانگی ئازاری ١٨٤٨و نەهاتبوو تا تەوژمی شۆڕشی نەتەوایەتی هەموو لایەکی ئیتاڵیای گرتەوە، لە میلانۆ دەستی پێکرد کە لەژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی نەمسادا بوو، شۆڕشگێران لێرەوە دوای شەڕێک کە چەند رۆژێکی خایاند توانیان لەشکری نەمسا بەسەرکردایەتی (رادەتسکی) (Radetzky) بشکێنن و دوایی شارەکە ئازاد بکەن ئیدی بڵێسەی شۆڕش ناوچەکانی لۆمباردیاو بوندقییەی گرتەوە، (شارل ئەلبرتی) پادشای سەردینیا ئەو هەلەی لەدەست خۆی نەدا، بەڵکو بانگی شەڕی دا لە دژی نەمسا و بەسوپا نیزامییەکەی بەرەو یارمەتی شۆڕشگێران کشا لەو کاتەدا پاپا بیۆسی نۆیەم لەگەڵ ئاواتی نەتەوەییە ئازادیخوازەکان بوو، هەروەها پادشایەتی لەهەردوو سەقەڵییەدا بەهۆی شۆڕش کەلەوێش هەڵگیرسابوو، پابەند بوو بە دەستوورەوە. لە مانگی مایس و حوزەیراندا ئیتاڵیا ئەوەندەی نەمابوو کە یەکێتی و سەربەخۆیی بەدەست بهێنێت، بەڵام لە راستیدا تا رادەیەک دوور بوو لە هێنانەدی ئەم ئاواتە، چونکە سوپای نەمسا کەهێز و توانای خۆی کۆدەکردەوە بە سەرکردایەتی رادەتسکی سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوەی بەسەر سوپای شارل ئەلبرتدا بەدەست هێنا لە (**شەری کەستۆزا**) (custizza) رۆژی ٢٥ی تەمموزی

١٨٤٨ز ئەو کاتە کار بە پێچەوانەوە روویدا ئینجا پەلاماردانە سەربازییەکە شارل ئەلبرت لە ساڵی ١٨٤٩ز سەرنەکەوت لەسەر دەستی هەمان سەرکردەی نەمساوی لە**شەڕی نۆڤار** (٢٣ی ئازاری ساڵی ١٨٤٩ز) بەتەواوەی شکا، لەئەنجامدا شارل ئەلبرت لە تەختی پادشایەتی شانشینی سەردینیا هاتە خوار بۆ کوڕەکەی (ڤکتۆر عەمانوێلی دووەم). ئەوەندەی پێنەچوو نەمسا ناوچەی باکووری ئیتاڵیای گرتەوە، هەروەها دەسەڵاتی لەناوچەکانی تردا پەیدا کردەوەو بەم جۆرە باری ئیتاڵیا گەڕایەوە سەر دۆخی جارانی پێش شۆڕش لە پارچە پارچە بوون و دەسەڵاتی بیانی و حکوومەتی رەهادا.

### ئەنجامەکانی:

لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بارە گەلێ ئەنجامی گرنگی لێ کەوتەوە لەوانە. قین و تووڕەیی ئیتاڵییەکان بۆ نەمسا زیادی کرد بەتایبەتی لەو ناوچانەی کە راستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی دابوون، چونکە زۆر بەتوندی کەوتبوە سزادانی شۆڕشگێڕان. هەروەها ئیتاڵییەکان یادی خەباتی هاوبەشیان لەپێناوی سەربەستی و یەکێتیدا لەبیر نەکرد لە ساڵانی ١٨٤٨-١٨٤٩ز، شانیشنی سەردینیاش بەسەربەخۆیی مایەوە لەژێر سایەی پاشا ئازادیخوازەکەی کە خاوەن بیروباوەڕێکی نەتەوەیی بەهێز بوو، ئەم پادشایە سەرۆکێکی لەبار بوو بۆ نەتەوەخوازەکان لە خەباتی داهاتویان لەپێناوی ئازادیدا.

# ئەڵمانیا

هەروەها لەئەڵمانیادا بارودۆخ گونجاو بوو بۆ روودانی بزووتنەوەیەکی نەتەوەیی ئازاد لەو ساڵە پەشێوە دا، بیروباوەڕی ئازادیخوازانە لەنێوان ساڵانی ١٨٣٠-١٨٤٨ز بەهێز بوو لەنێو پیاوانی چینی رۆشەنبیرو کەسانی چینی بورجوازی (ناوەند) لەهەموو ناوچەیەکی ئەڵمانیادا، هەرچەندە کە موتەرنیخ هەوڵێکی زۆری دا لەپێناوی لەناوبردنی ئەم بیروباوەڕە ئازادە بەهۆی پۆلیسی نهێنیەوە و دەست بەسەرداگرتنی رۆژنامەو فێرکردن و چاودێریکردنی پاسەپۆرتی هاتوچۆ ئەوەبوو زانکۆکانی ئەڵمانی بوون بە مەڵبەندی گەورەی بانگهێشتن بۆ ئازادی لەسەر ئەو شێوەیەی کە لە شۆڕشی فەرەنسی بانگهێشتی بۆ دەکرا لە دەسەڵاتی گەل و دابینکردنی ئازادی و حکومەتی دەستووری.

## شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨ ز لە ئەڵمانیا:

هەر کە لەئەڵمانیا دەنگ و باسی شۆڕشی پاریس و سەرکەوتنەکەی بڵاوبۆوە لە رووخانی حکومەتی (لویس فلیپ) ئازادیخوازان لەهەموو شارێکی ئەڵمانیا کەوتنە خۆ، داوای ئازادی و یەکێتی نەتەوایەتییان دەکرد، زۆربەی نیمچە دەوڵەتەکان داوای دامەزراندنی یەکێتی نەتەوایەتی ئەلمانیای دەکرد لەژێر سێبەری رژێمێکی پادشایەتی دەستووریدا. میرەکانی باڤاریا و بادن و سەکسۆنیا و هانۆڤەر، هەروەها حکومەتە سەربەخۆکانی شارەکانی ئەڵمانیا ناچاربوون وەزارەتێکی ئازادیخوازانە دابمەزرێنن، داوایان کرد ئەنجومەنێکی دامەزرێنەر بۆ دانانی دەستوور، لەمایسی ساڵی ١٨٤٨ز دا لە فرانکفۆرت کۆبونەوەیەک بەسترا کە نوێنەری هەموو نیمچە دەوڵەتەکانی ئەڵمانیا ئامادەبوون بە مەبەستی دانانی دەستوورێک بۆ شانشینی ئەڵمانیای یەکگرتوو لەژێر سایەی رژێمی پادشایەتی دەستووری، تاجیان پێشکەش بە فریدریک ولیەمی چوارەم کرد تا ( لەگەڵ پادشایەتی لە پرۆسیادا) ببێتە پادشای یەکێتی داواکراو، بەڵام شۆڕشە ئازادیخوازەکان لەو کاتەدا لەو کاتەدا دامرکانەوە، ئەو کاتە پاشا (فریدریک ولیەمی چوارەم) دەیتوانی ئەو تاجە رەتکاتەوە کە بە

دەستوورێکی ئازادەوە بەسترا بێتەوە. یەکەم لەبەرئەوەی بیروباوەڕێکی کەنارگرتوو (پارێزگار) پەرستی هەبوو، دووەم لەترسی ئیمپراتۆری نەمسا. گەلێ لەگەورە میرەکانی ئەڵمانی، دەبینین پادشای پروسیا تاجەکە رەت دەکاتەوە بەم جۆرە هەوڵ و کۆششی کۆبونەوەی فرانکفۆرت سەری نەگرت لەئاکامی ئەوەدا ئەنجوومەن خۆی هەڵوەشاندەوە و ئازادیخوازەکان ناچاربوون وڵات بەجێ بهێڵن.

پایزی ساڵی ١٨٤٨ز نەهاتبوو تا بزووتنەوەی ئازادیخوازانە خێراو بەپەلە لە پروسیا و نیمچە دەوڵەتەکانی تری ئەڵمانیا دامرکایەوە. هۆی ئەمەش ئازادیخوازەکان کەمینە پارێزگارەکان ژمارەیەک بوون کە گاڵتەیان پێ نەدەکراو دەسەڵاتێکی گەورەیان هەبوو، هەر کە هەڵ بۆ فریدریک ولیەمی چوارەم هەڵکەوت ئەو وەزارەتە ئازادیخوازەی لەکارخست کە لەکاتی پەشێویەکانی نیساندا بە ناچاری دایانابوو، داوای لە (کۆنت براندبرگ) ( Brandenburg )کرد کە سەرکردەی کۆنەپەرستان بوو بە دانانی وەزارەتێکی تازە. خەڵک لە بەرلین نەیان دەوێرا شتێک بکەن، چونکە هێزی سوپا لەگەڵ پادشا بوو، ئەمجا پادشا دەستوورێکی بۆ دەوڵەت دانا بەپێی ی ئەو بەڵێنەی کە پێشوو دابووی، بەڵام دەستوورەکە لە دانانی پادشاو دەست و پێوەندانی بوو، دەسەڵاتی باڵا بەدەست پادشاوە بوو. هیچ شتێکی بایەخدار بۆ گەل نەمایەوە لەئازادی و دەسەڵاتدا. هەر هەمان شێوەی رووداو وەک ئەم بزووتنەوە کۆنەپەرستییە لەهەموو لایەکی ئەڵمانیا روویدا کاتێ ئازادیخوازەکان دوای هەڵوەشانەوەی کۆبونەوەی فرانکفۆرت (مایسی ١٨٤٩ز) هەستان بە گەلێ شۆرشی ناوچەیی کە بەئاسانی بەهۆی هێزی سوپای پروسیاوە دادەمرکێندرایەوە، ئەو کاتە گەلێ لە ئازادیخوازەکان وڵاتیان بەجێ هێشت و لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا جێگیر بوون زۆریشیان خرانە بەندیخانە.

# ئیمپڕاتۆریەتی نەمسا

## شۆڕشی ١٨٤٨ز لە نەمسادا:

موتەرنیخ نەیتوانی پەرەسەندنی بیروباوەڕی ئازادیخوازانە لە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی نەمسا کە قەڵای سیاسەتە کۆنەپەرستییەکەی بوو بوەستێنێت، چونکە هەر کەدەنگ و باسی شۆڕش لە پاریس و ئیتاڵیا گەیشتە ئەم پایتەختە، ئازادیخوازەکان لە ناوەڕاستی مانگی ئازاری ١٨٤٨ز شۆڕشێکیان دژی ڕژێمە کۆنەکەیان بەرپاکرد کەبووە هۆی وازهێنانی موتەرنیخ و راکردنی بۆ بەریتانیا، ئەو کاتە ئیمپراتۆر فەردیناندی یەکەم ئیمپڕاتۆری نەمسا بەناچاری داخوازییەکانی شۆڕشگێڕەکانی جێبەجێ کرد و چاودێری لەسەر ڕۆژنامە لابرد و پەیمانی دا دەستوورێک بۆ دەوڵەت دابنێت.

## شۆڕشی ١٨٤٨ز لە چیکوسلۆڤاکیاو مەجەڕدا:

کاروباری شۆڕش لە ئیمپڕاتۆریەتی نەمسادا خراپ ئاڵۆزبوو، چونکە گەلێ نەتەوەی جیاجیای تێدا بوو، بۆیە هەرکە دەنگ و باسی شۆڕش لە ڤیەننا بڵاوبۆوە، چیکوسلۆڤاکییەکان شۆڕشێکیان دژی نەمسا لە بۆ هیمیا بەرپاکرد، مەجەڕییەکان دژ بە داگیرکردنی هەنگاریا شۆڕشێکیان بەرپاکرد لە هەردوو ناوچەکەدا شۆڕش بەرپابوو هەروەک لە ئیتاڵیا کە لەپلەی یەکەم دەیانویست لەدەست حوکمی نەمسا دا ڕزگاریان ببێت و حکومەتی نەتەوەیی دابمەزرێنن. لەبەر ئەوەی زۆر نەتەوە هەبوون لە ئیمپڕاتۆریەتی نەمساویدا لە مەجەڕی و چیکی و سلۆڤاکی و ئیتاڵی، بۆیە ئەنجامەکانی ئازادیخوازانیش لە نێو ئیمپڕاتۆریەتدا گەلێ جۆراوجۆر بوو کە ئەمەش وایکرد لە بەرهەڵستی کردنی دەسەڵاتی ناوەندی ئەرک و هەوڵدانیان بۆ یەک نەخرێت لەبەر ئەوە پیاوانی ڕژێمی کۆن توانیان کە بەسەر یەکە یەکە ئەم شۆڕشانەدا زاڵ بن، لەحوزەیرانی ساڵی ١٨٤٨ ز کۆنگرەیەکی سلاڤی لە شاری پراغ بەسترا بۆ لێکۆڵینەوە لە دامەزراندنی حکومەتێکی سەربەخۆ بۆ چیک و سلۆڤاکیا و ئەو ڕەگەزە سلاڤییانەی کە دەکەونە نێو سنووری ئیمپڕاتۆریەتی نەمسادا، بەڵام سەرکردەی نەمسا (ڤندشگراتز) (Windisschgratsz) توانی بەسەر ئەم بزووتنەوە شۆڕشگێڕەدا زاڵ ببێ و دەست بەسەر (بۆهیمیا) دابگرێتەوە، بەڵام لە هەنگاریا بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی بوارێکی گەلێ فراوانتر و پڕمەترسی تری هەبوو، چونکە مەجەڕییەکان لە دەوری سەرکردەکەیان **لویس کۆشۆت** Louis Kossuth

کۆبوونـەوەو حکومەتێکـی نەتەوایەتـی سـەربەخۆیان دامەزرانـد کـە خاوەنـی بیروباوەڕێکـی ئازادیخوازانـە بـوو کـە سەربەسـتی ڕۆژنامەگـەری بڕیـارداو مافـە تایبەتییەکانـی خانەدانـی نەهێشـت، بـەڵام بزووتنەوەکـەی بـۆ هیمیـا لەسـەر دەسـتی سـەرکردە ڤندشـگراتز کۆتایـی پێهـات، لەپـاش ئـەوە بەخـۆی و بـە سـوپاکەیەوە لـە تشرینی یەکەمـی ساڵی ١٨٤٨ ز بـۆ لەناوبردنـی حکومەتـە ئازادیخوازەکـەی بـەرەو ڤیەنـا کشـا توانـی دوای شـەڕێک کـە چەنـد ڕۆژێکـی خایانـد شـارەکە داگیـر بـکات و دەسـەڵاتی ئیمپڕاتـۆر بگەڕێنێتـەوە، ئـەو کاتـە ئیمپڕاتـۆری بـێ هێـز فردینانـدی یەکـەم وازی لـە تەختـی شـاهانە هێنـا بـۆ کـوڕی براکـەی فرەنسـیس جۆزیـف کـە ئیمپڕاتـۆری تـازە کاروبـاری حکومەتـی سـپارد بـە میـر شڤارتزمبرگ (Schwartzemburg) کە بەهیـچ شـێوەیەک لـە بیروبـاوەڕی کۆنەپەرسـت و دەسـەڵات زۆریـدا لـە موتەرنیـخ کەمتـر نەبـوو، سـاڵی ١٨٤٨ ز تـەواو نەبـوو تـا گیانـی شـۆڕش لـە نێـو نەمسـادا کـپ بـوو، چـاوەڕوان دەکـرا کـە شـۆڕش لـە ئیتاڵیـا و هەنگاریاشـدا کـپ بکرێـت، ئەمـەش لـە سـاڵی داهاتـودا ڕوویـدا کەسـوپای نەمسـا توانـی سـوپای ئیتاڵـی بشـکێنێ وەک وتمـان، ئەوکاتـەی توانـی کەهێـز و توانـای بـەرەو شۆڕشـی مەجەڕی ئاراسـتە بکات. لـەم کاتەدا قەیسـەری ڕووسـیا (نیقولای یەکـەم) سـوپایەکی نـارد بـۆ یارمەتیدانـی ئیمپڕاتـۆر. مەجەڕییەکان ئازادانـە تامـردن بەرگرییـان لـە سـەربەخۆیی خۆیـان کـرد، بـەڵام بۆیـان نەکـرا لە دوای شـەڕێکی زۆر سـەخت لـە سـێ مانـگ زیاتـر بەرانبـەر ئـەو هێـزە لەبـن نەهاتـووەدا بوەسـتن، لویـس کۆشـۆت لەگـەڵ تاقمـێ لـە هاوڕێکانـی ڕایـان دەکـرد بـەرەو دەوڵـەتـی عوسـمانی، سـەرکردەکانی دیکـەش لەسـەر دەسـتی ئیمپڕاتۆریەتـی نەمسـا تووشـی دژوارتریـن سـزابوون.

سـەرکەوتن بەسـەر بزووتنـەوە لـە هەنگاریـا حوکمـی کۆنەپەرسـتی جێگیـر کـرد لەهەمـوو لایەکی ئیمپڕاتۆریەتی نەمسـاویدا، ئەم سـەردەمەش بەسـەرچوو (سـەردەمی شۆڕشـەکانی ساڵی ١٨٤٨ ز — ١٨٤٩ ز هەرچەنـدە کـە موتەرنیـخ لـە حوکـم لابـرا، بـەڵام ئەوانـەی کـەدوای ئـەو هاتـن هیـچ جیاوازییەکیـان لـەڕووی سیاسـەتی نـاوەوە و دەرەوەدا لـە موتەرنیـخ کەمتـر نەبـوو، شـڤارتزمبرگ دەسـەڵاتی بەسـەر کاروبـاری وڵاتـدا گـرت بەدەسـتێکی ئاسـنین، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا کاروبـار بەتەواوەتـی هـەر نەگەڕایـەوە دۆخـی جارانـی، چونکـە هەسـتی نەتەوایەتی لەو سـاڵە پەشـێوەدا زۆر بەهێـز تربـوو لـە نێـو دڵ و دەروونـی خەڵکیـدا ئارامـی گرتبـوو. ئەوەنـدی پـێ نەچـوو پـاش ماوەیەکـی کـەم نیشـانە پـڕ مەترسـییەکانی سـەری هەڵدایـەوە.

## پێشەوایەتی سەردینیا ١٨٤٩ز – ١٨٥٩ز:

میرە کۆنەپەرستەکان لەهەموو ناوچەیەکی ئیتاڵیادا گوێیان نەدا بەوە ڕووداوەکانی ساڵی ١٨٤٨ز چۆن هەستی نەتەوایەتی و ئازادیی خۆش لەناخی گەلی ئیتاڵیا بەخۆیان هێشتبوو، مافەکانی مرۆڤیان پێشیل کرد هەر لەسەر هەمان شێوازی کۆن بە توندڕەوی حوکمڕانیەتیان دەکرد، کاروبار لە وڵاتی هەردوو سەقەڵییەدا زۆر خراپتر بوو، چونکە پادشا بۆربۆنییەکەی (فردیناند) هەموو شێوازێکی کۆنی بەکارهێنا لە ڕێگرتن لەرۆژنامە و گرتن و سزای توند لە پێناوی زاڵبوون بەسەر هەر بزووتنەوەیەک، بەڵام ئەم شێوازە کۆنەپەرستییە زیاتر ئازادیخوازانی جۆشدا کەدەست بە بیروباوەڕەکانیەوە بگرن و هەروەها سۆزی مرۆڤدۆستانی ئازادیخوازیشی لە هەموو لایەکی ئەورووپادا بۆلای خۆی ڕاکێشا. واچاوەڕوان دەکرا کە شۆڕشێکی گشتی لە هەموو ئیتاڵیادا ڕوودەدات لە نزیکترین دەرفەتی رەخساو دا، دوای ئەوەی کە ڕاو بۆچوونی هەموو نەتەوەخوازەکان لەوە دەچوو کە کۆک بێت دەربارەی سەرۆکایەتی ئەو دەوڵەتەی کە دەیانەوێت ڕزگار بکرێت و یەک بخرێتەوە. ساڵی ١٨٥٠ز نەهاتبوو زۆربەی بیروڕاکان کۆک بوون لەسەر پێشەوایەتی سەردینیا لە دروستبوونی دەوڵەتی ئیتاڵیای ئاواتخواز، چونکە سەردینیا تاکە شانشین ئیتاڵیا بوو کە نەکەوتە ژێر دەسەڵاتی نەمساوە، هەروەها تەنیا وڵات بوو کە دەستوورێکی سەربەخۆی هەبوو کە پادشا ئەلبرت ساڵی ١٨٤٨ ز پێی بەخشی بوو.

### سەرکردەکانی ئیتاڵیا:

سەردینیا سێ لەبەتواناترین سەرکردەی نەتەوەیی لێ هەڵکەوت کە لەپێشەوەیاندا **پادشا ڤکتۆر عەمانوێلی دووەم** (١٨٤٩ز – ١٨٧٨ز) بوو کە لە دوای باوکییەوە شارل ئەلبرت حوکمی گرتە دەست، دەستووری وەک خۆی هێشتەوە، ئازادیخوازان لەهەموو لایەکی ئیتاڵیاوە بە پیاوێکی ڕاستییان ناسی بۆ وەدیهێنانی ئاواتەکانیان.

هەروەها **گاریباڵدی** (١٨٠٧ز – ١٨٨٢ز) هەرچەندە کە ڕێبازی حوکمی کۆماری بەلاوە پەسەند بوو، بەڵام ئامادە بوو بۆ لایەنگری دەوڵەتێکی یەکگرتووی دەستووری لەژێر سایەی ڤکتۆر عەمانوێلدا. ئەم پیاوە سەرکێشە زانی کە پێشەوایەتی سەردینا تاکە ڕێبازە بۆ هێنانەدی ئامانجی نەتەوایەتی، هەر لە نشینگەی خۆی لە دوورگەیەکی بچووک کەپێی دەڵێن کابرێرا (Caprera) چاودێری ئەو کاتەی دەکرد کە ئەرکی سەرشانی خۆی بەجێ بهێنێ.

## کاڤور:

کاڤوریش (Cavour) ۱۸۱۹ز – ۱۸٦۱ز ئەو پیاوە سیاسییە بێ هاوتایە بوو کە رۆڵێکی باڵای گێڕا لە یەکێتی ئیتاڵیادا، لە کارە سەرەکییەکانی کە لە سەردەمی شارل ئەلبرتدا پێی هەڵسا بەشدارکردنی بوو لە دەرکردنی ئەو رۆژنامەیەی کە لە ئیتاڵیا دا ناوی بووژانەوە (Illrisorgimeno) بوو کە داوای لە هەموو نیمچە دەوڵەتەکانی ئیتاڵیا دەکرد لە دەوری سەردینیا کۆببنەوە لەپێناوی هێنانە دی یەکێتیدا. ئنجا لەسەردەمی پادشا ڤکتۆر عەمانوێلدا، کاڤوور بوو بەسەرۆک وەزیران و بەردەوام لەو پایەدا بوو (جگە لە ماوەیەکی کەم) بەدرێژایی ساڵانی ۱۸۵۲ز تامردنی لە ساڵی ۱۸٦۱ز.

## سیاسەتەکەی:

کاڤور لەو ماوەیەی کە حوکمی کرد گەلێ کاری گرنگی لەبەرژەوەندی شانشینی سەردینیا و لەپێناوی یەکێتی ئیتاڵیادا ئەنجامدا. لەکاروباری ناوخۆدا هانی کشتوکاڵ و پیشەسازی دا و رێگای هاتوچۆی چاک کرد، لەگەڵ پیادەکردنی رێبازی بازرگانی ئازاد و بایەخی بە کاروباری پەروەردەو فێرکردن دا، بێ ئاگا نەبوو لەوەی کەپیاوانی ئاینی چ دەسەڵاتێکی فراوانیان لە شانشینی سەردینیا هەیە، بۆیە کەوتە کەمکردنەوەی دەسەڵاتێکی فراوانیان لە شانشینی سەردینیا هەیە، بۆیە کەوتە کەمکردنەوەی دەسەڵاتیان و نەهێشتنی دێرەکان و زۆری لەجزویتەکان کرد کە وڵات بەجێ بهێڵن، لە رووی سیاسییەوە ئەم وەزیرە شارەزایە هەوڵی نزیکبوونەوەیدا لەبەریتانیا و فەرەنسادا، سەردینیای خستە پاڵ ئەم دوو دەوڵەتە لە شەڕی (قرم) دا دژی دەوڵەتی رووسی کە بەم جۆرە هاوپەیمانیەتی ئەم دوو دەوڵەتەی بەلای خۆیدا راکێشا. بەم جۆرە سەردینیا پایەیەکی دیاری هەبوو لەنێو دەوڵەتانی ئەوروپادا. کاڤور بەردەوام هەوڵی دەدا کە یارمەتی لەفەرەنساوە وەربگرێت بۆ شکاندنی نەمسا، لەگەڵ ناپلیۆنی سێیەم گەیشتنەیەک لە پلۆمییر (Plomireres) لە فەرەنسادا، لەنێوان هەردووکیاندا **رێککەوتن نامەی (پلۆمییر)** مۆرکرا ساڵی ۱۸۵۸ز کە ناپلیۆن بەڵێنی بە پێشکەشکردنی یارمەتی شانشینی سەردینیادا بۆ دەرکردنی نەمسا لە لۆمباردیا و بوندقییە دا، کاڤوریش لە بەرامبەر ئەوە بەڵێنی دا بە فەرەنسا کەواز لە نیس (Nice) و ساڤۆی (Savoy) بهێنێت.

# بەدیهێنانی یەکێتی ئیتاڵیا (١٨٥٩ – ١٨٧١ز):

## شەڕ لەنێوان نەمساو سەردینیادا (١٨٥٩ز):

ئەوەندەی پێنەچوو کاڤور کە لە یارمەتی فەرەنسا دڵنیا بوو، کەوتە ئاژاوەنانەوە لە لۆمباردیا و بوندقییە دا لەلایەک، لەلایەکی ترەوە سوپای بۆ شەڕ ئامادە دەکرد، نەمسا پێی نیگەران بوو وای لێهات کە جەنگ دژی سەردینیا بەرپا بکات. لەو جەنگەی کە لە نێوان هەردوولا روویدا سەردینییەکان و فەرەنسییەکان بەسەر نەمساوییەکان سەرکەوتن لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٨٥٩ ز لە **شەڕی ماگێنتا** (Magenta) و **سۆلفرینۆ** (Solferino) ئەم سەرکەوتنە بووە هاندەرێک بۆ هەڵگیرسانی شۆڕش لە: بارما، مۆدینان تۆسکانیا، هەریەکەیان توانی میرە (هابسبرگی) یەکەی لە حوکمدا لابەرێت.

ئەوکاتە ناپلیۆنی سێیەم کە بینی هەر شۆڕشە و لە ئیتاڵیادا هەڵدەگیرسێت، پرۆسیاش کەوتە خۆی بۆ ئامادەکردنی سوپا لەسەر سنووری راین، ئەمە وایکرد کە بیانوو بدۆزێتەوە لە کشانەوەی سەربازەکانی لەبەرەی نەمسادا، بەبێ راوێژکردنی سەردینیای هاوپەیمانی هەڵسا بەمۆرکردنی (ئاگربەستی ڤیلافرانکا) (Villa franca) لەگەڵ فرەنسیس جۆزیف ئیمپراتۆری نەمسادا لە ساڵی ١٨٥٩ز دا، بەپێی ئەمە بوندقیە (ڤینیسیا) لەژێر رکێفی نەمسادا مایەوە و لۆمباردیاش خرایە سەر سەردینیا و میرە لابراوەکان بگەڕێندرێنەوە بۆ تەختی شاهانەیان لە ئیتاڵیادا و، دامەزراندنی یەکێتی ئیتاڵیا بە سەرۆکایەتی پاپا. شایانی باسە پادشا ڤکتۆر عەمانوێل بە مەرجەکانی ئەم ئاگربەستە قایل بوو، چونکە باوەڕی وابوو کەناتوانێ بەرهەڵستی نەمسا بکات بەبێ یارمەتی دەرەوە، بەڵام کاڤور تووڕە بوو لەوەی کە ناپلیۆن نەیتوانی ئەو بەڵێنەی کە پێیدابوو لە رزگارکردنی ئیتاڵیا (لە نێوان شاخەکانی ئەلب و دەریای ئەدریاتیک)دا بیباتە سەر، دەیویست سەردینیا بەردەوام بێت لەجەنگ، کاتێک پادشا بەمە قایل نەبوو کاڤور دەستی لە کارکێشایەوە و ئەوکاتە بەندەکانی ئاگربەستەکە جێگیربوو بە پێی رێککەوتنامەی زیوریخ ساڵی ١٨٥٩ز دا.

## دۆقییەکانی (میرنشینەکانی) باکوور دەچنە پاڵ سەردینیاوە: ١٨٦٠ز:

ئەم سێ دۆقیانە (بارما و مۆدیناو تۆسکانیا) و ناوچەی پاپاوەی کە ناسرابوو بە (ڕۆمانا) (Romagna) دژیەتی خۆی لە دامەزراندنی یەکێتییەک بەسەرۆکایەتی پاپا نیشان دا، چونکە لەوکاتەدا بیروباوەڕی ئازادیخوازانەی نەبوو، هەروەها دوور بوو لە بیروباوەڕی نیشتمان پەروەری، ئەمە پێچەوانەی سەردینیا کە ناسرابوو بە بیروباوەڕی نیشتمان پەروەری و ئازادیخوازانە، ئەمە جگە لە سەرکێشی بۆ جەنگ لەپێناوی یەکێتی دا، لەبەر ئەم هۆکارانە ئەم چوار ناوچەیە ئارەزووی خۆیان دەربڕی بۆ چوونە پاڵ شانشینی سەردینیاوە، بەڵام ناپلیۆنی سێیەم بەر هەڵستکارانە وەستا دژی ئەم ئارەزووە کە لەگەڵ ناوەڕۆکی (ڕێککەوتننامەی زیوریخ)دا ڕێک نەدەکەوت. لەوکاتەدا کاڤور گەڕایەوە بۆ سەرۆکایەتی وەزارەت کە چارەسەری ئەم کێشەی لابوو بە پێدانی نیس و ساڤۆی بە ناپلیۆن (هەروەک پێشتر لە گفتوگۆی پلۆمبیردا بڕیاری لەسەردرابوو) بەمەرجێک ناپلیۆن ڕازی بێت ئەو ناوچەی بخرێتە سەر سەردینیا ئەوەی کاڤۆر دەیویست هاتەدی و جێگیربوو بەپێی **ڕێکەوتننامەی تۆرین** (Turin) لەنێوان ناپلیۆنی سێیەم و ڤکتۆر عەمانوئێلی دووەم ساڵی ١٨٦٠ز جێگیر بوو.

## گاریباڵدی و هاتنە پاڵی شانشینی هەردوو سەقەڵییە(١٨٦٠ز):

لەوکاتەی کە کاڤور توانی نیمچە دەوڵەتەکانی باکوور بخاتە پاڵ سەردینیاوە، گاریباڵدی کەوتە هەوڵدان بۆ ئەوەی هەردوو سەقەڵییەشی بخاتە پاڵی، بۆ ئەمەش هەڵگیرسانی شۆڕشی بە هەل زانی لە دوورگەی سەقەڵییە، بۆیە لە دەریاوە بە هەزار جەنگاوەر لە لایەنگرە بەهێزەکانی (خاوەن کراسە سوورەکان) پەڕییەوە ئەم سەکردە بەڵێنێکی لە کاڤور وەرگرتبوو کە دەست نەخاتە نێو کاروباری ئەم هێرشە. (خاوەن کراسە سوورەکان) کاتێ لەسەرخاکی ئەم دوورگەیە دابەزین ڕووبەڕووی گەلێ گیروگرفتی دژوار هاتن و نەیانتوانی کەدەستی بەسەردابگرن تادوای شەڕێک کە سێ مانگی خایاند، دوای ئەوە گاریباڵدی بەرەو نا پۆلی پەڕیەوە لە گەرووی (مسینا)وە و، شارەکەی داگیرکرد، پادشا فرنسیسی دووەم

ناچاربوو رابکات. گاریبالدی بە گرتنی ولاتی هەردوو سەقەلییە بارێکی ئالۆزی نێودەولەتی خولقاند، کاڤور بە لێزانی و زیرەکی خۆی ڕووبەڕووی بۆوە، ناپلیۆنیش بە هەلوێستێکی ڕاڕاو دوودلی رووبەڕووی بۆوە. ناپلیۆن بەلێنی بە پاپا دابوو کە مولکەکانی بپارێزێ ئەو مولکانەی کە گاریبالدی مەترسی خستبوونە سەر. لەسەر ئەوە ناپلیۆن نارەزاییەکی توندی بۆ کاڤور نارد تیایدا هەڕەشەی لەدامرکاندنەوەی ئەم بزوتنەوەیە کرد، کاڤور ناچاربوو کەخۆی وادەربخات نارەزایە و نیگەرانە لەوەی کە ڕوویداوە لە باشووری ئیتالیاوە، لە ئەنجامی ئەمەدا سوپای سەردینیا بە روالەت وای بەدیار خست رووەو ناپۆلی کشا بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕش، بەلام ناپلیۆن دەیویست بە سوپاکەی خۆی شۆڕشەکە دابمرکێنێتەوە، بەلام ترسی لە بێزاری بەریتانیا بۆ دەست خستنە نێو کاروباری ئیتالیادا پەشیمانی کردەوە.

## ڕاگەیاندنی پادشایەتی لە ئیتالیادا ١٨٦١ز:

پادشا ڤکتۆر عەمانوێل گەیشتە شاری ناپۆلی پاش ئەوەی شکاند کە رێگەی لێگرتبوو پاشان گەلێ ناوچەی تری گرنگیشی لە دەولەتی پاپادا دەست بەسەرداگرت، لەپایزی سالی ١٨٦٠ز دا ڕاپرسییەکی گشتی لە شانشینی هەردوو سەقلیە، لەناوچە داگیرکراوەکانی پاپادا ئەنجامدرا زۆربەی هەرە زۆری دەیانویست بچنە پال شانشینی سەردینیا، خەریک بوو یەکێتی ئیتالیا دەهاتەدی تەنها ناوچەی بوندقیە (ڤینیسا) نەبێ کە هەر لەژێر رکێفی نەمسادا بوو، هەروەها ناوچەی رۆما کە هێشتا هەر لەژێر دەسەلاتی پاپا دابوو، ئەمجارە لەسەرەتای بەهاری ١٨٦١ ز لە (تۆرین)ی پایتەختدا یەکەم پەرلەمان کە نوێنەری یەکێتی ئیتالیا بوو کۆبۆوە، یەکێتی بەڕەسمی ڕاگەیەنرا لەژێر سایەی پادشا ڤکتۆر عەمانوێلی دووەم و دەستووری سالی ١٨٤٨ز.

### بوندقییه (ڤینیسیا)و ڕۆما دەچنە پاڵ پادشایەتی ئیتاڵیاوە:

دە ساڵ تێنەپەڕی بەسەر ڕاگەیاندنی پادشایەتی لە ئیتاڵیادا تا ئەم دوو ناوچە گرنگە (بوندقییەو ڕۆما)چوونە پاڵی، هەوڵ و کۆششی ئەڵمانیا لەپێناوی یەکێتی و فشارەکانی لەم بوارەدا لەسەر نەمسا و فەرەنسا، کارێکی گەورەی دەبێت بۆ بەدیهێنانی یەکێتی ئیتاڵیا، چونکە پروسیا ساڵی ١٨٦٦ز کەوتە شەڕێکی بێ پسانەوە لەگەڵ نەمسادا، ئیتاڵیاش چووە پاڵ پروسیا بەنیازی گێڕانەوەی بوندقیە زۆری پێنەچوو کە نەمسا بەرانبەر هێزی پروسیا تێک شکا و ناچار بوو کە ڕێکەوتنێکی بەپەلە مۆر بکات کە لە بەندەکانی وازهێنان بوو لە بوندقییە بۆ وڵاتی ئیتاڵیا، ئەو ڕاپرسییەی کە لە بوندقییە دا ئەنجام درا هەموویان لەگەڵ چوونە پاڵ ئیتاڵیا بوون، دوایی هەمان سیاسەتی ئەڵمانی بووە هۆی (جەنگی حەفتا) (١٨٧٠ز-١٨٧١ز) لە نێوان ئەڵمانیا و فەرەنسادا. کە ناپلیۆنی سێیەم ناچاربوو لەشکرەکەی لە ڕۆما بکێشێتەوە و ئەو کاتە سوپای ئیتاڵیا هیچ زەحمەتێکی نەبینی کەبەسەر سەربازەکانی پاپادا سەرکەوێت، لەکۆتایی ساڵی ١٨٧٠ز دا ڕاپرسییەک لەو شارە سازکرا کەلایەنگری یەکێتی بوون ئەوکاتە (ڕۆما)بوو بە پایتەختی پاشانشینی ئیتاڵیا.

## ئیتاڵیا دوای یەکبوونی ١٨٧١ز - ١٩١٤ز

ئەوەندەی پێنەچوو ئیتاڵییەکان دوای هێنانەدی یەکێتی و ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی بیانی تا چاویان بڕییە گەڕاندنەوەی مێژووی پڕ لە شکۆمەندیان (مێژووی ئیمپرتۆریەتی ڕۆمانی)یان هەر نەبێت بگەنە ڕیزی دەوڵەتە گەورەکان، بۆیە حکومەتی ئیتاڵیا کەشتیگەلێکی مەزنی دروست کرد، لەوساڵی ١٨٧٥ بڕیاریدا هەموو ئەو لاوانەی پێگەیشتوون بە زۆر بیانکاتە سەرباز، وای لێهات لاسایی دەوڵەتە گەورەکان بکاتەوە بۆ دەست بەسەرداگرتنی داگیرگەکان (المستعمرات) تونس (بنکەی قرتاجەی کۆن) لەپێشی ئەوانە بوو کە دەیویست دەستی بەسەردا بگرێت. کاتێک دەسەڵاتی فەرەنسا لە تونس جێگیر بوو بە بیانووی پاراستنی لە ساڵی ١٨٨١ز، نارەزایی تەواو ئیتاڵیای گرتەوە تا ساڵی دواتر چووە نێو

پەیمانێکی سێ قۆڵی ئەڵمانیا و نەمسادا (کۆنە دوژمنەکەی).

ئیتاڵیا لەم پەیمانە سێ قۆڵیەی (Triple Alliance) مایەوە بەدرێژایی ساڵانی ١٨٨٢ز – ١٩١٥ز، کە ئەمە کاریگەری خراپی لێکەوتەوە لە زۆری خەرجی شەڕەوە، دوای ئەوە نەیتوانی کە داوای هەردوو شاری (ترنت و تریست) (Triest) بکات کە هێشتا هەر لەژێر دەسەڵاتی نەمسادا بوون، ئیتاڵیاش لەو ماوەیەدا هەموو هەوڵ و تەقەلای ئاراستەی پرۆژەکانی ئیستعماری کردبوو لە ئەفریقیا کە لەپارەو پوول و سەربازیدا زۆر زەرەر و زیانی لێکەوت لە ئەنجامدا ئەریتیریا و سۆماڵی دەستکەوت، بەڵام لە هەوڵ و تەقەلای بۆ داگیرکردنی حەبەشە (ئەسیوبیا) لەسەردەستی حەبەشییەکان لە شەڕی (عەدوە)

(Adowa) ساڵی ١٨٩٦ز خراپ شکا، ئنجا ئیتاڵیا تووشی شەڕبوو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی لەساڵی (١٩١١ز – ١٩١٢ز)دا کە لەئەنجامدا تەرابلوس (لیبیا)ی کەوتە ژێر دەست لە باکووری ئەفریقیاوە لەگەڵ گەلێ لە دوورگەی بچووک لە دەریای (ئیجە) دا.

بەڵام ئیمپراتۆریەتی ئیتاڵیای تازە، دەوڵەمەند نەبوو وەهیچ سوودێکی ئەوتۆی بۆگەلی ئیتاڵیا نەهێنایەدی، هەرچەندە بووە هۆی دەوڵەمەندبوونی چینێک لە پیاوانی سەرمایەدار و پیاوانی کاربەدەست، چونکە حکومەت بەردەوام بوو لە چەوساندنەوەی گەل بەتایبەتی چینی کرێکار و جووتیار بە دانانی باجێکی زۆر کە لەئەنجامی ئەم زەبرەو گرتنی سەربازی بەزۆر بووە هۆی کۆچکردنی ژمارەیەکی زۆر لە چینەکانی خوارەوەی میللەت بەرەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئەرجەنتین و بەرازیل تا وای لێهات ژمارەی ئەوانەی کە لە ئیتاڵیاوە کۆچیان کردووە لە ساڵانی ١٨٧١ز – ١٩١٤ز نزیکەی شەش ملیۆن کەس دەبوون.

پەیدابوونی توندڕەوی نەتەوایەتی شۆڤێنی (دوژمنکارانە) لە دیارترین ڕواڵەتەکانی دەوڵەتی ئیتاڵیای تازە بوو لە گرنگترین ئەو هۆیانە بوو کە داوای لە میللەت دەکرد بۆ سەرکێشی ئیستعماری کە ئەم رق لەناخیان چاندنە بووە هۆی جێگیربوونی گیانی نەتەوایەتی دوژمنکارانە و پەرەسەندنی تاوای لێهات ئیتاڵیا

لـه سـەدەی بیسـتەم خوێـن گەرمیەکـی نەتەوایەتـی و تونـدڕەوی بەخۆیـەوە دی کـە کەمتـر نەبـوو لـەوەی کـە بینیمـان لەسـەدەی نۆزدەمـدا. ئـەو خوێـن گەرمیـەش بـە باشـی لەکاتـی جەنگدا دەرکـەوت لەگـەڵ دەوڵـەتـی عوسـمانی و داگیرکردنـی تەرابلـوس (لیبیـا)دا ئنجـا چوونـە دەرەوەی ئیتاڵیـا لـە پەیمانـی سـێ قۆڵـی سـاڵی ١٩١٥ز دوایـی چوونـە پـاڵ بەریتانیـا و فەرەنسـاو پەلاماردانـی نەمسـا کەتـا ئـەو کاتـە ترنت و تریسـتی داگیرکردبـوو لـە ئەنجامـدا ئـەم دوو شـارەی وەرگرتـەوە و سنووریشـی تـا رادەیەکـی زۆر لەمـە فراوانتـر کـرد.



# پرووسیا سەرکرایەتی یەکێتی ئەڵمانی دەکات

ویلایەتەکانی ئەڵمانیا دووجار یەکگرتنیان بەخۆیانەوە بینی یەکەم جاریان ناپلیۆن هەڵسا بەکەمکردنەوەی سەد ولایەت لە ولایەتەکانی ئەڵمانیا کە ژمارەیان دەگەیشتە سێ سەد ویلایەت. دووەم جاریش کاتێ کە کۆنگرەی ڤیەننا ولایەتەکانی ئەڵمانیای کەم کردەوە بۆ سی و نۆ ویلایەت، **یەکێتی گومرگی** (Zoliverin)[1] کە لە ساڵی ١٨٣٤ز بە سەرۆکایەتی پروسیا بەسترا لەنێوان زۆربەی ویلایەتەکانی ئەڵمانیا هاندەرێک بوو بۆ دامەزراندنی یەکێتییەکی سیاسی بەتین، بەڵام سەرنەکەوتنی **ئەنجومەنی فرانکفۆرت** (ساڵی ١٨٤٩ز) بەهۆی بیروباوەڕە ئازادەکانیەوە بوو، چونکە سەردەمی کۆنەپەرستی کە لەدوای ئەوەوە هاتبوو لەڕووی هەستی نەتەوایەتییەوە یان لەڕووی ئارەزوومەندی بۆ یەکێتی لەو کەمتر نەبوو و، بەدرێژایی رۆژگار دەرکەوت کە پێویستە ئەو یەکێتییە کۆنە هەڵوەشاوە بگۆڕێت بۆ یەکێتییەکی بەهێزتر، بەڵام ئەم رێگایە لە تەنگ و چەڵەمەی گەورە بێبەش نەبوو، کە لەپێشیانەوە ناکۆکی بوو لەنێوان پروسیا و نەمسا لەڕووی سەکردایەتی کردنیان کەدەبوو تای تەرازووی یەکێکیان بەسەر ئەویتردا زاڵ بێ لە بەدیهێنانی یەکێتییەکەی چاوەڕوانکراودا، تای تەرازووەکە بەلای پروسیادا شکایەوە (پێچەوانەی نەمسا)، چونکە لەچەند میللەتێکی جیاجیا پێک نەهاتبوو، بەڵکو تەنیا بریتی بوو لە میللەتی جێرمانی هاوڕەگەز، ئەمە جگە لە بەهێزی و گرنگی نێو دەوڵەتییەکەی.

پسمارک

(١) زۆلفراین: یاسایەک بوو بۆ یەکێتی گومرگی کە بەوپێیە ناوچە گومرگییەکانی نەهێشت لەنێوان ویلایەتەکانی ئەڵمانیا و کردییە یەک ناوچەی گومرگی.

# سەرکردەکانی یەکێتی ئەڵمانیا

## پادشا ولیەمی یەکەم(١٨٦١ز – ١٨٨٨ز):

لە پرۆسیا دوو سەرکردە دەرکەوتن کە دادەنرێن بە پێشەنگی ئەوانەی کە بۆ پایەبەرزی پروسیا و دامەزراندنی یەکێتییەکەیان هەوڵیان دابێت، ئەوانیش (پادشا ولیەمی یەکەم) و وەزیرە بەناوبانگەکەی (پسمارک) بوون، ولیەمی یەکەم تەختی شاهانەی پرۆسیای وەرگرت دوای مردنی براکەی فریدریک ولیەمی چوارەم، کە بە چوست و چالاکی و هەڵبژاردنی راوێژکارانی ناوبانگی دەرکردبوو، کەبروایەکی تەواوی پێدابوون، دوای ئەوە گەلێ بایەخی بەهێزی سەربازی دا، هەر لەسەرەتای حوکمی خۆی دەستی کرد بە فراوانکردنی سوپاو دووبارە رێکخستنەوەی بەیارمەتی وەزیری بەرگری ئەلفۆن روون (Roon) وسوپا سالار ئەلفۆن مۆڵتکە (Moltke) بۆ ئەوەی وا لە سوپا بکات کەببێت بە ئامرازێکی کاریگەر بۆ پایەبەرزی
پرۆسیا، بەڵام پەرلەمانی پرۆسی ویستی بودجەی سوپا رەتبکاتەوە لەبەر ئەوەی لە رادەبەدەر بوو، لە ترسی ئەوەی ئەوکارە ببێتە هۆی گەڕانەوەی حوکمی زۆرداری و لابردنی دەستوور، لەمەودوا دەبینین کە پسمارک چۆن چارەسەری ئەم کێشە ئاڵوزەی کرد.

## پسمارک ١٨١٥ز – ١٨٩٨ز:

پسمارک لەساڵی ١٨١٥ز لەخێزانێکی پروسیای دەرەبەگی خانەدانی پابەند بەکۆنەوە لەدایک بووە، لەسەردەمی لاویدا بەلای وانە و خوێندندا نەچووە، بەڵکو لەگەڵ رابواردن و بایەخدان بە موڵکە کشتوکاڵییەکانەوە خەریک بووە زۆر توندڕەو بووە بۆ پرۆسیا، لە پەشێوییەکانی ساڵی ١٨٤٨ز – ١٨٤٩ز لەپێشەنگی بانگهێشتی کۆنەپەرستەکانەوە بوو، کەباوەڕی بەگەل و دیموکراتییەت نەبووە، بیروڕاکانی بریتی بوون لە: حوکمی پادشایەتی ڕەها (مطلق) باشترین رژێمە بۆ حکومەت و پێویست بەوە ناکات گەل داوای دەستوور بکات و بیروباوەڕی ئەنجومەنی فرانکفۆرت پڕو پووچە و ئەگەر هاتوو یەکێتی ئەڵمانیا لە دوارۆژدا بێتەدی، ئەوا دەبێت لە سەرەستی پادشای پروسیا دابێت و دەبێ خانەدان و چینی فەرمانبەرانی مەدەنی و سەربازی و کڵێسەی پرۆتستاتنی پاڵپشتی بکەن، واتا ئەڵمانیا دەبێت شێوە و شێوازی پروسیا وەربگرێت.

پـاش کپبوونـی بزووتنـەوەی ئازادیخوازانـە و گەڕانـەوەی ئەنجومەنـی فرانکفـۆرت بۆدۆخـی یەکەمجـاری، پسـمارک بـوو بەنوێنـەری پادشـای پرۆسـیا لـەو ئەنجومەنـەدا ١٨٥١ز – ١٨٥٩ز لەگـەڵ هـاورێ کۆنەپەرسـتەکانی کاری کـرد بـۆ دامرکاندنـەوەی بیروبـاوەڕی ئازادیخوازانـە لەهەمـوو لایەکـی ئەڵمانیـادا، ئالێرەدا بیروبـاوەڕی دوژمنکارانـەی دژی نەمسـا لـەدڵ و دەروونـدا جێگیـر بـووە، شـارەزاییەکی دیپلۆماسـییانەی فراوانـی وەرگـرت و توانـی بەهێمنـی و دووربینـی خـۆی وا لـە پرۆسـیا بـکات کـە لەگـەڵ نەمسـادا لـەو یەکێتییـە کۆنـەدا یەکسـان بێـت. لەسـاڵی ١٨٥٩ز بـووە باڵوێـزی پرۆسـیا لـەلای حکوومەتـی رووسـیا و لەوێـدا زۆر سەرسـام بـوو باڵوێـزی پرۆسـیا لـە لای حکوومەتـی رووسـیا و لەوێـدا زۆر سەرسـام بـوو بەحوکمـی ڕەهـا کـە قەیسـەری رووسـی لەسـەری دەڕۆیشـت. هەوڵـی بەهێزکردنـی پەیوەندییەکانـی دۆسـتانەی دەدا لەنێـوان ئـەو دوو دەوڵەتـەدا، دوایـی لەسـاڵی ١٨٦٢ز بـوو بـە باڵوێـز لای حکومەتـی فەڕەنسـا کـە پەیوەنـدی لەگـەڵ ئیمپراتـۆر ناپلیۆنـی سـێیەم بەسـت و گەلـێ شـت دەربـارەی ئـەو کابرایـە ووبیـر و بۆچوونەکانـی ئیمپراتـۆر شـارەزا بـوو. ولـەو سـاڵەدا بانـگ کـرا بۆبەرلیـن و بـوو بـە سـەرۆک وەزیـران. لـەم پایـە گرنگـە دا مایـەوە بەدرێژایـی سـاڵانی ١٨٦٢ز – ١٨٩٠ز توانـی لـەو ماوەیـەدا تخوبی (سـنووری) پرۆسـیا فـراوان بـکات و یەکێتـی ئەڵمانـی بهێنێتـە دی و زۆربـەی ئـەو بنەمایانـە دابنێـت کـە سیاسـەتی دەوڵـەت لەسـەری بەنـد بـوو تاسـاڵی ١٩١٤ز.

## بەهێزکردنی سوپا:

هـەر کـە پسـمارک پایـەی تـازەی گرتـە دەسـت پشـتگیری گشـت سیاسـەتەکانی پادشـای کـرد لـە فراوانکـردن و ڕێکخسـتنی سـوپای پرۆسـی دا، یەکەمجـار هەوڵـی دەدا پەرلەمـان قایـل بـکات بـە ڕازیبونیـان لەسـەر ئـەو بودجەیـەی کـە دایناب‌وو، بـەڵام خێـرا خۆیـان بەرامبـەر وەزیرێـک بینیـەوە کـە هیـچ شـتێک لەنیـازی ناهێنێتـە خـوارەوە، پسـمارک لێیـان دڵتەنـگ بـوو، بۆیـە بەمجـۆرە لەگەڵیـان دوا: ئەڵمانیـا بایـەخ نـادات بـە بیروبـاوەڕی ئازادیخوازانـە لـە پرۆسـیا، بەڵکـو بایـەخ دەدات بـە هێـزو دەسـەڵاتی پرۆسـیا. گیروگرفتـە مەزنەکانیشـمان بەگوتـاردان و دەنگدانـی زۆرینـە نایەتـەدی ئـا ئەمەیـە خاڵـە لاوازەکانـی سـاڵی١٨٤٨ز – ١٨٤٩ز، بەڵکـو بـە (خوێـن و ئاسـن) دێتـەدی، کاتێـک هەڵوێسـتی ئەنجوومـەن نەگـۆڕا پسـمارک گوێـی نەدایـەو دەسـتی کـرد بەکۆکردنـەوەی بـاج بەبـێ قایـل بوونـی پەرلەمـان، کاتێکیـش ناڕەزایـی بـەرز بـۆوە دژ بـە کردەوەکانـی، بۆیـە ئەویـش فشـاری خسـتە سـەر سەربەسـتی ڕۆژنامـە و بەرهەڵسـتکارانی گـرت.

# هێنانه دی یەکێتی ئەڵمانیا

پسمارک بڕوای وابوو کەپێویستە لە شەڕێکدا بەسەر نەمسادا سەربکەوێت، تا نەبێتە کۆسپ لە ڕێگای هەوڵ و کۆششی پروسیا لە پێناوی یەکێتی و سەرکردایەتی ئەڵمانیادا. بەوە ڕێگای خۆشکرد کە رووسیا و فەڕەنسا دوور بخاتەوەلەوەی کە یارمەتی نەمسا بدەن ئەگەرهاتوو شەڕێک روویدا لەنێوان نەمسا و پڕوسیادا. ئەسکەندەری دووەمی بەلای خۆیدا راکێشا کاتێک یارمەتی دا لە دامرکاندنەوەی شۆڕشی پۆڵەندە ساڵی ١٨٤٦ز، ئاگاداری ئیمپڕاتۆر ناپلیۆنی سێیەمی کرد کە فەڕەنسا شتێک لە (قەرەبوو) وەردەگرێت ئەگەر هاتوو بێ لایەن بوەستێت، ئەمە لەوکاتانە دابوو کە پڕوسیا سوپایەکی ڕێک دەخست لەسەر بنچینەی بەزۆر سەربازگرتنی گشتی و خۆ ئامادەکردن بۆجەنگ، بەڵام جەنگ لەگەڵ دانیمارکدا پێش جەنگی نەمسادا کەوت کە پسمارک ئەوەی دەویست بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانی.

### جەنگ لەگەڵ دانیمارکدا ساڵی ١٨٦٤ز:

ناوچەی شلزفیک و هۆڵشتاین (Schieswig-Holstjen) هۆی سەرەکی بوو بۆ هەڵگیرسانی ئەم جەنگە، چونکە ئەڵمانییەکان زۆربەی زۆریان پێک دەهێنا لەو دوو ناوچەیەی کەلەژێر دەسەڵاتی پادشای دانیمارکدا بوو هەرچەندە کەبەشێک نەبوو لەدەوڵەتی دانیمارک، کاتێک پادشا ویستی بیخاتە پاڵ دانیمارک و بیکاتە بەشێک لێی (هەرچەندە کۆبوونەوەی فرانکفۆرت بەرهەڵستی کرد) زۆربەی ئەڵمانەکانی لەشلزفیک و هۆڵشتاین ناڕەزاییان دەربڕی. پڕوسیا و نەمساش دەستیان لەم کارە وەردا بەناوی یەکێتی ئەڵمانی و هەڵۆێستێکیان گرتە بەر کەلە هەڵوێستی دانیمارک کەمتر نەبوو. لەکاتێکدا پڕوسیا و نەمسا دەیانەویست ئەم دوو ناوچەیە بەتەواوەتی بخەنە سەر یەکێتی ئەڵمانی، دانیمارک نەیدەویست واز لە هیچ بەشێک بهێنێت ئەوەندەی پێنەچوو شەڕ لەنێوان هەردوو لا پەرەی سەند تا دانیمارک ژێرکەوت، شلزفیک و هۆڵشتاین کەوتنە ژێردەسەڵاتی پڕوسیا و نەمساوە. ئەم کێشەیە بەپەلە وەک چۆن پسمارک دەیویست وای لێهات، بوو بەهۆی ناکۆکی نێوان پڕوسیا و نەمساوە، پسمارک هەوڵی دەدا ئەم دوو ناوچەیە بخاتە سەر پڕوسیاوە، بەڵام نەمسا دەیویست هەردوو ناوچەکە بەسەربەخۆیی

لەنـاو بازنــەی یەکێتــی ئەڵمانیــادا بمێنێتــەوە ئــەو بەرواڵــەت رێکەوتنەیــان هیــچ ســودێکی نەبـوو کەدەســەڵاتی پرۆسـیا لــە شـلزفیک تێنەپــەڕی و دەســەڵاتی نەمسـا لــە هۆڵشـتاین. لەدوایـدا لـە حوزەیرانـی سـاڵی ١٨٦٦ز پسـمارک پێشـنیازی کـرد. کەگۆڕانێـک لـە یەکێتـی ئەڵمانیـادا بێنێتـەدی و نەمسـا تیایـدا دەربچێـت. هـەر لەوکاتـەدا سـوپای پرۆسـی خـۆی ئامـادەی شـەڕکرد و نەمسـا توانـی نیمچـە دەوڵەتـە بچووکەکانـی ئەڵمانـی بخاتـە پـاڵ خـۆی بـۆ بەرگـری لـە یەکێتییەکـە.

## جەنگ لەگەڵ نەمسادا و هەنگاوەنان بەرەو یەکێتی:

ئـەو شـەڕەی کـە لەنێـوان پرۆسـیا و نەمسـا روویـدا پێـی دەوترێـت شـەڕی حـەوت هەفتەکـە بەهـۆی ئـەو مـاوە کورتـەی کـە سـوپای پرۆسـی توانـی سـەرکەوتنێکی تـەواو بەســەر نەمسـادا (بەحــەوت هەفتــە) بــەدی بهێنێــت، ســوپای پرۆســی بەژمــارە زۆرو رێکخسـتنێکی تـەواو پـڕ چـەک بەناوبانـگ بـوو، هەروەهـا هەنـدێ یارمەتـی لەسـەردینیا وەرگــرت بــۆ چوونــە پــاڵ ســوپاکەی لەگــەڵ پرۆســیادا (هــەروەک پێشــتر باســمان کـرد). لەسـەرەتاوە توانـی بەسـەر بەرهەڵسـتی نیمچـە دەوڵەتەکانـی ئەڵمانیـادا زاڵ بێـت ئەمجـا شـکانی سـوپای نەمسـاوی لە**جەنگی سـادوا** (sadowa)ی یەکلاکـەرەوە لـە تەمـووزی سـاڵی ١٨٦٦ز لەئەنجامـی ئەمـەدا رێکەوتننامەیـەک لەنێـوان سـەرکەوتوو و ژێرکەوتـوو مۆرکـرا، پرۆسـیا ئیتـر دەسـەڵاتی بەرفـراوان بـوو لـە کاروبـاری ئەڵمانیـادا.

### گرنگترین ئەوئەنجامەی کە لەتێکشکانی نەمسادا هاتەدی لەشەڕی (حەوت هەفتە) ئەمانەیە:

١-هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی ئەڵمانیای کۆن کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کۆنگرەی ڤیەننا.

٢-جیابوونەوەی نەمسا لە ئەڵمانیا و وازهێنانی لەبوندقییە بۆ ئیتاڵیا.

٣-فراوانبوونـی تخووبـی وڵاتـی پرۆسـیا بەهێنانـە پاڵـی شـلزفیک و هۆڵشـتاین و هانۆڤەر و شـاری فرانکفـۆرت و هەنـدێ ناوچـەی دیکـە تـا وای لێهـات ژمـارەی دانیشـتووان کەخرایـە سـەر پرۆسـیا چـوار ملیـۆن و نیـو کـەس بـوون و بـەو پێیـە پرۆسـیا دوو لەسـەر سـێی هەمـوو دانیشـتوانی ئەڵمانیـاو رووبەرەکـەی گرتـەوە.

٤-بڕیـار لەسـەر یەکێتـی ویلایەتەکانـی ئەڵمانیـای باکـوور درا بەسـەرۆکایەتی پرۆسـیاو

بەڕێوەبرنی پەرلەمانێک کەپێکهاتبوو لەدوو ئەنجوومەن یەکێکیان نوێنەری میرەکانی نیمچە دەوڵەتەکانی یەکگرتوو بوون کەپێی دەوترا بەندسرات (Bundesrat). دووەمیان نوێنەری گەل بوون لەرێگای دەنگدانی گشتی بۆ نێرینەکان کەپێی دەوترا ڕایخشتاخ (Reichstag).

٥-سەپاندنی یاسای گرتنی سەربازی لەهەموو نیمچە دەوڵەتەکانی یەکێتی.

٦-داننان بەسەربەخۆیی نیمچە دەوڵەتەکانی باشووری کە ئەوانەن (باڤاریا، ورتمبۆرگ، بادن، هسە).

هەروەها دەوڵەتەکانی باشوور بڕیاریاندا کە سوپاکانیان لەژێر سەرکردایەتی پادشای پڕوسیا بێت لەکاتی هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوان پڕوسیاو هەردەوڵەتێکی دیکەدا (بەمەرجێک شەڕی بەرگری بێت)، هەر لەوکاتەدا قایل بوون بەچوونە نێو یەکێتی گومرگی پروسیەوە (زۆلفرایین). بەم جۆرە بۆمان دەرکەوێت کە سیاسەتی پسمارکی دووربین وایکرد کە ئازادیخوازان بەلای خۆیدا رابکێشێت بەبڕیاردانی پرەنسیپی دەنگدانی گشتی لەهەڵبژاردنی ئەنجومەنی رایخشتاخ کە هەرچەندە نەیهێشت ئەو ئەنجوومەنە دەسەڵاتی بەسەر کاروباری وەزارەتدا هەبێت، ئیدی پسمارک خۆیبوو بە سەرۆک وەزیران (راوێژکار) (Chancellor) ی ئەو یەکێتییە و خاوەن دەسەڵاتی یەکەم و باڵا تیایدا.

## جەنگ لەگەڵ فەڕەنساو دامەزراندنی ئیمپڕاتۆریەتی ئەڵمانیا (١٨٧٠ز - ١٨٧١ز):

پسمارک لەماوەی ئەو ساڵانەدا ١٨٦٧ز - ١٨٧٠ز بەهەموو لێزانی و زیرەکی خۆیەوە بۆ راکێشانی نیمچە دەوڵەتەکانی باشوور دڵنیا نەبوون لە سەرکردایەتی پروسیا و لەهەمان کاتیشدا لەچاوچنۆکی ناپلیۆنی سێیەم دەترسان کە پەیتا پەیتا داوای هەندێ لە (قەرەبوو) ی دەکرد دوای شەڕی حەوت هەفتە.

پسمارک ئەم دەرفەتەی قۆستەوە لە سڵەمینەوەی نیمچە دەوڵەتەکانی باشوور لە مەبەستەکانی ناپلیۆندا، ئەم دەرفەتەی بۆ هەڵکەوت کاتێک یەکێک لەخزمەکانی پادشای پڕوسیای هەڵخەڵەتاند بۆ وەرگرتنی تەختی پادشایەتی ئیسپانیا کە ئەو کاتە بێ پادشا بوون. ئەم رووداوە وایکرد کە فەڕەنسا تووڕە بێت، ناپلیۆن لەرێگای گفتوگۆوە دەستی خستە نێو ئەم کارە و زۆری نەمابوو ئەم کێشەیە کۆتایی پێ بێت کاتێک پاڵێوراوی پروسیا لەوەرگرتنی تاجی شاهانە پەشیمان بۆوە و زۆری نەمابوو کە ئەم دەرفەتە لەکیس پسمارک بچێت.

## بروسکەی ئیمز:

هاتو هاواری بیرورای گشتی فەرەنسی ناپلیۆنی ناچارکرد کە داوا لە پروسیا بکات بەڵێنێک بدات کەهیچ کەسێک لە خێزانی (هۆهنزلورن) تەختی شاهانەی ئیسپانی لەهیچ کاتێکدا وەرنەگرێت کاتێک باڵوێزی فەرەنسی ئەم داوایەی خستە بەردەم پادشای پروسیا (کەئەو کاتە لەشاری ئیمز دەحەسابییەوە) پادشا ئەمەی بەشێوەیەکی توند رەتکردەوە و بە بروسکەیەکی تەلەگراف ئاگاداری پسمارکی کرد کەئەمیش ئەم هەواڵەی بە هەلزانی و بەکەمێک دەستکاریەوە ناوەرۆکەکەی گۆری، تا وای بخاتە بەرچاوی گەلی فەرەنساوە کە باڵوێزەکەی بەجۆرێک سووک کراوە لەو دیدەنییەی پادشادا. بێزاری فەرەنسییەکان و هەڵچوونیان بەجارێک پەرەی سەند کەبووە بڵێسەیەک و ئاگری شەری هەڵگیرساند. لە تەمموزی ساڵی ١٨٧٠ز فەرەنسا بانگی شەری دا دژی پروسیا، لێرەدا نیمچە دەوڵەتەکانی باشووری ئەڵمانیا بۆیان دەرکەوت کە فەرەنسا پەلاماردەرە. ئەمەش مەبەستی پسمارک بوو، بۆیە سوپاکانیان خستە پاڵ سوپای پروسیەوە.

دەبێ ئەوەش بوترێت کەسوپای ئەڵمانی گەلێ لە سوپای فەرەنسی بەژمارە زۆرترە بەرێکخستن باشتر و پرچەک تر بوو. سەرکەوتن لەگەڵ سوپای ئەڵمانیدا یاوەری بوو لەهەموو شەرەکاندا لەئەیلولی ساڵی ١٨٧٠ز دا توانی لە**شەری سیدان** (Seadan) دا ئەو سوپایە بەدیل بگرێت کە ئیمپراتۆر ناپلیۆنی سێیەم خۆی، لەو کاتەی کە سوپاکانی ئەڵمانیا توانی گەمارۆی پاریس بدات ئەو شتە روویدا کەپسمارک دەیویست، چونکە ئەم چوار نیمچە دەوڵەتە باشووریانە لەخۆیانەوە داوای چوونە نێو یەکێتی باکووریان کرد بەم جۆرە ئەوەی ویستی هاتەدی و ئەوکاتە ناوی (یەکێتی ئەڵمانیای باکوور) گۆرا بەناوی (ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا). وەلە ١٨ی کانونی دووەمی ساڵی ١٨٧١ز پادشای پروسیا (ولیەمی یەکەم) لەهۆڵی ئاوێنەداری کۆشکی ڤرسای بوو بە ئیمپراتۆری دەوڵەتی ئەڵمانیای یەکگرتوو. دوای پەیمانێکی رێککەوتن لەنێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا مۆرکرا (**پەیمانی فرانکفۆرت لەمایسی ١٨٧١ز**). ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی بەو پێیە ناوچەی ئەلزاس و لۆرینی دەستگیر بوو لەگەڵ بژاردنی زەرەر و زیانی شەر کە (نزیکەی ٢٥٠ملیۆن دۆلار) بوو.

# بزوتنەوەی نەتەوایەتی لە نەمسا و مەجەردا

**پەیدابوونی پادشایەتی دووقۆڵی** Dual Monarchy :

لە سەرەتای ئەم بەشە باسی ئەو شۆڕشەمان کرد کە مەجەڕییەکان لەساڵی ١٨٤٨ز – ١٨٤٩ز بۆ رزگاربوون لەدەسەڵاتی نەمسادا بەرپایان کردو زانیمان چۆن ئەم شۆڕشە خوێناویە لەبەدیهێنانی سەربەخۆیدا تێکشکا، بەڵام ئەو هێزەی کەتوانی مەجەرییەکان بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە نەیتوانی زاڵ ببێت بەسەر بیروباوەڕی سەربەخۆییاندا، بۆیە بەردەوام داوای ئۆتۆنۆمیان دەکرد، بەڵام بەشێوازێکی ئاشتیانە، چونکە زانیان کە شێوازی توندوتیژی هیچ کەڵکێکیان پێ نادات، سەرکردەی ئەم رێبازە ئاشتیخوازە فرەنسیس دیاک بوو (Francis Deak) بوو، ئەو مەجەرییە زۆرزانەی کە دەورێکی زۆر دیاری هەبوو لە دڵ و دەروونی نیشتمان پەروەرەکانی، چونکە وای لێکردن کە رایان بگۆڕین دەربارەی شۆڕش. کاتێک نەمسا لەسەر دەستی پروسیا ساڵی ١٨٦٦ز ژێرکەوت. لەئەنجامی ئەوەدا ئیمپڕاتۆر جۆزیف بڕیاری (رێککەوتنامەی ساڵی ١٨٦٧ز) دا، کە مەجەڕ بەم پێیە بوو بە وڵاتێکی سەربەخۆ و خاوەن دەستوور و پەرلەمان و وەزارەتی تایبەتی خۆی لەگەڵ بەڕێوەبردنی کاروباری ناوەوەی خۆی، بەڵام پادشاکەی هەر ئیمپڕاتۆری نەمسا بووە. بەپێی رێککەوتنامەی ساڵی ١٨٦٨ز پادشایەتی دووقۆڵی لەنەمساو مەجەر پێکهات، ئەو دوو وڵاتەی کەلەژێر رکێفی یەک پادشاو نوێنەری تایبەت بەئەنجومەنی وەزیرانەوە کە چاودێری لە کاروباری دەرەوە و شەڕ و هەندێ کاروباری دارایی دەکرد و ئەو وەزیرانە بەرپرس بوون بەرامبەر بەئەنجوومەنی نوێنەران کەلە راستیدا پێکهاتبوو لە دوو لێژنەو هەریەکەیان لە شەست ئەندام پێکهاتبوو. یەکێکیان نوێنەری مەجەڕ ئەوی تریان نەمسا، بەم جۆرە مەرجییەکان خۆیان لەیەک ئاست دادەنا لەگەڵ نەمساوییەکان، وای لێهات رێککەوتنامەی ساڵی (١٨٦٧ز) بوو بە دەستووری پادشایەتی دووقۆڵی و بەردەوام مایەوە تا ساڵی ١٩١٨ز، بەدرێژایی ئەو ماوەیە بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بەردەوام بوو.

## گیروگرفتەکانی پادشایەتی دووقۆڵی:

بەڵام پەیوەندی هەردوو لایەن بێ گیروگرفت نەبوو، کە وایکرد وتوێژو ناکۆکی بهێنێتە ئاراوە، چونکە ئەو ڕێکەوتننامانەی کە لەبارەی بازرگانی، بودجە هێڵی شەمەندەفەر، هەر دە ساڵێک تازە دەبۆوە، دەرفەتێک بوو کەناکۆکی نێوان هەردوولای دووبارە دەکردەوە، ئەمە جگە لەباوەڕی نەمساوییەکان بەوەی کە ئیمپڕاتۆر نەرم بوو لەگەڵ مەجەڕییەکان لەبەشی خەرجی دەوڵەتی هاوبەش کە لەسەدا سی بوو، دوایی پارتی سەربەخۆی مەجەڕی پەیدابوو بەسەرکردایەتی (فرانسیس کۆشۆت) کوڕی لویس کۆشۆت سەرۆکی شۆڕشی (ساڵی ١٨٤٨ز)دا، ئەو پارتەی کە بەهێزکردنی سەربەخۆیی مەجەر لەکاروباری دارایی و سەربازیدا مەبەستی بوو. کۆشۆت داوای دامەزراندنی دوو بانکی نیشتمانی کرد کە یەکێکیان تایبەت بێت بە مەجەڕ و ئەویتریان تایبەت بێت بە نەمساوە لەبڕی بانکی (نەمساو مەجەڕ) کە بارەگای لە ڤییەنادا بوو، هەروەها داوای کرد کە زمانی مەجەڕی زمانی ڕەسمی بێت لەنێو سوپادا لەو بەشەی کە تایبەتە بە مەجەڕەوە، بەڵام ئیمپڕاتۆر سور بوو لەسەر مانەوەی زمانی ئەڵمانی لەنێو گشت سوپادا ئەم جۆرە ناکۆکییە هۆی ئەو شۆڕشەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لەمەجەڕ بەرپا بوو ساڵی ١٩١٨ز، کەبووە هۆی پەیدابوونی دەوڵەتی تازەی مەجەڕ (هەنگاریا)، دەوڵەتی هاوبەشیش هەشت نەتەوەی جۆربەجۆری تێدابوو، دەسەڵاتیش بەپێی ڕێکەوتنی ساڵی (١٨٦٧ز) بە دەستی مەجەریەکانەوە بوو لە مەجەر کە ژمارەیان دەگەیشتە دە ملیۆن کەس، وە بەدەستی جێرمانیەکانەوە بوو لە نەمسادا کە ژمارەیان دەگەیشتە دوانزە ملیۆن کەس، بەڵام ئەم شەش نەتەوەیەی تر ئەوا لەژێر دەستی ئەوان دابوون، وەبەهۆی دەمارگیری و چەوساندنەوەیەکی زۆر کە ئەو نەتەوە ژێردەستانە تووشی ببوون، ئەم دەوڵەتە هاوبەشە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی بەش بەش بوو لەسەر پاشماوەی ئەو دەوڵەتە چەند دەوڵەتێکی نوێ لە ئەورووپادا دامەزران.

# بەندی چوارەم

## بەشی یەکەم
## ئیستعماری نوێ لە خۆرهەڵاتی نزیکدا

**چەمکی:**

**خۆرهەڵاتی نزیک:**

بیروڕا جیاوازە لەناونانی ئەو ناوچە جوگرافییەی کەئێستا پێی دەڵێن خۆرهەڵاتی نزیک یا ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست. ئەم زاراوەیە جوگرافییەش پابەندە بە دابەشبوونی جوگرافی لەناوچەی خۆرئاوای ئاسیا و خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست، نووسەرە خۆرئاواییەکان یەکەم کەس بوون کە ئەم زاراوانەیان بەکارهێنا (خۆرهەڵاتی نزیک) ئەم زاراوەی کە فەرەنسییەکان دایان نا مەبەستیان ناوچەی خۆرهەڵاتی دەریای ناوەڕاست واتا ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی و موڵکەکانی لە کوردستان و نیشتمانی عەرەب و نیمچە دوورگەی بەلقان و نیمچە دەوڵەتەکانی دانۆب و دوورگەی قوبرس و کریت بوو، مێژوونووسە فەرەنسییەکان زاراوەی (Proche orient) واتا (خۆرهەڵاتی نزیکیان) بەکاردەهێنا لە نووسینەکانیان دەربارەی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی و مەبەستیان لەمەسەلەی (خۆرهەڵاتی نزیک). مەسەلەی دەوڵەتی عوسمانی یان مەسەلەی خۆرهەلات بوو، کەمەیدانێک بوو بۆ ناکۆکی لەنێوان رووسیای قەیسەری و فەرەنسا لەلایەک لەنێوان وەزارەتی دەرەوەی بەریتانی لەلایەکی دیکەوە، کەبەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەست بوو بە رێبازی هاوسەنگی نێوان وڵاتان لەکیشوەری ئەورووپا بەشێوەیەکی گشتی.

مێژوونووسە ئەوروپاییەکان بەشێوەیەکی گشتی بەدرێژایی سەدەی نۆزدە بایەخیان داوە بەلێکۆڵینەوە لە خۆرهەڵاتی نزیک بەپێی پەیوەندییەکانی دەرەوەی وڵاتەکانیان لەلایەک و لەلایەکی دی بەپێی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانیان، مێژوونووسە ئەوروپاییەکان بایەخیان بەو کێشانە دەدا لەپێناو دەرخستنی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بەشێوەی (پیاوە نەخۆشەکە) وەک بزوتنەوەکانی ئەرمەنی و یۆنانی، واشیان دەدایە قەڵەم

کەوا مەبەستی مرۆڤایەتی هانی داون بۆ بایەخدان بە بزوتنەوەکانی سەربەخۆیی، لەزۆرکاتدا لەژێر زەبری شەپۆلی پرۆپاگەندەی سیاسیدا بوون بۆ ڕاکێشانی ڕای گشتی، هەروەها دووپاتی گرنگی ئابووری وڵاتانی خۆرهەڵاتی نزیکان دەکردەوە وەک بوونی ئەم ناوچەیە لەسەر دووڕیانی بازرگانی جیهانی و توانای بەکارهێنانی سامانە سروشتییەکان بۆ پێداویستییەکانی کۆمپانیاو دام ودەزگاکانی ئەوروپییەکان، بۆیە هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە بیریان لەپرۆژەی بەستنی ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیک دەکردەوە بەبەرژەوەندییەکانییان لەهیندستانەوە لەرێگای کەشتیوانییەوە یان بەڕێگای هێڵی ئاسنین و نۆکەندەکانەوە.

بەم جۆرە ئەم نووسیانەی کە لەلایەنی ئەوروپاییەکانەوە دەنووسرا دەربارەی ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیک لەسەدەی نۆزدەم پابەند بوون بە بەرژەوەندییە سیاسییەکانی ئیستعمارەوە لەلایەک، لەلایەکی دی بەکێشەی قۆرخکاریی ئابوورییەوە. بەداخەوە ئەو مێژوونووسانە ئەو میللەتانەیان لەبیرکردووە کەلەو ناوچەیە دەژین لەڕووی رۆشنبیری و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رژێمە سیاسییەکانی لەمێژینەیان، ئەمە تەنیا هەر بیروبۆچوونی مێژوونووس و نووسەرەکان نەبوو، بەڵکو راپۆرتە رەسمییەکانیش کە نوێنەرە سیاسییەکان لەم ناوچانەدا بوون هەمان دەوریان بینی. ئەگەر بەڵگەنامە رەسمییەکان بکەینەوە کە کونسوڵی گشتی بەریتانیا لەبەغداو نوێنەری بەریتانیا لەمەسقەت و باڵوێزی بەریتانیا لەتاران دەبینین کە هیچ شتێکی تێدا نییە دەربارەی ژیانی دانیشتوان و پێشکەوتنی رۆشنبیری و باری تەندروستیان. نەبێت ئەو ناوچانەی کە یەکسەر لەژێردەسەڵاتی بەریتانیا دابوون لە خۆرهەڵاتی نزیکدا چارەنووسیان باشتر بووبێن لەچاو ئەو ناوچانەی کەیەکسەر لەژێردەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بوون.

## خۆرهەڵاتی ناوەڕاست

زاراوەی (خۆرهەڵاتی ناوەڕاست) زاراوەیەکی نوێیە، چونکە سەربازەکان بەتایبەتی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی بەکاریان هێنا. بۆجاری یەکەم زاراوەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە راپۆرتەکانی کۆلۆنێل هنل (Hennell) کونسڵی بەریتانی لە مەسقەتدا هات لەسەردەمی مەحەمەد عەلی و سەعید کوڕی سوڵتان، کەمەبەستیان

ناوچـەی کەنداو بـوو. ئـەم زاراوەیـە زیاتـر بـەکار هـات لـەدوای کۆنگرەی (ئاشـتبوونەوە) لـە پاریـس بەتایبەتـی دوای ئـەوەی کـە بەشـێوەیەکی فـراوان لەلایـەن ئامـۆژگاری پادشـایەتی بۆکاروبـاری نێـو دەوڵەتـان لـە لەندەن (بەسـەرکرادایەتی پرۆفیسـۆر تۆینبی) (Toenbo) بەکارهـات کەیەکـەم دەزگای خۆرئاوایـی بـوو کەبایەخـی بـە نووسـین دەدا دەربـارەی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت لەچوارچێـوەی تۆژینەوەکانـی دەربـارەی کاروبـاری نێـوان وڵاتانـدا بەشـێوەیەکی گشـتی کەمەبەسـت ناوچـەی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت بـوو کـە خۆرهەڵاتـی نزیکیشـی دەگرتـەوە- واتـە : ( ئیمپراتۆریەتـی عوسـمانی و ناوچەکانـی ژێردەسـتی بەکوردسـتانەوە) سـەرەڕای ئێـران و ئەفغانسـتان و باکـووری ئەفریقیـای عەرەبـی. ئـەم دوو زاراوەیـە هێشـتا هێشـتا هـەر روون نییـە. پەیمانگاکانـی وڵاتـە یەکگرتـووەکان کـە لـە دوای جەنگـی دووەمـی جیهانـی بایەخیـان بـەم ناوچەیـەدا ، وڵاتـی تریشـیان خسـتە سـەر وەک هینـد و پاکسـتان لەسـەر بنچینەیەکی کۆمەڵایەتـی نـەک لەسـەر بنچینەیەکـی سیاسـی. ئەگـەر سـەیری نەخشـەی خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت بکەیـن لەچـاو پەیمانـگای خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت لـە (واشـنتۆن) دەبینیـن لـەو ناوچەنـەی کەباسـمان کـرد لـەوەش تێپەڕیـوە سـیلان و پاکسـتان و ناوەڕاسـتی ئاسـیای سـۆڤیەتی (پێشـوو) دەگیرێتـەوە واتـا جیهانـی ئیسـلامی هەمـووی. کـەوا بێـت ناونانـی (خۆرهەڵاتـی نزیـک) و (خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـت) بـەزاراوەی نزیـک دەژمێردرێـت، وەکـو زاراوەی ((ناوەڕاسـتی ئاسـیا)) نییـە کـە ڕەهـا بێـت، هەندێـک لـە پسـپۆڕەکان ئەفغانستانیشـی دەخەنـە سـەر و هەندێکیـان کشـمیریش، بەشـێکیان سـوورن لەسـەر ئـەوەی کـە کۆمـارە ئیسـلامییەکانی یەکێتـی سـۆڤییێتی (پێشـوو) بەشـێکن لەناوچـەی ئاسـیای ناوەڕاسـت.

## ٢- دەوڵەتی عوسمانی پەیوەندییەکانی بەدەوڵەتانی ئەوروپاوە:

سـاڵی ١٤٥٣ز دادەنرێـت بـە خاڵێکـی گرنـگ لـە دروسـتبوونی پەیوەنـدی لەنێـوان خۆرهـەڵات و خۆرئـاوادا، چونکـە کەوتنـی شـاری قوستەنتینیە (ئەسـتانبول) لەو سـاڵەدا بەدەسـتی عوسـمانیەکان دەگای باشـووری خۆرهەڵاتی ئەوروپای بۆ هێزە سـەربازیەکانی دەوڵەتـی عوسـمانی خسـتە سەرپشـت و هێرشـەکانی لەسـەرەتای سـەدەی شـازدەمدا

بەردەوام بوو تاگەیشتە شوورکانی ڤییەننا و سنووری پۆڵەندە. نەتەوەی تورک لەوڵاتی ڕەسەنی خۆیان لەناوەڕاستی ئاسیاو خۆرئاوای چین کۆچیان کردبوو هەر لەسەرەتای سەدەی یانزەمی زایینی، دوای ئەوەی ناوەڕاستی ئاسیا و ئێرانیان داگیر کرد، سودیان لەبێهێزی دەوڵەتی عەباسیی وەرگرت بەرەو خۆرئاوا کشان و عێراق و کوردستان و ئاسیای بچووکیان داگیرکرد. تورکە سەلجوقییەکان دەورێکی گرنگیان لە جەنگەکانی خاچ دروشماندا گێڕا، مێژوونووسە ئەوروپاییەکان هێرشی عوسمانیان بەدرێژەپێدەری جەنگەکانی خاچ دروشمان دایە قەڵەم وەوایان دانا کە داگیرکردنی قوستەنتینیە سەرکەوتنێ بوو بۆ مەبەست و پلانەکانی پێشووی سەربازیی ئیسلامی.

# ئەنجامەکانی داگیرکردنی قوستەنتینیە

لەئەنجامەکانی داگیرکردنی قوستەنتینیە:

١- نەمانی ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی (ئیمپڕاتۆریەتی رۆمانی خۆرهەڵات) کەلە بەربەرەکانێی بەهێزدا بوو لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی مەزهەبی و هزریی لەنێوان کڵێسەی خۆرهەڵات و خۆرئاوادا.

٢- رێگا گرنگەکانی بازرگانی کەوتنە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی کەبە عێراق کوردستان و کەنداو تێدەپەڕێت.

٣- مەسەلەی خۆرهەڵات سەری هەڵدا، چونکە داگیرکردنی قوستەنتینیە لەلایەن عوسمانییەکانەوە یارمەتیدان حەوزی رووباری دانوپ بگرن، بۆیە هەوڵ و کۆششی دەوڵەتە ئەوروپاییەکان و گرتنی هەمووی رێگاێکی ئاشتییانەو — دیپلۆماسیانە و سەربازی و پێکهێنانی پەیمان بۆ گێڕانەوەی هێزەکانی عوسمانی بوو بۆ ئاسیای بچووک.

٤- دەسەڵاتداریی دەریای عوسمانییەکان بەسەر حەوزی دەریای ناوەڕاستدا داگیرکردنی چەند بنکەیەکی دەریایی لەکریت و قوبرس کەئەمە خۆی لەخۆی دا بووە هۆی پەیداکردنی مەترسییەکی راستەقینە بۆ نیمچە دەوڵەتەکان و شارەکانی ئیتاڵیا کە بازرگانی ئەم ناوچەیەیان قۆرخ کردبوو.

## مەسەلەی خۆرهەڵات:

عوسمانییەکان لەفراوانبوون وەستان کاتێک لەگەڵ نەمسادا پەیمانی (رەتفا تورک) یان بەست ساڵی ١٦٠٦ز، دوایی بێهێزیان بەرامبەر روسیا دەرکەوت پاش بەستنی پەیمانی کارلۆفتز(Carlovitz) ساڵی ١٦٩٩ز ((لەئەنجامی ئەو شەڕەی کە رووسیا و نەمسا بەرپایان کرد دژی دەوڵەتی عوسمانی)). لەم کاتە بەدواوە دەوڵەتەکانی دراوسێ لەسەر حیسابی دەوڵەتی عوسمانی هەر لەفراوانبووندا بوون و پێشبڕکێییان لەسەر دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەکرد، بەڵام موڵکەکانی عوسمانی ناکۆکییەکی زۆری لەنێوان دەوڵەتە گەورەکانی ئەورووپی لێ کەوتەوە، بەتایبەتی رووسیا و فەرەنسا و بەریتانیا، چونکە لەپرۆژەی دابەشکردن رێک نەدەکەوتن و هەریەکەیان بەرهەڵستی ئەوی تری دەکرد. لەو ناکۆکییەدا لەنێوان دەوڵەتانی ئەورووپی ((مەسەلەی خۆرهەڵات)) سەری هەڵدا کە دەتوانیین وای پێناسە بکەین ((ئەو کێشەیە بوو کە لەئەنجامی بێ هێزی دەوڵەتی عوسمانی سەری هەڵدا و ئەو ناکۆکییەی کەلەنێوان دەوڵەتانی ئەورووپاوە روویدا بۆ دابەشکردنی موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە)) لەم پێناسەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا مەسەلەکە (خۆرهەڵات) نەبوو لە رووی ئاڵۆزییەوە، بەڵکو مەسەلەیەکی (خۆرئاوایی) بوو، چونکە کێشەی چاوتێبڕینی دەوڵەتانی ئەورووپی بوو لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا.

## دەوڵەتی عوسمانی و نەمسا:

پەیوەندی نەمسا بە دەوڵەتی عوسمانیەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزەهەم، ئەو کاتەی کە سوپای عوسمانی بەرەو رۆژئاوا دەکشا تا گەیشتە بەردەم شوراکانی ڤیەننا و وڵاتی مەجەر ماوەی سەدەو نیوێک لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا مایەوە، دوایی بەتەواوی جێیان هێشت بەپێی پەیمانی کارلۆفتز کە وەک باسمانکرد، هاوسەنگی نێوان وڵاتان لە خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتی ئەورووپا بەدرێژایی سەدەکانی هەڤدەم و هەژدەم بەند بوو بەسێ دەوڵەتەوە کە ئەویش دەوڵەتەوە کە ئەویش دەوڵەتی عوسمانی و نەمسا و رووسیا بوو، مەبەستەکانی نەمسا بریتی بوو لە وەرگرتنەوەی ئەو ناوچانەی کە وەختی خۆی لەژێر دەسەڵاتی ئەو دابوو لە ناوەڕاستی ئەورووپا و بەلقان و زاڵبوون بەسەر هەردەوڵەتێکدا کە هێزێکی دەریایی بەهێزی هەبێت لەدەریای ناوەڕاستدا.

## دەوڵەتی عوسمانی و رووسیا:

بەڵام رووسیا وای مەبەست بوو کەوا دەریای رەش بکاتە دەریاچەیەکی رووسی و بەهیوای داگیرکردنی گەلێ بازاڕو ساغکردنەوەی ناوچەی ستراتیژی گرنگ لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا و بەتایبەتی گەرووە ئاوییەکان کە دەروازەیەکی باش بوون بەرەو ئاوی گەرمی دەریای ناوەڕاست.

## پەیمانی کوچوک کینارچی:

پەیمانی کوچوک کینارچی کە لەنێوان رووسیاو سوڵتانی عوسمانی ساڵی ١٧٧٤ز بەسترا، بەخاڵێکی گرنگ دادەنرێت لەڕووی ئەو ناکۆکییە سەربازیەی کە هەبوو لەنێوان بوترسبورگ و ئەستانبۆڵ، چونکە یەکەم پەیمان بوو کە رووسیا بەم پێیە گەلێک مافی تایبەتی دەستکەوت لە دەوڵەتی عوسمانیدا کە شوێنەواری هەر مابوو تا رووخانی هەردوو دەوڵەتەکە لەجەنگی یەکەمی جیهانی دا. و لەخوارەوەش گرنگترین ناوەڕۆکەکانی دەخەینە روو:

١- رووسیا شاری ئازۆف و دەوروبەرەکەی وەرگرت، بەو پێیە دەسەڵاتی بەسەر بەشەکانی باکووری کەناری دەریای رەشدا گرت.

٢- دەوڵەتی عوسمانی ئۆتۆنۆمی دا بە تەتەر لەدوورگەی قرم، بەمەرجێک سوڵتان بە خەلیفەی هەموو موسڵمانەکان سەیر بکرێت بەو پێیەی کە سوڵتان سەرچاوەی بەرزی ئاینی هەموو موسڵمانەکانە.

٣- رووسیا مافی نوێنەرایەتی دارایێ لە دەوڵەتی عوسمانیدا بەکردنەوەی باڵوێزخانە لە ئەستانبوڵ لەناردنی کونسڵ بۆ هەر شوێنێکی وڵاتی عوسمانی بۆ مەبەستی بازرگانی .

٤- رووسیا مافی پاراستنی پەیڕەوکەرانی ئارتۆدۆکسی پێدرا لە دەوڵەتتی عوسمانیدا.

٥- ویلایەتەکانی دانۆپ گەڕانەوە ژێر رکێفی سوڵتانەوە بە مەرجێک سوڵتان چاکسازی پێویست بکات بۆ بەڕێوەبردنیان.

## دەوڵەتی عوسمانی و فەڕەنسا:

فەڕەنسا هەڵوێستێکی دۆستانەی هەبوو بەرامبەر ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی لەسەرەتای ناکۆکییە بەراییەکانی لەگەڵ رووسیا و نەمسا دا. ئەم هەڵوێستە نەگۆڕا تا رۆژانی ناپلیۆن کەدۆستایەتی فەڕەنسا و دەوڵەتی عوسمانی تێکدا بەداگیرکردنی میسر لە ساڵی ١٧٩٨ز.

و ئەوەی کە زانراوە پەیمانی هاوکاری ودۆستایەتی کە لەنێوان سوڵتان سولەیمانی قانوونی و فرەنسوای یەکەم ساڵی ١٥٣٥ز بەسترا بەردی بناغەی دانا بۆ مافی تایبەتی فەڕەنسییەکان لە خۆرهەڵاتی نزیکدا، چونکە هەر لە پەیمانی ١٥٣٥ز دا رێگەی کەشتیوانی ئاسان کرا بۆکەشتییەکانی فەرەنسی و سەربەستی ئاینی تەواویش درا بە فەرەنسییەکان لە وڵاتی عوسمانیدا و دادگایی نەکردنیان لەدادگاکانی عوسمانیدا.

## بەربەرەکانێی ئیمپریالیزمی لە خۆرهەڵاتی نزیک لە سەدەی نۆزدەمدا

ناوچەی خۆرهەڵاتی نزیک لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم بە ناکۆکی سەربازی و ئابووری لە نێوان دەوڵەتە ئەوروپاییە ئیمپریالیزمیەکاندا بەدی دەکرا، ئەوەش بەهۆی پێشکەوتنی پیشەسازی لەکیشوەری ئەوروپا لەلایەک و لەبەر زۆربوونی هۆیەکانی ئیمپریالیزمی نوێ و زیاتر ئاشکرا بوونی لەم ماوەیەدا لەلایەکی ترەوە، ناوچەی کەنداو توندوتیژی بەبەرەکانێی توند لەلایەن دەوڵەتە ئەوروپییەکانی ترەوە .دەتوانین ئەمە دەربخەین بە تێڕوانینێکی گشتی بەبارە رامیاریەکانی هەریەک لە دەوڵەتی عوسمانی و ئێران.

### ١- دەوڵەتی عوسمانی:

سەرەڕای بزوتنەوەی چاکسازی کە سوڵتان مەحموودی دووەم بە کارتێکردنی رووسیا و دەوڵەتە خۆرئاواییەکان بە جێی گەیاند. کەچی باری ناوخۆیی لە دەوڵەتی عوسمانی و هەرێمەکانی ژێر دەستی رووی لەچاکی نەکرد و رژێمی حوکم تیایدا هەر دوور بوو لەرێکخستنێکی دەستووری دروست.

نیشـانەکانی دووبەرەکـی پێـش ئەوکاتـە لـە ئیمپڕاتۆریەتـی عوسـمانیدا دەرکەوتبـوو. دەرکەوتنـی محمـد علـی و سـەربەخۆی لەمیسـردا و فـراوان خوازاییەکانـی لـە نیمچـە دوورگـەی عەرەبـی وڵاتـی شـام و هەڕەشـەکردنی سـەربازی راسـتەوخۆی بۆ ئەسـتانبوڵ، گرنگتریـن فاکتـەری لاوازبوونـی ئیمپراتۆریەتـی عوسـمانی بـوو لـە ڕووی سـەربازییەوە، بـەڵام وڵاتـی عـەرەب بـە (نەجـد و عەسـیر و یەمەنـەوە) لـە ئەسـتەنبۆل سـەربەخۆ بـوون و هیـچ پەیوەندییەکیـان لەگەڵیـدا نەبـوو، تەنیـا لـەڕووی باجـەوە نەبـێ، ناوچـە کوردنیشـینەکانیش زیاتـر لەژێـر دەسـەڵاتی میرنیشـنە کوردیـەکان دابـوون. والیـە بەهێزەکـەی عێـراق (مەدحـەت پاشـا) (١٨٦٩ز – ١٨٧٢ز) هەوڵـی گەڕاندنـەوەی هێـزی ئیمپڕاتۆریەتـی دا لـە خۆرهەڵاتـی نیمچـە دوورگـەی عـەرەب و کەنـارە خۆرئاواییەکانـی کەنـداو و دەسـتی دایـە هەڵمەتێکـی سـەربازی بـۆ داگیرکردنـی (ئیحسـاء و قەتیـف و نەجـد) بـەڵام لابردنـی لـە ویلایەتـی بەغـدا کۆششـی دەوڵەتـی عوسـمانی بـۆ لەناوبردنـی بزوتنـەوەی بەرهەڵسـتی لـە نیمچـە دوورگـەی عەرەبیـدا بـێ هێـز کـرد.

هەروەهـا بەگشـتی پایـەی لـە باشـووری عێـراق و کەنـداو بـێ هێـز. کـرد، سـوڵتان عبدالحمیـد هەوڵـی راگرتنـی دەسـت تێوەردانـی بەریتانیـای لـە کاروبـاری ناوخۆیـی عێراقـدا دا، بەهـۆی لێدانـی پـڕۆژە ئابوورییەکانـی بەریتانیـاوە. دوژمنـی سـەرەکی کۆمپانیـای لینـچ (Lynch)ی بازرگانـی بـوو کـە کەشـتییەکانی دەسـتیان بەسـەر بازرگانـی عێـراق لـە رووبـاری دیجلـەدا گرتبـوو، هەروەهـا لـە ئەسـتەنبوڵدا باڵـدا بەریتانیـای پشـتگۆی خسـت و بەپێـی توانـا خـۆی لـە رووسـیا نزیـک کـردەوە، هەروەهـا دژایەتـی هەڵوێسـتی بەریتانیـای بەئاشـکرا لـە کوێـت بەحرەیـن دا دەکـرد. بـاوەڕی وابـوو کـە کەنـاری خۆرئـاوای کەنـداو تاکـو سـنووری مەسـقت بەگشـتی لەژێـر پاراسـتنی عوسـمانییەکاندایە.

دووبەرەکـی پـەرەی سـەند لـە نێـوان سـوڵتان عبدالحمیـد و باڵوێزەکانـی بەریتانیـا لـە ئەسـتانبوڵدا. وەکـو لایـارد (Layard) و وایـت (White) دوای داگیرکردنـی خاکـی میسـر لـە لایـەن بەریتانیـا لەسـاڵی ١٨٨٢ز دا سـوڵتانی عوسـمانی وەڵامـی دەسـتدرێژیەکەی بەریتانیـای داوە بـە پڕچـەک کردنـی ناوچـەی (کەنـداوی عەرەبـی) و رێـگای کەشـتییە جەنگییـە بەریتانییەکانـی نـەدا بـۆ نزیکبوونـەوە لـە ئـاوی هەرێمایەتـی عوسـمانی لـە کەنـداو.

هەروەها کۆسپیی خستەبەردەم کارەکانی کۆمپانیای لینچ لە عێراقدا. داگیرکردنی میسر لەلایەن بەریتانیاوە گەورەترین لێدان بوو ئاڕاستەی سوڵتان عبدالحمید کرا لە ڕووی سیاسەتی دەرەوە، تاوەکو مردنی رق و کینەی بەرامبەر بەریتانیا هەر لەدڵدا بوو، کە هەرگیز دانی بەحوکمی بەریتانیا لەمیسر نەنا.

لەساڵی ١٩٠١ز دا لەوکاتەی کە ئەڵمانیا هەوڵی راکێشانی هێڵی ئاسنی بەرلین – بەغدای دەدا بۆ کوێت، بەهاندانی سوڵتان عبدالحمید بەریتانیا ناڕەزایی خۆی بەرامبەر قبووڵکردنی دەسەڵاتی عوسمانی بەسەر کوێت دا.

## ٢- ئێران:

ئێرانیش لەم ماوەیەدا لەسەرەتای سەردەمی بێ هێزیدا بوو، چونکە ئەفغانستان و هەندێ لە هەرێمەکانی لە ئاسیای ناوەڕاست کە رووسیا دەستی بەسەر داگرتبوو لەدەستی چووبوو، هەروەها هێزی دەریایی ئێران دوای مردنی نادر شا لە کەنداو بێهێز بووبوو. هەر هەوڵێک کە ئێران لەماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم دابووی بۆکارتێکردنە سەر ئەفغانستان یان فشاری سەربازی بۆسەر سنووری باکووری خۆرئاوای هیندستان، بەریتانیا بە هێرشێکی دەریایی وەڵامی دەدایەوە، بۆ سەر کەناری باشووری ئێران. لەساڵی ١٨٢٧ز. دا کەئێران هێرشی بردە سەر ئەفغانستان و شاری (هرات) پایتەختی ئەوکاتەی داگیر کرد، هێزی دەریایی بەریتانی دەستی کردە داگیرکردنی بەندەرەکانی باشووری ئێران وەکو بوشەهر و بەندەر عەباس.

باری ناوخۆی ئێران بەرەبەرە رووی لەخراپی دەکرد بەهۆی جەنگە بەردەوامەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی کە کۆتایی پێهات دوای ناوبژی کردنی رووسیا و بەریتانیا بەبەستنی رێکەوتنامەی ئەرزەرۆمی دووەم ساڵی ١٨٤٧، ئەم رێکەوتنامەیە کە بەشێوەیەکی کۆتایی سنووری لە نێوانیان دانا. لەساڵی داهاتوو دا شا (ناصرالدين) هاتە سەر تەختی ئێران کە نزیکەی نیو سەدە لەحوکمدا بەردەوام بوو، تاکوژرانی لە ساڵی ١٨٩٦ ز دا.

پەیوەندی نێوان ئێران و بەریتانیا لەسەردەمی ئەم پادشایە خراپ بوو، چونکە جەنگی نێوان بەریتانیا و ئێران کە لە ساڵی ١٨٥٥ز- ١٨٥٦ز دا رویدا بە تەواوەتی توانای سەربازی ئێرانی لەناو برد بۆ بەرگریکردن لەخۆی و ئاواتەکانی بۆ گەڕاندنەوەی دەسەڵاتی بۆ سەر ئەفغانستانیش. لەئەنجامی ئەو جەنگەدا دەسەڵاتی حکوومەتی (تاران) بێ هێز بوو بە تایبەتی بەسەر بەشەکانی باشووری وڵاتدا کە بەهەرێمێکی دەسەڵاتی بەریتانی لە قەڵەم دەدرا.

رژێمی ئابووری و باری کارگێڕی ئێران لە سەردەمی ئەم پادشایە بە رووخانێکی خراپ ناوی دەرکردبوو. میرە براکانی لە بنەماڵەی قاجار (ئال قاجار) گشت هەرێمەکانی ئێرانیان لە نێوان خۆیاندا دابەش کردبوو. بەشە زۆرەکەی درایە برا گەورەکەی (ظل السلطان) کە فەرمانڕەوای گشت هەرێمەکانی باشووری خۆرئاوا بوو هەر لەسەردەمی ئەم میرەدا، بەریتانییەکان چوونە نێو حەوزی ڕووباری دوجەیل، کۆمپانیای (لینچ)ی بازرگانی هەمان ئەو مافە تایبەتییانەی دەستکەوت کە عێراقدا بەدەستیان هێنابوو. بەریتانیا نیازی ئەوە بوو رووباری دوجەیل بەکاربهێنێت بۆ کەشتیوانی، و هەوڵی رازیکردنی شای دابوو بۆ ئەوەی مافی تایبەتی بدا بە کۆمپانیا بەریتانییەکان بۆڕاکێشانی هێڵی ئاسن بەدرێژایی کەناری خۆرهەڵاتی کەنداو، شا دوو دڵ بوو لەقبوڵ کردنی پێشنیارەکانی بەریتانیا، چونکە رووسیای قەیسەری ئامادە بوو هەمان ئەم داخوازییە لە باکووردا پێشکەش بکات. بۆیە بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی و ئاینی لە ئێراندا گەشەی سەند دژی دەستبەسەر داگرتنی ئابووری بیانیەوە، ئەم بزوتنەوەیە گەیشتە ئەوپەری توانای لەماوەی ئەو شۆڕشەی کەگەلانی ئێرانی کردیان دژی قۆرخکردنی بەریتانیا بۆ بازرگانی توتن لە ساڵی ١٨٩٢ز دا، گەلانی ئێران داوای هەڵوەشاندنەوەی مافی تایبەتی کۆمپانیای (رۆیتەرز) یان دەکرد لەم رووەوە. لەو کاتەی کە پادشا کەمتەرخەمی نواند بۆجێبەجێکردنی داواکارییەکانی میللەت خەڵکی شۆڕشیان بەرپاکرد و رووسییەکان لایەنگیریان لێکردن بۆ بەرهەڵستی کردنی پرۆژە ئابوورییە ناوبراوەکەی بەریتانیا، پیاوە ئاینییەکان هەڵوێستێکی نیشتمانیان نواند دژی ئەم پرۆژەیە. پادشا لە

ئەنجامی فشاری گەل ناچار بوو مافی تایبەتی کۆمپانیای تووتن هەڵوەشێنێتەوە و قایل بوو کە نیو ملیۆن پاوەن بدا بە کۆمپانیاکە وەکو قەرەبوو، دەبوایە ئەم پارەیە لە بانکێکی بەریتانی یان رووسی قەرز بکات. لەئەنجامی فشاری میرەکانی بنەماڵەی فەرمانڕەوا بە تایبەتی (ظل السلطان) (نائب السلطه) کەیەکەمیان هاوپەیمانی سیاسەتی بەریتانیا بوو بە شێوەیەکی ئاشکرا، بڕوای وابوو کەمافی سەر تەخت هی ئەوەو بەریتانیا لەتوانای دایە کە یارمەتی بدات بۆ گەیشتن بە مەرام و مەبەستەکانی رامیارییەکانی، دووەمیشیان کە سەرکردەی سوپا بوو لایەنگیری سیاسەتی رووسیای دەکرد.

هۆی دووەمین بێهێز کردنی حوکمی بنەماڵەی قاجار پەیدابوونی بزووتنەوە چاکسازییاکەی (جمال الدین الافغانی) بوو کە داوای سەربەخۆیی ئێرانی دەکرد لە سیاسەتی دەرەوەدا، لەگەڵ چاککردنی باری ئابووری و کارگێڕی لەکاروبارەکانی ناوەوە و دوورخستنەوەی ئابووری ئێران لەقۆرخکاریی کۆمپانیا بیانییەکان کە خۆیان سەپاندبوو بەسەر دەزگا گشتییەکاندا بەتایبەتی هاتوچۆ، لەئەنجامی ئەو گەشتانەی (جمال الدین الافغانی) کردی بۆ هیندستان و میسر و بەریتانیا و رووسیا، یارمەتی دا لە تێگەیشتنی باری پێشکەوتنی زانستیانەو پیشەسازی و بیری کە ژیاری ئەورووپی گەیشتبوو. بەڕژێمی دەستووری ئەوروپای خۆرئاوا و ئەنجومەنەکانی نوێنەرایەتی سەرسام بوو، هەروەها بە ئەنجوومەنی نوێنەرانی ئەم دەوڵەتانە داواکارییە دەستوورییەکانی گەلانی ئێران پەرەی سەند لەدوای کوشتنی شا (ناصرالدین) لە ساڵی ١٨٩٦ز بەدەستی یەکێ لە خوێندکارانی (جمال الدین) کە ناوی (میرزا مەهدی) بوو سەردەمی جێنشینەکەی (مظفر الدین) بە بەهێزی بزووتنەوەی دەستووری لەلایەک ناوی دەرکردبوو وە لەلایەکی ترەوە بە زیادبوونی توند و تیژی و ناکۆکی لەنێوان بەریتانیا و روسیادا.

رووسیای قەیسەری تا ساڵی ١٩٠٧ز هەرخاوەن دەسەڵات بوو لە ئێراندا قایل نەبوو کە ئێران لەنێوان خۆی و بەریتانیادا دابەش بکرێت، هەروەها رازی نەبوو دان بنێت بەهەرێمی کەنداو بەتایبەتی کەنارە خۆرهەڵاتییەکەی کە بەهەرێمی دەسەڵاتی

بەریتانی دابنرێت. دەسەڵاتی رووسیا لە (تاران) دا لە ئەنجامی ئەو قەرزانەی کە رووسیا پێشکەشی بودجەی ئێرانی کرد، زیادی کرد، دیسان دەسەڵاتەکەی بەهێز بوو لە ئەنجامی خەریک بوونی بەریتانیا بە جەنگی (بویرە وە لە باشووری ئەفریقیا لەنێوان ساڵانی ١٩٠٠ز- ١٩٠٢ز دا لەتوانای رووسیادا بوو لەوماوەیەدا گشت ئێران بخاتە ژێر دەستی خۆی لەرووی سەربازییەوە ئەگەر ئارەزووی لێبوایەوە بەتایبەتی لەپاش ئەو سەرکەوتنە هەست پێکراوەی کە دیبلۆماسیەتی فەرەنسایی لە (مەسقەت)دا بەدەستی هێنابوو، کە (فەیسەڵ کوڕی تورکی) پەیمانێکی دۆستایەتی لەگەڵ فەرەنسادا مۆرکردبوو. بەبێ ئەوەی راوێژ بە حکومەتی بەریتانی لە هیندستاندا بکات بەپێی نەریتە باوەکان، بەڵام کۆتایی پێهاتنی شەڕەکانی باشووری ئەفریقیا لەبەرژەوەندی بەریتانیا و تێکشکاندنی هێزەکانی وشکایی و دەریایی رووسیا بەرامبەر یابان لەساڵی ١٩٠٥ز دا بووە هۆی رێککەوتنی بەریتانیا و رووسیا دەربارەی دابەشکردنی ئێران لە ساڵی ١٩٠٧ز دا ئەوەبوو هەرێمەکانی باشووری ئێران کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا و هەرێمەکانی باکووری ئێرانیش بۆ رووسیا حوکمی شا تەنیا لە (تاران) مایەوە، هەر لەوکاتەوە تاوەکو جەنگی یەکەمی جیهانی، رووسیا و بەریتانیا هاوکارییان لەنێواندا هەبوو لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا دژی دەسەڵاتی ئەڵمانیا لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیدا.

# بەشی دووەم
# بزووتنەوەی سەربەخۆیی لە بەلقان

## سەربەخۆیی یۆنان:

وڵاتی یۆنان گرنگترین هەرێمەکانی بەلقان بوو کە بیری نەتەوایەتی تێیدا سەری هەڵدا،چونکە گریکەکان مێژوویەکی پایە بڵندیان لە دەوڵەتی عوسمانیدا هەبوو، بووژاندنەوەی وێژە و چالاکی بازرگانی تیایدا سەری هەڵدا کە یارمەتی دا لە بەدەستهێنانی ئاواتە نیشتمانییەکانیدا. بزووتنەوەی سەربەخۆیی لە یۆناندا بە شێوەیەکی کاریگەر پەیدانەبوو تا پاش جەنگەکانی ناپلیۆن، بەشێوەیەکی روون لە شۆڕشی ساڵی ١٨٢١ز دا دیاری دا. هەندێ لە کۆمەڵە نهێنییەکانی ئاگری ئەم شۆڕشەیان هەڵگیرساند گرینگترینیان **فیلکە هیتریا** (phillkehetairia) بوو کە لە ساڵی ١٨١٤ز دامەزرا و (**ئەسکەندەر ئەبسلانتی**) ی کە ئەفسەر بوو سەرکردایەتی دەکرد، هێرشی بردە سەر هەرێمەکانی دانوپ بە هیوای یارمەتی قەیسەری رووسی بوو، بەڵام قەیسەر سەر بە رێبازە کۆنەپەرستیەکەی ئەورووپی بوو بە سەرۆکایەتی (موتەرنیخ). بەم جۆرە شۆڕشی ئەبسلانتی سەربەخۆیی خواز سەرنەکەوت بەهۆی هاوکاری هێزی کۆنەپەرستی لە رووسیا و نەمسادا، پاڵەوانی شۆڕشەکەش پاشماوەی ژیانی لە یەکێ لە بەندیخانەکانی نەمسادا بەسەربرد. یۆنان لە رووی حوکمی عوسمانیدا یاخی بووە، شۆڕشی (مۆرە) ی بەناوبانگ لە ساڵی ١٨٢٢ز- ١٨٢٧ز دەستی پێکرد و گشت بەشەکانی یۆنان و دوورگەکانی دەریای ئیجەی گرتەوە.یەکەم جار سوڵتان لە دامرکاندنەوەی سەرنەکەوت، بۆیە داوای لە محەمەد عەلی والی میسر کرد بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشەکە، محەمەد عەلی لە ساڵی ١٨٢٤ز کەشتیگەلێکی بە سەرۆکایەتی کوڕەکەی (ئیبراهیم پاشا) نارد و دوورگەی (کریت) ی داگیرکرد و کردیە بنکەیەکی دەریایی و پاشان سەربازەکانی لە (مۆرە) دابەزاند لە ساڵی ١٨٥٢ ز دا.




کەوتـە داگیرکردنـی شـوێنە قایـم کراوەکانـی وڵات و نزیـک بوو شۆڕشـەکە دابمرکێنیتەوە ئەگـەر بزووتنەوەکـە نەچووبایـە قۆناغێکـی نوێـوە، ئەویش قۆناغـی دەسـت تێوەردانـی ئەوروپـی بـوو.

## دەست تێوەردانی ئەوروپی:

وڵاتە ئەوروپییەکان ئەم جارە هەڵوێسـتێکی پشـتگیریان لە بزووتنەوەی سـەربەخۆیی بەلقانـدا وەرگـرت لەبـەر دوو هۆ:

١- هۆی کێبرکێی و فراوانخوازیی لە نێوان ئەم دەوڵەتانەو چاوتێبڕینیان لە بەلقاندا.

٢- ئـەو هەڵوێسـتە دۆسـتانەی کـە ڕای گشـتی لـە بەریتانیـا و فەرەنسـادا دەریـان بـڕی بـۆ ریسـواکردنی سیاسـەتەکانی عوسـمانی.کە شـاعیری ئینگلیـزی (لۆردبیـرۆن) پێشـڕەوی ئـەو خۆبەختکەرانـە بـوو کـە چوون بـۆ یۆنـان و لـە مەیدانـی شـەڕدا کـوژران بـۆ بەرگریکـردن لـە سـەربەخۆیی گەلـی یۆنـان.

رووسـیا و بەریتانیـا و فەرەنسا لـە سالّی ١٨٢٧ز ڕێککەوتـن کـە یۆنـان بـە ویستی خـۆی سـەربەخۆ بێـت لـە سـوڵتانی عوسـمانی لەپێنـاو دابینکردنـی بەرژەوەنـدی ئەورووپییـەکان. بڕیاریـان دا پەیمانێـک ببەسـتن و ئـەم شـەڕە ڕاوەسـتێ لـە نێـوان سـوڵتان و یۆنانیەکانـدا. کاتـێ سـوڵتان ئـەم پێشـنیارەی ڕەت کـردەوە، خێـرا ڕووسـیا و فەرەنسـا و بەریتانیـا کەشـتیگەلێکیان ڕەوانـەی دەریـای ئیجـە کرد.لـە (شـەڕی ناڤارینـۆ) (navarino) ی بەناوبانـگ کەشـتیگەلی میسـری تێکشـکا و ئیبراهیـم پاشـا ناچـار بـوو لـە یۆنـان بکشـێتەوە، هەروەهـا باوکیشـی ناچاربـوو پەیمانێکـی ئاشـتی لەگـەڵ دەوڵەتـە ئەورووپاییەکانـدا مـۆر بـکات لەگـەڵ ئـەو نائومێدیـەی کـە ڕوو بـەڕووی بـۆوە لـە لایـەن فەرەنسـای هاوپەیمانیـەوە.

## شەڕ لە نێوان رووسیا و دەوڵەتی عوسمانی:

دوژمنایەتـی لـە نێـوان رووسـیا و دەوڵەتـی عوسـمانی لـەم ماوەیـەدا گەیشـتە ئەوپـەڕی و شـەڕ لـە نێوانیانـدا لـە سـالّی ١٨٢٨ز دا هەڵگیرسـا و سـوپای رووسـی توانـی بەلقـان ببڕێـت و بگاتـە (ئەدرەنـە) و (ئەسـتانبول) یـش لـە گرتـن نزیـک بـوو ئەگـەر سـوڵتان داوای ئاشـتی نەکردایـە. پەیمانـی ئەدرنـە سـالّی ١٨٢٩ز بەسـتراو بـە گوێـرەی ئـەو پەیمانـە یۆنـان ئۆتۆنۆمـی پێـدرا دوای ئـەوەش دەوڵەتـی عوسـمانی لـە سـالّی ١٨٣٢ ز رازی بووکـە سـەربەخۆیی تـەواو بـدات بـە یۆنـان و میرئۆتـۆ (otto) دووەمیـن میـری باڤاریـا لـە هەمـان سـالّدا کـرا بـە پادشـای یۆنـان.

## سەربەخۆیی رۆمانیا:

ئـەو خەباتـە نیشـتمان پەروەریـەی کـە لـە یۆنانـدا بەرپابـوو بـۆ رزگاربـوون لـە دەسـەڵاتی عوسـمانی کاری کـردە سـەر رۆمانیـا و هـەردوو ویلایەتـی ولاکیـا و مۆڵداڤیـا یەکیـان گـرت لـە ژێـر سـەرکردایەتی میـری پێشـکەوتووخواز (ئەسـکەندەر کـوزا) کـە دەرەبەگایەتـی هەڵوەشـاندەوە و زانسـتگەی (بوخارسـت) ی دامەزرانـد، بـەڵام ئـەم چاکسـازیانە بـە دڵـی موڵکـدارە گـەورەکان نەبـوو، بۆیـە ئەسـکەندەریان ناچـار کـرد لـە سـالّی ١٨٦٦ز واز لـە تەخـت بێنـێ و میـر (شـارل) لـە شـوێنی ئـەو دابنێـن کـە لـە بنەماڵـە موڵکدارەکانـی ئەڵمانـی بـوو.

ڕۆمانیا هەروەها سربیا توانیان سەربەخۆیی تەواو لە کۆنگرەی (بەرلین) دا بە دەست بێنن،بەڵام هەرێمەکانی ئەوروپای خۆرهەڵات تاکو سەدەی بیستەم هەر لەژێر سێبەری کۆنەپەرستی و ڕژێمی پادشایەتی و پاشماوەی دەرەبەگایەتی مانەوە کە بووە هۆی دواکەوتنیان لە رووی پێشکەوتنی پیشەسازی و زانستی و دەستووریدا کە باکووری خۆرئاوای ئەوروپای گرتبۆوە .

## جەنگی قرم و پەیمانی پاریس (١٨٥٣ ز - ١٨٥٦ز )

بێگومان بێ هێز بوونی دەوڵەتی عوسمانی و تێکشکاندنی بوونە هۆی دەست تێوەردانی دەوڵەتان لە کاروباریدا و سوڵتان تێگەیشت کە پێویستە چاکسازی لە دەوڵەتەکەی بکات بە تایبەتی لە سوپادا، لەو کاتەوە سوڵتان مەحموودی دووەم ناچار بوو لەگەڵ محەمد عەلی پاشا بجەنگێ و سوڵتان مەحموود لە هەڵوەشاندنەوەی سوپای ئینکشاری و دامەزراندنی سوپایەکی نیزامی سەرکەوت ، (ڕەشید پاشا) ی سەرەک وەزیران (الصدر الاعظم) زۆر بە پەرۆش بوو بۆ ئەوەی ئەم چاکسازیانە بکرێت، چونکە پێشتر باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانی بوو لە لەندەن ئەو کارەشی یارمەتی ئەوەی دا لە نزیکەوە لە ژیانی ئەوروپا بکۆڵێتەوە و باش تێی بگا، بۆیە سووربوو لەسەر چاککردنی بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی.سوڵتان مەحموودی دووەم بە بەرنامەکەی ڕازی بوو، دواتریش سوڵتان عەبدولمەجید پێی ڕازی بوو.

### گەلاڵەنامەی خەتی شەریفی گوڵخانە:

سوڵتان عەبدولمەجید لە ساڵی ١٨٣٩ز و لە بەرامبەر پیاوە ماقوڵەکانی دەوڵەت و نوێنەرە دیبلۆماسییەکان گەلاڵەنامەی چاکسازی دەرکرد و ئەم گەلاڵەنامایە بە بەیاننامەی (خەتی شەریفی گوڵخانە) ناونرا کە تەواوی مافەکانی هاووڵاتیانی تێدا هاتبوو وەکو ئازادی و یەکسانی لە باجەکان و مافی موڵکداریەتی، هەروەها باسی ڕێکخستنی پۆلیس و سوپا و چاککردنی دادوەری تێدابوو، بەڵام ئەم چاکسازیانە جێبەجێ نەکران و بەرهەڵستیەکی توند و تیژی لە زۆر لای جیاجیا دا بەرپا کرد، وە باری هاووڵاتییە مەسیحییەکان لەو ڕووانە بوو گەلاڵەنامەی چاکسازی دەیگرێتەوە، کە بووە هۆی ڕوودانی

هەندێ گیرو گرفت و کێشە لە نێوان پیاوە ئاینییە مەسیحییەکان لە زەوییەپیرۆزەکاندا.

ئەم کێشانە لەو بابەتانە بوون کە رووسیا و فەرەنسا دەیاکردە بیانوو بۆ دەستوەردان لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی.پیاوە ئاینییە کاسۆلیکییەکان پشتیان بە فەرەنسا دەبەست و پیاوە ئاینییە ئارپۆدۆکسەک پشتیان بە رووسیا دەبەست. ناپلیۆنی سێیەم ئارەزووی فراوانخوازی و بەرزکردنەوەی پایەی فەرەنسا بوو، هەروەها رووسیابوو چاوی بڕیبوە خراپی بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانی دابەشبوونی دەوڵەتی عوسمانی لا مەبەست بوو، قەیسەری رووسیا کەوتە گفتۆگۆکردن لەگەڵ بەریتانیا بەهۆی باڵوێزەکەی لە بترۆگراد (پایەتەختی رووسیای قەیسەری) گووتی: (کە دەوڵەتی عوسمانی (پیاوێکی نەخۆشە) لە نێوان دەستماندایە پێویستە بەر لە مردنی لەسەر دابەشکردنی موڵکەکانی رێک بکەوین). بەڵام بەریتانیا بەرهەڵستی ئەم پرۆژەیەی کرد رووسیا بە تەنیا بەگژ دەوڵەتی عوسمانی چوو، لە ساڵی ١٨٥٣ز دا قەیسەری رووسیا میر (مەنشیکۆڤی) ناردەلای سوڵتان کە پاراستنی مافی مەسیحییە ئارثۆدۆکسەکان لە قودس بدرێت بە رووسیا، بەڵام (لۆرد سترافۆرد) باڵوێزی بەریتانیا لە ئەستانبول دا درکی بە مەبەستی رووسیا لەم داواکارییە کرد کە تەنیا کێشەی بەرگریکردن لە مافی ئارپۆدۆکسیەکان بگرێتەوە نەک داوای پاراستنیان بکات، سوڵتانیش بە هاندانی سترافۆرد ئەو داوایەی قبوڵ نەکرد. مەنشکۆڤ گەڕایەوە رووسیا کەوتە هەڕەشەکردنی جەنگ دژی سوڵتان.

نەمسا لەم مەسەلەیەدا بووە ناوبژیکەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە و داوای لە دەوڵەتی (بەریتانیا و فەرەنسا و رووسیا و نەمسا) کرد بۆ کۆنگرەیەک لە (ڤیەننا) دا ببەسترێت و کۆنگرەکە لەسەر ئەوە رێککەوت کە یاداشتێک ئاڕاستەی دەوڵەتی عوسمانی و رووسیا بکرێت و یاداشتەکە جەختی لە سوڵتان کردەوە کە پێویستە مافی هاوولاتییە مەسیحییەکان بپارێزێت، هەروەکو جاران چۆن لە پەیمانی کوچوک کینارچی پارێزراو بوو. رووسیا ئەم یاداشتەی رەتکردەوە و وای لە قەڵەم دا کە پاراستی هاوولاتییە مەسیحییەکان مافی خۆیەتی نەک هی سوڵتان.

## جەنگی قرم:

ڕەتکردنــەوەی یاداشــتەکە لــە لایــەن ڕووســیاوە بــووە هــۆی هەڵگیرســاندنی جەنــگ و بەریتانیــا و فەڕەنســا ســوور بــوون لەســەر بەرهەڵســتیکردنی ڕووســیا و داکۆکیکردنــی ســوڵتان بــۆ دانانــی رادەیــەک بــۆ دەســت تێوەردانــی ڕووســیا لــە کاروبــاری دەوڵەتــی عوســمانیدا. هێرشــبردنی ڕووســیا بــۆ دەوڵەتــی عوســمانی بــووە هــۆی بەشداربوونی کەشتیگەلی بەریتانــی لــە جەنگەکــەدا و لێدانــی بەنــدەری سواســتبۆل، هەروەهــا هەنــدێ شــەڕی گرنــگ لــە وشــکاییدا ڕوویــدا ڕووســیا تیایــدا شــکاو داوای ئاشــتی کــرد.

## پەیمانی پاریس:

لــە ئەنجامــی ئــەوەدا پەیمانــی پاریــس لــە ٣٠ ئــازاری ســاڵی ١٨٥٦ز لــە نێــوان ڕووســیا لــە لایــەک و بەریتانیــا و فەڕەنســا و دەوڵەتــی عوســمانی لــە لایەکــی تــرەوە بەســترا،گرنگترین ماددەکانــی ئەمانــەن:

**یەکــەم:** دەوڵەتــەکان بڕیــاری ئەوەیــان دا کــە دەوڵەتــی عوســمانی ببێتــە ئەنــدام لــە کۆڕی ئەورووپــی (concert of europe) دەبێــت ســەربەخۆیی و یەکێتــی دەوڵەتی عوســمانی دابیــن بکــەن.

**دووەم:** ســوڵتان بــەوە ڕازی بــوو کــە چاکســازی لــە وڵاتەکەیــدا بــکات و هیــچ جیاوازییەک لــە نێــوان هاووڵاتیــان لــە ئاییــن ڕەگــەزدا نــەکات و ســوڵتان بــە ئاشــکرا گەلالەنامــەی (خەتــی هۆمایــۆن) ی دەرکــرد کــە دەوڵەتــەکان پێیــان گەیشــت و کــرا بــە پاشــکۆیەک بــۆ پەیمانــی پاریــس.

**ســێیەم:** دەریــای ڕەش بەبــێ لایــەن دانــرا و بەندەرەکانــی بــەڕووی بازرگانــی گشــت وڵاتــان کرایــەوە بــە مەرجێــک بــە ڕووی کەشــتییە جەنگییــەکان دابخرێــت.

ڕێگــە لــە دەوڵەتــی عوســمانی و ڕووســیا گیــرا بــۆ دروســتکردنی ســەنگەرەکان (قەڵاکان) لــە کەنارەکانــی، هەروەهــا هێــزە جەنگییەکانــی ڕووســیا تیایــدا دیــاری کران.

**چــوارەم:** شــاری (قــارس) لــە باکــووری کوردســتان بــۆ ژێــر دەســەڵاتی دەوڵەتــی عوســمانی و نیمچــە دوورگــەی قــرم بــۆ ژێــر دەســەڵاتی ڕووســیا گەڕانــدەوە.

**پێنجەم:** ڕێی کەشتیوانی لە رووباری دانۆپ بۆ گشت دەوڵەتان دراو بەڕێوەبردنی خرایە ژێر چاودێری لیژنەیەکی نێو دەوڵەتی.

**شەشەم:** باشووری بسارابیا بۆ مۆڵداڤیا گەڕاندیەوە و هەریەک لە مۆڵداڤیا و ولاکیا دران بە سوڵتان بە مەرجێک سەربەخۆیی ناوخۆیان هەبێت و بۆ هەر یەکێکیان ئەنجوومەنێک هەبێت کە بڕیاری جۆری حوکم بدات و رووسیا وازی لە پاراستنی ئەم دوو ویلایەتە هێنا.

**حەوتەم:** سەربەخۆیی ناوخۆیی بە سربیا درا بە مەرجێک لە ژێر دەسەڵاتی سوڵتاندا بمێنێتەوە.

**هەشتەم:** وە لە پاشکۆیەکی تایبەتی سەر بە پەیمانەکەدا بڕیار درا دەوڵەتی عوسمانی گەرووەکانی بە رووی کەشتییە جەنگییەکانی گشت دەوڵەتان دابخات.

## گرنگی جەنگی قرم:

ئەوەی زانراوە کە چاککردنی رژێمی حوکم لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی دواترین شت بوو کە ئیستعماری ئەورووپی بیری لێ بکاتەوە. هەر دەوڵەتێک ئامانجێکی تایبەتی خۆی هەبوو لە بەشداربوون لە جەنگی قرمدا، چونکە فەرەنسا لە ژێر دەسەڵاتی ناپلیۆنی سێیەم هەوڵی گەڕاندنەوەیپایە بەرفراوانەکەی دەدا کە ئەویش ئامانجێکی خەیاڵی بوو پروسییەکان و ئیتاڵییەکان هەوڵی جۆرە یەکێتیەکی نەتەوایەتیان دەدا، بەڵام بەریتانییەکان دەترسان لە بیرۆکەی قەیسەرەکانی رووسیا بۆ دەست بەسەرداگرتنی گەرووە تورکییەکان، چونکە بەو جۆرە هاتوچۆیان بەسەر عێراق و کەنداو بۆ هیندستان رووبەڕووی مەترسی دەبۆوە لەو کاتەدا کە ئامانجە سەربازییەکانی بەریتانیا تەنیا بریتی بوو لە بایەخدان بە هۆکارە ستراتیژییەکان، بەڵام لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و ناوەڕاستی ئاسیا، ئامانجی دەوڵەتە ئەورووپییەکانی تر هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی و جێبەجێکردنی کۆنگرەی ڤیەننا بوو، چونکە چارەنووسی گەلانی خۆرهەڵات و ناوەڕاستی ئەورووپای بەستبۆوە بوو بەو رامیارییە کۆنەپەرستەی کە نەمساو رووسیا پەیڕەویان دەکرد، بە تایبەتی دوای ئەو لێدانەی کە ئەم دوو دەوڵەتە کۆنەپەرستە ئاراستەی بزووتنەوە میللییەکانیان کرد لە

کاتــی شۆڕشــەکانی ١٨٤٨ز دا هەروەکــو لــە فەڕەنســا و لــە ئەڵمانیــا و بەریتانیــا و ئیتاڵیـا و نەمسـاو هەتـا لـە خـودی رووسیاشـدا بڵاوبـۆوە، کـە ئامانجـی گۆڕینـی رژێمـی حکومەتـە کۆنەپەرستەکان بـوو ، هەروەهـا سـووربوون لەسـەر دانانـی دەسـتوور لەلایـەن ئـەو فەرمانـڕەوا کۆنەپەرسـتانە، هەروەهـا تێکشـکانی رووسـیای قەیسـەری لـە جەنگـی قـرم لەسـاڵی ١٨٥٦ ز دا مژدەیـەک بـوو بـۆ بـەرەی کرێـکاران و جوتیـاران و نیشـتمان پـەروەران لـە ئەوروپـادا کـە لـەم ڕووەوە بـە یەکـەم هەنگاویـان لـە قەڵـەم دەدا لەپێنـاوی ڕزگاربـوون لـە کۆتـی کۆنەپەرسـتی، لەلایەکـی تـرەوە بەشـێوەیەکی گشـتی جەنگـی قـرم لاپەڕەیەکـی ڕەش بـوو لـە مێـژووی حکومەتـە ئەوروپاییەکانـی ئەوکاتـەدا، ئەویـش لەبـەر ئـەو قوربانیدانـە مەزنانـەی کـە لەپێنـاوی ئـەو جەنگـە فراوانخوازیـەدا دران.

گرنگتریـن ئەنجامـی جەنگـی قـرم ئـەوە بـوو کـە ئەوروپـا بارێکـی گۆڕانـکاری بەخۆیـەوە بینـی، مەبەستیشـمان ئەوەیـە کـە میللەتـان دەسـتیان کـرد بـە داواکاری بـۆ گۆڕینـی جـۆری حوکـم لــە وڵاتەکەیانــدا و ڕزگاربــوون لــە حوکمــی ڕەهــا و پێدانــی ئــەو دەســتوورانەی کــە مــاف و ئەرکەکانیــان دیــاری دەکات.

**ماوەی ١٨٥٩ز- ١٨٧١ز ئەمانەی بەخۆیەوە دی:**

١- دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی نوێی ئەڵمانی.

٢- دەوڵەتێکی یەکگرتوو لە ئیتاڵیا.

٣- پادشایەتییەکی دوو قوڵی لە نەمسا و مەجەردا.

٤- گۆڕانکاری گرنگ لە رووسیادا.

٥- شــەڕی ناوخــۆ و ســەرکەوتنی ویلایەتەکانــی باکــوور بەســەر باشــوور لــەو ویلایەتــە یەکگرتووەکانــی ئەمەریــکا.

٦- هاتنەدی یەکێتی کەنەدا.

٧- بوژانەوە نوێیەکەی یابان و کارتێکردنی بە شارستانێتی خۆرئاوایی.

هەنـدێ هـۆی گرنـگ کـە پەیوەنـدی هەبـوو بـە پەرەسـەندنی هێڵـی ئاسـن و کەشـتی دەریاوانیـەوە زیاتـر کاری کـردە سـەر سـەرکەوتنی ئـەم گۆڕانانە کە یارمەتـی گۆڕینەوەی بیـروڕا و کەلوپەلـی دا، هەروەهـا هانـی گواسـتنەوەی خەڵکـی لـە شـوێنێکەوە بـۆ

شوێنێکی تردا. لەبواری رامیاریەوە دەتوانرێ بوترێت کە ئەم رواڵەتانە بە تێکڕا پێشکەوتنی بیری دەوڵەتی نەتەوەیی لێکەوتەوە.
ئەم گۆڕانانەی کە (باسکران) راستەوخۆ لە بەرژەوەندی میللەتاندا نەبوون، بەڵکو لەزۆر کاتدا ماوەی گواستنەوەی بوو کە یارمەتی میللەتانی دەدا بۆ ئەوەی بەردەوام خەبات بکەن لەپێناوی داواکارییەکانیاندا لەسەر حیسابی داگیرکەرە بیانییەکان جارێک و لەسەر حیسابی حاکمە زۆردارەکانی خۆیان جارێکی تر.

## جەنگی رووسیا- دەوڵەتی عوسمانی و کۆنگرەی بەرلین

بینیمان کە پەیمانی پاریس کە لە ئەنجامی جەنگی قرم دانرا بووە هۆی وەستاندنی دەست تێوەردانی رووسیا لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی ، هەروەها بواری بۆ سوڵتان خۆشکرد بۆ ئەنجامدانی چاکسازی پێویست لە کاروباری دەوڵەتەکەیدا.

### گەلاڵەنامەی خەتی هۆمایۆن:

لەراستیدا سوڵتان عەبدولەمجید هەوڵی دا کە سوود لەم هەلە وەربگرێت لە ١٨ی شوباتی ١٨٥٦ ز گەلاڵەنامەیەکی یاسایی دەرکرد کە بەناوی (خەتی هۆمایون) ناسرابوو، هەندێ چاکسازیی جۆربەجۆری گرتەوە لەبواری کارگێڕی و فێرکردن و کاروباری سوپاوە، بەلام هیچی لێ جێبەجێ نەکرا تەنیا ئەوە نەبێ کە بەندە بە بەهێزکردنی سوپاوە، بەلام سوڵتان (عبدالعزیز) ی جێنشینی ئەو لە سەرەتای حوکمەکەیەوە هەوڵێکی زۆری دا بۆ جێبەجێکردنی ئەو رێکخستنانە و بایەخی دا بە رێگای هاتوچۆکردن و کاروباری فێرکردن و رێکخستنی کارگێڕی و دادگای دادپەروەری دامەزراند، هەروەها (ئەنجوومەنی دەوڵەت) ی دانا کە دەسەلاتی یاسادانان و کارگێڕی پێدرا، بەلام زۆربەی ئەم چاکسازیانە بێ ئەنجام بوون. ئەم سەرنەکەوتنەییان دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ هۆ وەکو:
١- نەبوونی ژمارەیەکی پێویست لە فەرمانبەرانی بەتوانا و خوێن گەرم بۆ چاکسازی
٢- لەگەڵ کۆمەڵێک پارێزگار و کەنار گرتوو ڕووبەڕووی یەک بوونەوە کە هیچ گۆڕانێکیان نەدەویست،

٣- زۆربەی گەل کە نەزان و دواکەوتوو بوون دەوری گرنگی چاکسازیان نەدەزانی و بە پەرۆش نەبوون بۆ ئەم چاکسازیانە.سولْتانیش هیچی لا گرنگ نەبوو تەنیا ڕوالْەت نەبێ، بەتایبەتی کاتێک خەریکی تێرکردنی چێژ و ڕابواردنی خۆی بووە. دەولْەتی عوسمانی بەردەوام بوو لەسەر ڕەوتی خۆی بێ ئەوەی کەلْک لەو هەلە وەربگرێت کە بۆی لوا بەپێی پەیمانی پاریس.

ڕووسیا لە هەلی گونجاو دەگەڕا بۆ ڕزگاربوون لە کۆتی پەیمانی پاریس ،هەروەک دیمان لە جەنگی حەفتادا لەو بەندە تایبەتیانە دەرچوو کە هێزەکانی لە دەریای ڕەش پابەند دەکەی ، لەو کاتەی کە لە سالْی ١٨٧٥ ز هەندێ ئاژاوە لە بۆسنە و هەرسک ڕوویدا . ڕووسیا ئەم دەرفەتەی بەهەل زانی و ئاگری ئەو ئاژاوەیەی خۆش کرد کە لە هەندێ شوێنی تری بەلقاندا بلاوبۆوە.

دەولْەتە ئەوروپاییەکان کەوتنە دەست تێوەردان و گفتوگۆ دەستی پێکرد لەنێوان ئەلْمانیا و ڕووسیا نەمساکە ئەنجامەکەی پێشکەشکردنی یادداشتێک بوو بۆ سولْتان بە (یاداشتی ئەندراسی) ناوبرا ، سەبارەت بە کۆنت ئەندراسی وەزیری دەرەوەی نەمسا کە دینابوو. تیایدا داوای بەجێهێنانی هەندێ چاکسازیی لە بەلقان دەکرد.

بەلاّم سولْتان دەستی نەکردە ئەو چاکسازیانەی کە لە ویلایەتەکانی بەلقان دا داوای لێکرابوو، هەروەها شۆڕشگێڕەکان نەسرەوتن، بەلْکو لە شۆڕشی خۆیان بەردەوام بوون. بۆیە سولْتان هەلْمەتێکی بردە سەریان و زیانێکی گەورەی پێ گەیاندن بەتایبەتی بە بولگارییەکان کە بەتوندی و بە دلْڕەقی تێکی شکاندن. ئەمەش بووە هۆی وروژاندنی ڕای گشتی ئەورووپی لە بەریتانیا. ڕووسیا ئەمەی بەهەلزانی و قەیسەر ئەسکەندەری دووەم یاداشتێکی بۆ سولْتان ڕەوانە کرد تیایدا داوای ڕاگرتنی کوشتاری کرد یان ئەوەتا ڕووسیا نوێنەرە دبلۆماسییەکەی لە دەولْەتی عوسمانی دەکێشێتەوە سولْتان عەبدولحەمید کە لەو کاتەدا هاتبووە سەر تەخت ، بەوە ڕازی بوو وە ڕێککەوتنێک لە کۆتایی سالْی ١٨٧٦ ز بەسترا.

## پەیمانی سان ستیفانۆ:

لەوکاتــەی کـە سـولّتان عەبدولحەمیـد نوێنــەری دەوڵەتانــی قبـوڵ نەکـرد بـۆ سەرپەرشـتیکردنی کاروبـاری چاکسـازی حکومەتـی عوسـمانی لەبەرئـەوەی دەسـت وەردانـە لـە کاروبـاری ناوخۆییـدا، رووسـیا ئـەوەی بـە بیانـوو دانـا و شـەڕی بەسـەر سـولّتاندا ڕاگەیانـد پاشـان ڕۆمانیـا و سـڕبیا و مۆنتینێگـرۆ (چیـای ڕەش) چوونـە پاڵـی و سـوپاکانی رووسـیا (سـۆفیا) و (ئەدرنـە) یـان داگیرکـرد، هەروەهـا چوونـە نێـو قەفقـاس و سـولّتان ناچاربـوو داوای ئاشـتی بـکات پـاش ئـەوەی کـە بـۆی ڕوون بۆوەکـە لـە توانـای سـوپاکەیدا نییـە ڕووبـەڕووی هێرشـبەران ببێتـەوە لـە ٣ی ئـازاری ١٨٧٨ ز دا. پەیمانـی سـان سـتیفانۆ بەسـترا، بەپێـی ئـەم پەیمانـە بڕیـاری سـەربەخۆیی ڕۆمانیـا و سـڕبیا و مۆنتینێگـرۆ (چیـای ڕەش) درا، بـەڵام (بولگاریـا) لـەو زەوییانـە پێـک بێـت کـە لەنێـوان دانـۆپ و دەریـای ئیجـە شـۆڕ بۆتـەوە و سـەربەخۆیی ناوخۆیـی بدرێتـێ لەژێـر دەسـەڵاتی سـولّتاندا. رووسـیا پاتـۆم و قـارس و دبرۆجـەی داگیرکـرد، هەروەهـا سـولّتان دەسـتی دایـە چاکسـازی لـە بۆسـنە و هەرسـک بـە سەرپەرشـتی رووسـیا و نەمسـادا، بـەڵام ئەمانـە بەدڵـی وڵاتانـی ئەورووپـی نەبـوون بەتایبەتـی بەریتانیـا لـەوەی.

رووسـیا بەدەسـتی هێنـاوە لـە پەیمانـی سـان سـتیڤانۆدا، بەبیانـوی ئـەوەی کـە باسـکردنی گیروگرفتەکانـی دەوڵەتـی عوسـمانی بـۆ کـۆڕی ئەورووپـی دەگەڕێتـەوە. بۆیـە رووسـیایان ناچارکـرد بـۆ ڕازیبـوون بـە پێداچوونـەوەی پەیمانـی سـان سـتیفانۆ کـە لـە بەرلیـن دا دەبەسـترێت.

## کۆنگرەی بەرلین:

نوێنـەری دەوڵەتـان بـە سـەرۆکایەتی پسـمارک لـە بەرلینـدا کۆبوونـەوە و لەسـەر پەیمانێکی تـر ڕێککەوتـن کـە جێـی پەیمانـی سـان سـتیفانۆ بگرێتـەوە. لـە ١٣ی تەممـوزی سـاڵی ١٨٧٨ ز پەیمانـە نوێیەکـە مۆرکـرا، گرنگتریـن بەندەکانـی ئەمانەن:

یەکەم: رووسیا، بسارابیاو باتۆم و قارس و ئەردەهانی بۆخۆی برد.

دووەم: دانـی نـا بـە سـەربەخۆیی تـەواوی ڕۆمانیـا و دبرۆجـەی پێـدرا بەرامبـەر وازهێنانـی لـە بسـارابیا کـە درا بـە رووسـیا.

سێ یەم: داننان بە سەربەخۆیی سربیا و مۆنتینیگرۆ (چیای ڕەش).

چوارەم: بڕیـاردرا کـە نەمسـا هەرێمـی بۆسـنە و هەرسـک داگیـر بـکات و بەڕێـوەی ببـات بـە مەرجێـک هـەر لەژێـر دەسـەڵاتی سـولّتان بمێنێتـەوە.

پێنجـەم: سـەربەخۆیی ناوخۆیـی درا بـە بولگاریـا و هـەر لەژێـر دەسـەڵاتی سـولّتان مایـەوە (ڕۆم ئیلـی خۆرهەڵاتـی) لـێ پچێنـرا و لەپـاڵ موڵکەکانـی سـولّتاندا مایـەوە.

## پرسیارەکانی بەندی چوارەم

١- ئـەم دەسـتەواژەیە لێـک بدەوە ((شۆڕشـی پیشەسـازی پەیوەنـدی بەهێـزی هەبـوو لـەوەی کـە لـە سـەدەی نۆزدەمـدا بەریتانیـا روویـدا لـەرووی چاکسـازی کۆمەڵایەتـی و دەسـتووریەوە.))

٢- دەوری هەریـەک لـە پسـمارک و کاڤـوور راڤـە بکـە سـەبارەت بـە پێکهێنانـی یەکگرتنـی ئەڵمانیـا و یەکێتـی ئیتاڵیـا.

٣- رووە لێـک چـووەکان و جیاوازەکانـی لەبـاری (ناوخـۆ و دەرەوەی ئەڵمانیـا و ئیتاڵیـا لـە دوای سـەدەی نۆزدەمـدا روون بکـەوە).

٤- مەبەسـت لەمانە چییە؟ خۆرهەڵاتی ناوەڕاسـت، خۆرهەڵاتی نزیک، ئیمپراتۆریەتی عوسـمانی، بەلقان، کێشـەی خۆرهەڵات، مافە تایبەتییە بیانییەکان.

٥- هەڵوێسـتی ئیسـتعماری بەریتانـی لـە خۆرهەڵاتـی نزیـک لەمـاوەی نیـوەی یەکـەم لـە سـەدەی نۆزدەمدا .چۆن بـوو؟

٦- گرنگی جەنگی قرم سەبارەت بە سیاسەتی (گۆڕان لە ئەورووپادا) چییە؟

٧- بۆچـی بەریتانییـەکان یارمەتـی بزوتنـەوەی نەتەوایەتیـان لـە بولقانـدا و کەچـی لـە خۆرهەڵاتـی ناوەڕاسـتدا پشـتگوێیان خسـت؟

## چالاکی

١- لە نەخشەیەکی نەنووسراوی ئیتاڵیا قۆناغەکانی هێنانەدی یەکێتی ئیتاڵیا دەست نیشان بکە.

٢- لەسەر نەخشەیەکی نەنووسراوی (ئەڵمانیا) دا قۆناغەکانی هێنانەدی یەکێتی ئەڵمانیا دەست نیشان بکە.

٣- وتارێک دەربارەی یەکی لەو کەسە نەتەوایەتیانە بنووسە کە دەورێکی باڵای هەبووە لە هێنانەدی یەکێتی ئیتاڵیا.

# بەندی پێنجەم

## جەنگی جیهانی یەکەم

### بەشی یەکەم:

### هۆیەکانی جەنگ:

### هۆیە ناڕاستەوخۆکانی جەنگ

شتێکی ئاشکرابوو کە دابەشبوونی ئەوروپا بۆ دوو بەرەی گەورەی دژ بەیەکتر. دەبێتە هۆی پێکدادانیان بەهۆی جیاوازی بەرژەوەندییەکانی هەردوو بەرە لەلایەک و گەشەکردنی شێوەی پەیمان بەستنەکان کە دەوڵەتەکانی هەر بەرەیەک لە بەرەکان بەیەک دەبەستێتەوە لە بەرگرییەوە بۆ هێرشبردن لەلایەکی ترەوە. جیاوازی نێوان هەردوو بەرەکە فراوانتر دەبێت هەر کاتێک کە کێشەیەکی سیاسی روویدایە تاوەکو دەوڵەتەکان جەنگێکی گشتیان لەپرێکدا دەبینی، چونکە ئەوروپا لە کێشەیەک ڕزگاری نەدەبوو هەتاوەکو خۆی بەرانبەر کێشەیەکی تر دەدۆزیەوە کە لەکێشەی پێشووی ئاڵۆزتر بوو. شان بەشانی ئەم بارە و دابەشبوونی دەوڵەتان بۆ دوو بەرە کەچی هەندێ ئارەزوو و دەستووری گشتی هەبوو کاری لە کۆمەڵگەی ئەوروپی کرد و جیاوازی نێوانیانی فراوانتر کرد و ڕێگای بۆ هەڵگیرسانی ئاگری جەنگ خۆش کرد. بۆیە دەتوانین ئەم هۆیانە بەدوو بەشی سەرەکی دیاری بکەین کە هۆیە ڕاستەوخۆکان و هۆیە ناڕاستەوخۆکان.




# ئەمانەی خوارەوە کورتەی هۆیە ناڕاستەوخۆکانن

## یەکەم: هاوسەنگی نێوان وڵاتان:

ئـەم بنەمایـە پەیـڕەو کـرا بـۆ بەرگریکـردن لـە سـەربەخۆیی دەوڵەتـان و پاراسـتنی ئاشـتی لـە دەسـتدرێژیکردنی یەکـێ لـە دەوڵەتـە مەزنـەکان بەسـەر ئەوانـی دیکـەدا، بـەڵام ئەوروپـا پـاش بەسـتنی زنجیرەیـەک پەیمـان (کـە زۆربەیـان نهێنـی بـوون) بـووە جۆرێـک لـە هاوسـەنگی لـە کۆمەڵێـک پەیمـان بەسـتن کـە دەوڵەتەکانـی هـەر بەرەیـەک بەلایـەک دەبەسـتێتەوە، ئەگـەر کێشـەیەک لـە نێوانـی

یەکێک لە دەوڵەتەکانی هەر بەرەیەک لەگەڵ دەوڵەتێک لەبەرەی دووەم رووی بدابایە، هاوسەنگی نێوان وڵاتان لەق بوو،تا رادەیەکی زۆر بەبارەی سەردەمەوە بەند بوو، بەڵام ئەو بارە ئاڵۆزتر دەبوو بە تایبەتی دوای ئەوەی ئەم پەیمانانە بەرەبەرە لەشێوەی بەرگرییەوە گۆڕا بۆ شێوەیەکی تر لە چوارچێوەی هێرشبردن، بۆیە هەربەرەیەک وای دەبینی کە یەکەم بڵێسەی جەنگ لە بەرەکەی ترەوە دەست پێ بکات.

## دووەم: کێبڕکێی ئیستعماری:

پێشبرکێی ئیستعماری وەک بینیمان لە دوای شۆڕشی پیشەسازی دەستی پێکرد وەک خواستێک بۆ دۆزینەوەی بازاڕ و کەرەستەی خاویان بۆ وەبەرهێنانی سەرمایە زیادەکان، بەڵام ئەم کێبرکێیە دەوڵەتەکانی بۆ دوژمنایەتی لە بنیاتنانی ئیمپراتۆریەت رادەکێشا، هەروەها بوو بە رواڵەتێک لە رواڵەتەکانی پێشبڕکێ لە پێناوی شکۆمەندی نەتەوایەتی و ئەم پێشبڕکێیەی بۆ خراپەکاری رامیاری رادەکێشا، هەروەها پەیمان بەستنی هەر بەرەیەک بۆ جێبەجێ کردنی پرۆگرامە ئیستیعمارییەکانی بەهێز کرد.

ئەوەی ئەم پێشبرکێیە ئیستعمارییانەی بەتین کرد، ئەوەبوو کە دەوڵەتەکان وایان دادەنا کە دەستبەسەرداگرتنی داگیرکەر بەشێکە لە پرۆگرامی نەتەوەیی ، بەم جۆرە جیاوازی لە بەرژەوەندی دا پەرەی سەند و چارەسەرکردنی لەتوانادا نەبوو، هەر بەرەیەک کۆمەڵێک داخوازی هەبوو کە دەیویست بیهێنێتە دی بە پێشێلکردنی بەرەکەی تر تەنانەت ئەگەر جەنگیش بەرپابێ.

## سێیەم: پێشبڕكێ لە پڕچەك كردندا:

پـاش ئـەوەی كـە كۆنگـرەكان لـە سـنووردانان بـۆ پڕچـەك كـردن لـە كۆنگـرەی لاهـای سـاڵی ١٨٩٩ ز و كۆنگـرەی دووەم سـاڵی ١٩٠٧ ز سـەركەوتن، دەوڵەتـان دەسـتیان كـردە پێشـبركێ بـۆ پڕچـەك كردنـی سـوپاكانیان بـە تازەتریـن چەكـی كوشـندە و لەناوبـەر و وێرانـكاری و زۆربـەی بودجەكانیـان بـۆ ئـەم مەبەسـتە تەرخـان كـرد، هەروەهـا مەشـقی بەزۆریـان بەسـەر ڕۆڵەكانیـان سـەپاند بـەم جـۆرە ئەوروپـا پڕچـەك بـوو و چاوەڕێـی سـەعاتی پەلامـار و كوشـتاری دەكـرد.

## چوارەم: پڕوپاگەندە:

زۆرجـار ڕۆژنامـە هۆیـەك بـوو بـۆ وروژاندنـی ڕق و قینـە لەنێـوان وڵاتانـدا، ئەویـش بەهـۆی ئـەو دەنـگ و باسـە ناتەواوانـەی كـە بڵاویـان دەكـردەوە و ئـەو پڕوپاگەنـدە خراپانـەی بـە ئەنقەسـت دژی دەوڵەتێـك لـە دەوڵەتـان بڵاویـان دەكـردەوە ، یەكەمیـن بـۆ ئـەو پڕۆپاگەنـدە خراپانـە ئەوەبـوو كـە ڕۆژنامەكانـی نەمسـا و سـربیا دژی یەكتـر پـاش كوشـتنی ئەرشـیدۆق (فەردینانـد) بڵاویـان دەكـردەوە و ڕای گشـتی لـە جیهانـدا ژەهـراوی دەكـرد پەلـەی لـە هەڵگیرسـانی ئاگـری جەنـگ لـە نێوانیانـدا دەكـرد و لەدوایی فراوانكردنـی بـۆ جەنگێكـی جیهانـی هەنـدێ جـار ڕووی دەدا كـە حكومەتـەكان خۆیـان بـە ڕۆژنامـە هێرشـیان دەكـردە سـەر دوژمنەكانیـان، ئـەم جـۆرە هێرشـانەی ڕاگەیانـدن و پڕوپاگەنـدە خراپانـە هۆیـەك بـوون بـۆ گرژبوونـی پەیوەندییـەكان و هەڵگیرسـانی ئاگـری جەنـگ لەنێـوان میللەتانـدا.

## هۆیە ڕاستەوخۆکانی جەنگ:

### دوژمنایەتی لەنێوان نەمسا و سربیادا:

هۆیـە راسـتەوخۆکانی جەنگـی یەکەمـی جیهانـی دەگەڕێتـەوە بـۆ دوژمنایەتـی لەنێـوان نەمسـا و سـربیا دەربـارەی رەگـەزە سـلاڤییەکان لـە ئیمپراتۆریەتـی نەمسـا و مەجـەڕدا، سـربیاش ناوچەیـەک بـو بـۆ وروژاندنـی ئـەم رەگەزانـە، نەمسـا وای بینـی کـە ئـەم دەوڵەتـە لەناوبەرێـت بـۆ رزگاربـوون لـە بزووتنـەوەی سـلاڤی پێـش ئـەوەی مەترسـییەک پەیـدا بـکات.

نەمسـا دڵنیابـوو لـەوەی کـە رووسـیا یارمەتـی سـربیا دەدات ئەگـەر جەنـگ لەنێوانیان دا هەڵگیرسـا ، بۆیـە نەمسـا وای بەبـاش دەزانـی کـە جەنـگ زووتـر دەسـت پـێ بـکات پێـش ئـەوەی رووسیاسـوپاکەی ئامـادە بـکات، هەروەهـا بـاوەڕی وابـوو کـە ئەڵمانیـا یارمەتـی نەمسـا دژی رووسـیا دەدات، بۆیـە پەلەکـردن لـە چارەسـەرکردنی کێشـەی لەگـەڵ سـربیا بەچاکزانـی پێـش ئـەوەی ئـەم بـارە بگۆڕێـت و ئەوکاتـە مەسـەلەی جەنـگ ئاڵۆزتـر دەبێـت.

لەلایەکـی تـرەوە سـربیا نەمسـای بـە دوژمنـی بەهێـزی خـۆی و بـە کۆسـپی گـەورە لەڕێـی کۆمـکاری (الجامعـە) سـلاڤی دەبینـی بەتایبەتـی پـاش ئـەوەی (بۆسـنە و هەرسـک) ی لەسـاڵی ١٩٠٨ ز دا خسـتە پـاڵ خـۆی . بۆیـە سـربەکان و سـلاڤییەکان لـە بۆسـنەدا کەوتنـە (کۆشـش) بـۆ بڵاوکردنـەوەی پڕوپاگەنـدەی سـلاڤی و گەلـێ کـردەوەی تۆقاندنیـان بەرپاکـرد بـۆ ناچارکردنـی نەمسـا کـە داخوازییەکانـی سـلاف جێبەجـێ بـکات. کۆمەڵـەی (**چنگی ڕەش**) یـان کۆمەڵـەی (**یەکێتی یـان مردن**) تیایـدا پێکهـات بـۆ کوشـتنی دوژمنانـی کۆمـکاری سـلاڤی و بەجـێ هێنانـی کـردەوەی توندوتیـژ بـۆ تیرۆرکردنـی ئـەوەی بەرهەڵسـتی ئـەم بزوتنەوەیـە بـکات.

وا ڕێـک کـەوت کـە (ئەرشـیدۆق فەرەنسـیس فەردینانـد) جێگـری ئیمپڕاتۆریەتـی نەمسـا و مەجـەر و ژنەکـەی لـە ٢٨ حوزەیرانـی سـاڵی ١٩١٤ ز سـەریان لـە ویلایەتـی

بۆسـنەدا. خێـرا کۆمەڵـەی چنگـی ڕەش کەوتـە جموجـۆڵ بـۆ کوشـتنی جێگـری ئیمپراتـۆر و ژنەکـەی بـۆ بەدیهێنانـی ئـەم ئەرکـە سـێ خوێنـدکار خۆیـان بـردە پێشـەوە یەکێکیـان نـاوی پرینتزیـپ (printzip) بـوو بۆمبایەکـی هاویشـتە سـەر کـەژاوەی میـر و لەگـەڵ ژنەکەیـدا لەشـاری سـەراییڤۆ کوشـتی، ئـەم ڕووداوە هـۆی ڕاسـتەوخۆ بـوو بـۆ جەنـگ.

## کۆتایی هاتن جەنگ:

شۆڕشـگێران کە شۆڕشـی ئۆکتۆبەریان لەسـاڵی ١٩١٧ ز بەرپاکرد ڕووسـیا ئارەزووی بـە کشـانەوە لـە جەنگـی جیهانـی یەکـەم پەیداکـرد. تاکـو بتوانـن دەسـەڵاتی خۆیـان بەسـەر وڵات بسـەپێنن. جـا هاوپەیمانـەکان هەرچەنـدە دۆسـتێکیان لـە ڕۆژهـەڵات لەدەسـت چـوو، بـەڵام دۆسـتێکی تریـان لـە ڕۆژئـاوا بـۆ پەیـدا بـوو کـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانـی ئەمەریـکا بـوو، وڵاتانـی تریـش لەگـەڵ هاوپەیمـان کەوتـن تـا ژمارەیان گەیشـتە (٢٣) وڵات ئەوەبـوو ئەڵمـان ڕوو لـە دۆڕان بـوو یارمەتـی ئەمەریـکاش بـۆ هاوپەیمانـەکان بـەردەوام بـوو جـا ئەڵمانیـا ناچاربـوو کـە داوای ئاگربەسـت ، ئەوەبـوو لـە ١١-١١-١٩١٨ ڕێککەوتننامـەی نتمـەی شـەڕ وەسـتان مۆرکـرا.

# بەشی دووەم
# کۆنگرەی ئاشتبوونەوە لە پاریسدا

## ١- سەرکردەکانی کۆنگرە:

وەفدەکانی کۆنگرە لە پاریسدا کۆبوونەوە، ئەم شارە بۆ بەستنی کۆنگرەکە لەسەر داوای فەرەنسا هەڵبژێردرا پڕبوو لە هەزاران خەڵکی تر جگە لە وەفدەکان وەکو سیاسی و رۆژنامەنووس و گەڕیدەکان و وەفدی گەلانی بچووک کە بۆ پەیوەندیکردن بە پیاوانی کۆنگرە و گەیاندنی داخوازییەکانیان هاتبوون.

نوێنەری هەرچوار دەوڵەتە گەورەکە کە کۆبوونەوە ئەمانە بوون:

ولسن (ئەمەریکا) و کەلیمانسۆ (فەرەنسا) و لۆرید جۆرج (بەریتانیا) و ئۆرلاندۆ (ئیتالیا)، هەر یەکێکیان سەرۆکایەتی وەفدێک لە پیاوانی سیاسی و راوێژکاری هونەری بۆ بەشداریکردن لە دانانی بەندەکانی پەیمانەکەیان دەکرد. کاتێک کە (ئۆرلاندۆ) لە کۆنگرەکە کشاوە ئەوانی تر مانەوە و بەسێ گەورەکە ناودەبران و کاروباری کاروباری کۆنگرەیان بەڕێوەدەبرد، لەڕاستیدا زۆربەی بڕیارەکان بە ڕێککەوتنی ئەوان تەواو بوو دەوڵەتە بچووکەکان دەورێکی ئەوتۆیان لەبڕیاردانی ئەنجامی ئاشتبوونەوەدا نەبینی.

## ٢- بەستنی کۆنگرە:

وەفدەکانی کۆنگرە پێش هاتنیان بۆ پاریس بابەت و ڕاپۆرتی زۆر و پرۆژەی جیاجیایان بۆ نەخشەی تازەی ئەوروپا ئامادەکردبوو، وەفدەکانی پۆڵەندەو چیک و سلاڤیش پرۆژەی تایبەت بە دوارۆژی وڵاتەکەیان ئامادەکردبوو. یەکەم دانیشتنی کۆنگرەکە لە ١٧ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩١٩ ز دەستی پێکرد، نوێنەرانی هاوپەیمانەکان و دەوڵەتەکانی سەر بە ئەوان تیایدا ئامادەبوون. لەتوانای گشت ئەندامانی کۆنگرەکە نەبوو کە هەموو ماددەکان پەیماننامەکە دابنێن، بۆیە کۆبوونەوەکانی کۆنگرە گشتییەکە تەنیا شەش دانیشتنی لێ هاتەکایەوە، بەڵام کۆبوونەوەکانی تر تەنیا بۆ (ئەنجوومەنی بەرزی ئاشتبوونەوە) بوو (supereme pace council)، یان ئەنجوومەنی دەیی (ten counciof)

کە لە نوێنەرانی ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتاڵیا و ژاپۆن پێک هاتبوو، هەندێ لیژنەی هونەری جیاجیاش پێک هات، نوێنەرانی دەوڵەتە مەزنەکان سەرۆکایەتییان دەکرد لەو کاتەی کە دەوڵەتە گەورەکان بینیان کە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی دەیی بەهۆی زۆری ئەندامەکانییەوە نابەسترێت، بۆیە کۆبوونەوەکان تەنیا بە (ئەنجومەنی چواری) (council of four) مایەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و فەڕەنساو ئیتاڵیا پێکهاتبوو، ئەم ئەنجوومەنە (٤) جا کۆبۆوە و بڕیاری لەسەر زۆربەی ماددەکانی پەیمانەکان دا، پاش ئەوەی لیژنە جیاجیاکان ئامادەیان کردبوو ژمارەی لیژنەکان (٨٥) لیژنەی هونەری بوو، گرنگترینیان لیژنەی (کۆمەڵەی نەتەوەکان) و لیژنەی بژاردنەکان و لیژنەی ڕێکخستنی سنوور بوو، زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی دوو زمانی ڕەسمی کۆنگرەکە بوون.

## ٣- گیروگرفتەکانی کۆنگرەکە:

گیروگرفتی پەیمانە ئیستعمارییە نهێنییەکان کە هاوپەیمانەکان لەنێوان خۆیاندا بەستبوویان لەکاتی جەنگدا لە گەورەترین گیروگرفتەکانی کۆنگرەکە بوو کە سەری هەڵدا. وەکو پەیمانە نهێنییەکەی لەندەن و پەیمانی سایکس بیکۆ (sykes picot)کە تایبەتە بە خۆرهەڵاتی نزیک و دوایی گیروگرفتی چواردە بەندەکەی ولسن کە لە وتارەکەی ٨ی کانوونی دووەمی ١٩١٨ ز بڵاوی کردەوە بەپێی ئەو بەندانە ئەڵمانیا لە ٣ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩١٨ دا یادداشتەکەی بۆ ولسن ڕەوانە کرد کە تیایدا داوای ئاشتبوونەوە دەکات، گرنگترینی ئەم بەندانە :

١- هەڵوەشاندنەوەی شێوازی دیبلۆماسییەتی نهێنی و پەیڕەوکردنی دیبلۆماسیەتی ئاشکرا.

٢- سەربەستی دەریاکان .

٣- نەهێشتنی بەربەستە گومرگییەکان.

٤- چەک داماڵین تا ئەو ڕادەیەی کە ئاسایش بپارێزێت.

٥- مافی چارەنووس.

٦- چۆڵکردنی هەندێ ناوچە (وەکو بەلجیکا و ئەلزاس و لۆرین و ڕۆمانیا و سربیاو هی تریش) و پێکهێنانی هەندێ دەوڵەت تیایاندا لەبەر ڕۆشنایی مافی چارەنووس.

٧- پێکهێنانی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

کۆلۆنێل (هاوس) کە پێش ولسن بۆ کۆنگرەکە هاتبوو، وای بەدی کرد کە ڕازیکردنی فەڕەنسا و بەریتانیا بۆ قبوڵکردنی ئەم بیروباوەڕانە وەکو بنەمایەک بۆ ئاشتبوونەوە زۆر ئەستەمە، بەڵام هەڕەشەی لە هاوپەیمانەکان کرد بە کشانەوەی لە کۆنگرەکە و بەستنی ڕێککەوتنێکی تایبەتی لەنێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئەڵمانیادا، بۆیە ڕەزامەندییان هێنایە دەست. لەگەڵ ئەوەشدا چواردە بەندەکانی ولسن لەو گیروگرفتە گرنگانە بوون کە بوونە هۆی جیاوازی لە بیروباوەڕی لەنێوان ئەمەریکا و فەرەنسا و بەریتانیا.

## ٤- پەیمانی ڤرسای:

کۆنگرە ماددەکانی پەیمانی ئاشتبوونەوەی ئامادەکردبوو کە بەناوی پەیمانی ڤرسای ناودەبرێت لە ٢٨ی حوزەیرانی ساڵی ١٩١٩ ز مۆرکرا کە لە (٤٤٠) ماددە پێکهاتبوو زۆر لە پاشکۆکانی دەگرتەوە گرنگترین ناوەڕۆکەکانی:

**یەکەم:**

پێکهێنانی کۆمەڵەی نەتەوەکان: ولسن سەرۆکایەتی لیژنەی تایبەت بە ئامادەکردنی پرۆژەی (کۆمەڵەی نەتەوەکان) کرد. ئەم لێژنەیە جیاجیاکانی شی کردەوە کە بەریتانیا و فەڕەنسا و ویلایەتە یەکگرتووەکان پێشکەشیان کرد، تاکو لە دوایی دا لەسەر بەڵگە نامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان ڕێک کەوتن. لەمەدا یەکەمین بەشی پەیمانەکە پێک دێت ئەم بەڵگەنامەیە لەگەڵ پەیمانە ئاشتییەکانی تردا لێکدرا و بە یەکەمین بەشەکانی دانرا.

**دووەم:**

گۆڕینی سنووری فەڕەنسا و پاراستنی لە دژی دەستدرێژی کردنی ئەڵمانیا، فەڕەنسا خۆی لە بارێکدا بینی کە پێویست بوو هەمیشە بەرگری لێ بکرێت، چونکە تا ئەو کاتە سێ جار سوپاکانی ئەڵمانیا سنووری فەرەنسایان بەزاندبوو

بە (راین) دەپەڕینەوە بۆ داگیرکردنی. ڕێککەوتن لەسەر چەک داماڵین لە ناوچە راین دا بەشێوەیەکی هەمیشەیی ولسن و لوید جۆرج و کلیمانسۆ بەڵێنیان بەبەستنی پەیمانێکی سێ قوڵی دا لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و فەڕنسا و بەریتانیادا، وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا پەیمان دەدەنە فەڕەنسا کە یارمەتی بدەن ئەگەر لەلایەن ئەڵمانیاوە هێرشی برایە سەر، بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکان لە دوایدا ئەم پەیمانەی ئیمزا کرد و پشتگوێ خرا. ئەلزاس و لۆرین بۆ فەڕەنسا گەڕایەوە، هەروەها بەلجیکا دەستی بەسەر ئۆین (Eupen) و مالمیدی (Malmed) لە ئەڵمانیادا گرت، (سار) یش بۆ ماوەی پانزە ساڵ خرایە ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەمەرجێک دوای ئەوە بەڕاوەگرتنی گشتی چارەنووسی دیاری بکرێت ئەوەی زانراوە بەریتانیا ویستی پەلە لە کۆتایی پێهێنانی کێشەی سنووری ئەڵمانیا و فەڕەنسادا بکات، ئەویش لەبەر گرنگی بازارەکانی ئەڵمانیا بۆ پیشە سازی بەریتانیا.

**سێیەم:**

## گۆڕینی سنووری خۆرهەڵات ئەڵمانیا:

بڕیار دارا دان بەسەربەخۆیی قۆڵەندە بنرێت، بەڵام گیرو گرفتی پێدانی ڕێگایەک بۆ سەر دەریا هاتە پێش، بوونی هەندێ ناوچە کە زۆربەی دانیشتوانی ئەڵمانین لەگەڵ پۆڵەندەدا داو یەکگرتتنیان ڕێگە لەوە دەگرێ وەکو پرۆسیای خۆرهەڵاتی و دانزک. لەسەر جیاکردنەوەی پروسیای خۆرهەڵاتی لاە ئەڵمانیا بە ڕێگایەک دەیگەیەنەێتە دانزک ڕێککەوتن بە مەرجێک دانزک هەر بمێنێتەوە وەکو شارێکی سەربەست لە ژێر چاودێر کۆمەڵە نەتەوەکاندا و پۆلەندە دەسەڵاتی بەسەردا هەبێ لە رووی سیاسەتی دەرەوەدا.

بەڵام سیلیزیا ڕاوەرگرتنێکی گشتی تیادا کراو پۆلەندە بەشێکی لێ وەرگرت کە هەندێ ڕەگەز ئەڵمانی تێدا هەبوو، و لە سامانی کانزایدا دەوڵەمەندە، هەروەها ڕاوەرگرتنێک لە ویلایەتی شلزفێکی باکووری کراو گەڕاندرایەوە بۆ دانیمارک.

### چوارەم:

**بژاردن و سزاکان:**

داواکانی فەڕنسا لەم بابەتەوە زۆرتر بوو لەوانی تر بە هۆی ئەو زیانانەی کە پێی گەیشتبوو. بژاردنەکان وەکو جۆرێک لە تۆڵەسەندنەوە دانران، بەو زەرەرو زیانە کە لە جەنگی ١٨٧١ز دا دای بە ئەڵمانیا تۆڵەی بۆ خۆی بکاتەوە، هەروەها (لوید جۆرج) یش لەوەدا توندڕەو بوو بەڵام وڵسن ئەو بابەتەی لاگرنگ نەبوو. کاتێک شارەزاکان لە بڕیاردانی توانای ئەڵمنیا بۆ دانی بژاردنەکان رایان یەک نەبوو، چەندایەتی بژاردنەکان پشتگوێ خراو تەنیا باسی دانانی (لێژنەیەک بۆ بژاردنەکان) بۆ لێکۆڵینەوەی توانای ئەڵمانیا بۆ بژاردن و دوایی خەملاندنی ئەو پارەیەی کە پێی دا.

هەروەها هەندێ لە مادەکانی تایبەت بوون بەدانانی دادگایەک بۆ دادگاییگردنی (ویلیەمی دووەم) ئیمپڕاتۆریەتی ئەڵمانیا لەبەر سەرپێچیکردنی یاسا نێودەولەتیەکان و دەرچوونی لە پەیمانەکان، هەروەها یەکێ لە مادەکانی باسی دادگاییکردنی سەرکردەکان و پیاوانی سوپای ئڵمانی دەکرد ئەوانەی سەرپێچی یاساو بنەمای جەنگییان کردبوو.

### پێنجەم:

**هەندێ ماددەی تر:**

پەیمانەکە لە یەکێ لە مادەکانی دا بەرپرسی جەنگی خستە ئۆباڵی ئەڵمانیاوە، هەروەها باسی چەنک داماڵینی ئەڵمانیای کرد بەمەرجێک ژمارەی سەربازەکانی سوپاکەی لە ١٠٠٠٠٠ تێنەپەڕی.

کاتێک کە ئەندامی کۆنگرە دەربارەی داگیرگەکانی ئەڵمانیا لە ئەفریقیاو زەریای هێمن رێک کەوتن، بیری (سەرپەرشتی کردن) هێنا کایەوە، ئینتیداب (سەرپەرشتی کردن) شێوازێکی نوێ بوو لە ئیستعمار و دەیەوێ دەیەوێ داگیرگەکان بدرێتە دەست کۆمەڵەی نەتەوەکان بەمەرجێک ئەمیش هەندێ لەدەوڵەتەکان و بۆ بەڕێوەبردنیان بەناوی کۆمەڵەی نەتەوەکان ئینتداب بکات. بیری ئینتیداب نوێنەری باشووری ئەفریقیا لە مادەی (٢٢)ی کۆنگرەی ئاشت بوونەوە پێشنیاری کردو سەرۆک ولسن پەسندی کرد و خستیە نێو نێو بەڵگەنامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان.

## ٥- ڕەختەگرتن لە پەیمانی ڤرسای:

ڕەخنەیەکی زۆر دەربارەی پەیمانی ڤرسای خرایە ڕوو، بانگ نەکردنی ئەڵمانیا بۆ کۆنگترینی ئەو ڕەخنانە بوون، هەروەها ئەو بڕاردنە زۆرانەی کە بەسەریاندا سەپاندو چارەسەر نەکردنی کێشەی کەمایەتییەکان و ئەڵمانیا بانگ نەکرا بۆ کۆنگرەی بۆ گوێ گرتن لە بیروڕای، چونکە بانگکردنی وای لێ دەکات کە پەیوەست بێت بە هاوکاریکردن لەگەڵ هەوپەیمانەکان بۆ دانانی بناغەیەک بۆ ئاشتییەکی هەمیشەیی کە فەڕەنسا پاش شکستی ناپلیۆن بەشداری لە کۆنگرەی ڤیەننا کرد کە بووە هۆی ئەوەی ڕوو لە تۆڵەسەندنەوە نەکات.

هەروەها جێبەجێ کردنی بنەمای مافی چارەنووس بووە هۆی پەیدابوونی هەندێ دەوڵەتی نوێ لە ئەوروپا وەکو پۆڵەندە و چیکوسلۆڤاکیاو یوگسلاڤیا، بەڵام دیاری کردنی سنوری ئەم دەوڵەتانە بە پێی نەتەوە نەبوو، ئەمیش بووە هۆی بوونی هەندێ کەمینە لەهەریەکەیان، ئەوەی ڕق وقینی ئەڵمانیای وروژاند جیاکردنەوەی پروسیای خۆرهەلاتی بوو لە ئەڵمانیا بە دەروازەیەک بۆ ئەوەی پۆڵەندە بباتە سەر دەریاو دانزک بکرێت بە بەدەرێکی نێودەوڵەتی.

بەڵام دەبێ ئێمە ئەو بارانە هەڵسەنگێنین کە هاوپەیمانەکان تێی کەوتبوون لەکاتی بەستنی کۆنگرەی ئاشت بوونەوەدا، لە زاڵبوونی گیانی نەتەوەیی و فشاری پارتەکان بەسەر پیاوە سیاسیەکان کەپێویست بوو بە ڕەقی لەگەڵ ئەڵمانیادا بجوڵێتەوە بە جۆرێک کە ڕەختە لە کلیمانسۆ لەلایەن ڕای گشتی فەڕەنسیەوە گیرا، سەرەڕای ئەوە کە توندڕەوترین پیاوەکانی کۆنگرە بوو هەروەها ئەندامانی پەرلەمانی بەریتانی هێرشیان بردە سەر لوید جۆرج لەبەر ئەوەی زەرەر و زیانی جەنگی نەخستە سەر شانی ئەڵمانیاوە. کارەکانی کۆنگرەی ئاشتی لە پاریسدا ئەوە نەبوو کە تەنیا پەیمانی ڤرسای ئامادە بکەن بەڵکو هەندێ پەیمانی ئاشتی تر لە لەگەڵ دەوڵەتانی تر کە لەپاڵ ئەڵمانیا دەجەنگان ئامادە کرد وەک: پەیمانی (سان جێرمان) کە لەگەڵ (نەمسا) و (تریانۆ) لەکەڵ مەجەڕ، (ئوبی) لەگەڵ بلگاریاو (سیڤەر) لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی.

## ٦- ئەنجامەکانی جەنگی جیهانی:

جەنگی جیهانی یەکەم لە رۆژی ١٩١٨/١١/١١ کۆتایی هات، چەکی کوشندە و گازی ژەهراوی تێدا بەکارهێنرا، لە ئەنجامی ئەم جەنگە قورسەدا زۆر لە رژێمی دەوڵەتی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رامیاری کە پێش بەرپابوونی جەنگ باو بوون گۆڕان، چونکە ئەو میللەتانەی تووشی جەنگ بوون ئاواتیان بەدەستهێنانی سەرکەوتن بوو بەهۆی هەر نرخێک بوایە هیچ بایەخێکیان نەدەدایە بیروباوەڕی یاسایی یان دەوڵەتی یان رەوشت. ئەو ئەنجامانەی کە جەنگ دای بەدەستەوە مەزن و ترسناک بوون لە هەموو رووبەکی ژیانەوە وە دەتوانین ئەو ئەنجامانە بەمانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١- نەمانی چوار ئیمپراتۆریەتی مەزن کە ئەمانەن، (ئیمپراتۆریەتی نەمسا و مەجەر ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئیمپراتۆریەتی روسیاو ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا)، یان ئیمپراتۆرەکانی بنەماڵەی هبسبورگ بنەماڵەی عەسمانی بنەماڵەی رۆمانۆف و بنەماڵەی هۆهنزلۆرن.

٢- پەیدابوونی هەندێ دەوڵەتی نوێ لەسەر بنەمای بیروباوەڕی نەتەوایەتی و مافی چارەنووس وەکو (پۆلەنداو چیکو سلۆڤاکیا و یوگسلاڤیا و لیتوانیا و لاتیڤیاو و فنلەندا). هەرچەندە هەندێ دەوڵەتان جگە لەنەتەوەکانی خۆیاندا گەڵێکی تریشیان گرتە خۆ.

٣- روودانی گیروگرفتی ئابووری ترسناک لە زۆربەی و ڵاتانی جیهاندا، چونکە زۆربەی کارگەکان کرێکارەنیان لێ بڕان و رەوانەی مەیدانەکانی جەنگ کران و ژمارەیەکی زۆریان لێ کوژرا یان لە پەلو پۆ کەوتن. هەروەها کارگەکان گۆڕان بۆ کاری جەنگی لەجیاتی کاری ئاوەدانکردنەوە، ئەمیش بووە هۆی کەمبوونەوەیەکی بەرچاو لەکەلوپەلی بەکاربردن، نرخی کەلەوپەل بەرز بۆوە و گیروگرفتی ئابووری ئاڵۆز لەدوای جەنگ سەری هەڵدا سەرکەوتوو و دۆڕاو بە یەکسانی بە ئاگری جەنگ سووتان.

٤- گەلێ لەرژێمەکانی حوکم چ لەئەورووپا یان ئاسیا بارودۆخیان شڵەژاو تێکچوو

و هەندی کودەتای توند و تیژی لەهەندێ دەوڵەتانی جیهاندا رویدا هەروەکو لە روسیا و نەمساو مەجەڕ و تورکیا و ئێران و هی تریش. ئەوانە هەموو بوونە هۆی دامەزراندنی حوکمی دیکتاتۆری لە زۆربەی ئەم ولاتانە دا هەروەکو لە ئیتالیا و یوگسلاڤیا و پۆڵەندە و تورکیا و ئێراندا روویدا.

٥- روودانی گۆڕانێکی بەرفراوان لە رەوشت و نەریتی گشتی، چونکە خەڵک پاش چەشتنی ئەم جۆرە ئازارو بێ بەشی و کەساسییە لە رۆژانی حەنگدا، لەپاش کۆتایی پێهێنانی جەنگ هیچ لە یاساکانی رەوشت و نەریتی گشتی و رەوشت لایان گرنگ نەبوو کەبووە هۆی گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی بەرفراوان لەگشت لای جیهاندا.

## پرسیارەکانی بەندی پێنجەم

١- گرنگترین هۆیەکانی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم (ناڕاستەوخۆکان) چین؟

٢- هۆکارە ڕاستەوخۆکانی جەنگی یەکەمی جیهانی چی بوو؟

٣- ئەمانە پێناسە بکە: پرنتزیپ، کۆمەڵەی چنگی ڕەش، ئەنجومەنی چواری.

٤- بەربەرەکانی ئیستعمار گرنگترین هۆیەکانی جەنگی یەکەمی جیهانینە ئەمە راڤە بکە .

٥- رات لەم وتەیە چییە؟

(( جەنگی یەکەمی جیهان بە ئەنقست نەبوو، بەڵام دەوڵەتەکان بەبێ رای خۆیان بۆی چوون و بە تەواوەتی تێی کەوتن)).

٦- چۆن جەنگەکە کۆتایی هات؟

٧- بۆچی روسیا لە ساڵی ١٩١٧ز لەجەنگدا کشایەوە؟

٨- باسی ئەنجامەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی بکە.

٩- باسی گرنگترین پەیمانەکانی ئاشتی بکە، کە لەدوای جەنگی یەکەمی جیهان بەستران.

### چالاکی

راپۆرتێک بنووسە لەپێنج لاپەڕە کەمتر نەبێت دەربارەی یەکێ لە ئەمانەی خوارەوە:

١- شەڕی جیهانی یەکەم. ٢- پەیمانی ڤرسای

# بەندی شەشەم

## گۆڕانە گشتییەکان لەنێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیدا

## بەشی یەکەم

### گۆڕانە گشتییەکان لە ئەوروپادا:

١- دەوڵەتە نوێیەکان لە ئەوروپادا:

لەو پیروباوەڕانەی کە سەرۆک ولسن لە کۆنگرەی ئاشتبوونەوەدا لە پاریس بایەخی پێداو رەزامەندی لە کۆنگرە وەرگرت و ڕای گشتی ئەوروپاش لایەنگیری کرد. بیروباوەڕی بڕیاردانی چارەنووسی نەتەوە جیاجیاکان بوو لەناوەڕاست و خۆرهەلاتی ئەوروپادا ئەو نەتەوانەی کە لەژێر ئازارو ئەشکەنجەی نەتەوەکانی تر بوون ومەبەستیان پێشێلکردن و ونکردنی ناونیشانی ئەم نەتەوانە بوو. پەیمانەکانی ئاشتبوونەوە رێگایان بۆ دوو دەوڵەت خۆشکرد کە لەماوەی چەند سەدەیەکدا بە دابەشکراوی مابوونەوە بێنە کایەوە وەک پۆلەندە و چیکوسلۆڤاکیا.

هەروەها یارمەتی گەشەکردنی دوو دەوڵەتی تریان دا کە رۆمانیاو یوگسلاڤیان، جگە لە پەیدابوونی چوار دەوڵەتی تازە لەسەر کەناری بەڵتیک کە بەرچەساندنەوە کەوتبوون، ئەمانیش (لیتوانیا و لاتیڤیاو ئیستۆنیاو فلنەندەیە). بێگومان دامەزراندنی ئەم دەوڵەتانە ئازادکردنی گەلێک نەتەوە بوو کەلەتوانایدا نەبوو بەتەنیا خەبات بکەن بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی خۆیان.

## نەمساو مەجەڕ:

پادشـایەتی دووقۆڵـی لـە نەمسـاو مەجـەردا پـاش تێکچوونـی، نەتـەوەکان تیایـدا سـەریان هەڵدایـەوە نەمسـا لـە مەجـەر جیـا بـۆوەو دوو دەوڵەتـی سـەربەخۆیان لـێ پێکهاتـز نەمسا پەیمانێکی ئاشتی بەست بەناوی (پەیمانـی سـان جێرمـان) و هەروەهـا مەجەڕیش پەیمانـی سـەربەخۆیی بەسـت کـە (پەیمانی تریانـۆ). بەڵام ژمارەی دانیشـتوان و رووبـەری هـەردوو دەوڵەتەکـە زۆر کـەم بـۆوە، دانیشـتوانی نەمسـا نزیکـەی (٢٢) ملیۆن کـەس بـوو ژمـارەی کـەم بـۆوە بـۆ هەشـت ملیـۆن. هەروەهـا رووبەرەکەشـی زۆر کـەم بۆوەن هەنـدێ بـەش لـە مەجـەڕ پچڕێنڕا و درا بە یوگسـلاڤیا و چیکوسـلۆڤاکیا و ژمارەی دانیشـتوانی بـوو بـە حـەوت ملیـۆن کـەس. مەجـەر لەپێش جەنگدا توندترین دەوڵـەت بـوو لـە رەفتـار کردنـدا بەرامبـەر ئـەو نەتەوانـەی کـە لەژێـر دەسـەڵاتی دا بـوو، ئەمـەش بـووە هـۆی ڕق وقینـەی ئـەو نەتەوانـە لـە حوکمـی مەجـەری و ئـارەزووی ئـەو نەتەوانـە لەپێنـاو رزگاربوونیانـدا، موڵکدارە مەجەرییـە ئەرسـتۆکراتیەکان بەسـتەم و تونـدو تیـژی لەگـەڵ ئـەو جوتیارانـەی کـە مەجـەڕی نەبـوون هەڵسـەکەوتیان دەکـرد.

## چیکوسلۆڤاکیا:

چیکوسـلۆڤاکیا بە یەکگرتنی چیک و سـلۆڤاکیا هاتە کایەوە بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی دیموکراتـی هاوچـەرخ، سـێ ملیـۆن و نیـو لـە رەگەزی (جێرمانـی لـە نەمسـادا خرایـە پاڵـی، لەمـەوە بۆمـان دەردەکـەوێ کـە بنەرەتـی بێهێـزی لـە دەوڵەتـی چیکوسـلۆڤاکیادا پێکهێنانـی بـوو لـە کۆمەڵـێ رەگـەز کـە لێکدانیـان بـۆ پێکهێنانـی دەوڵەتێکـی یەکگرتـوو ئاسـان نەبـوو، لەشـەش ملیـۆن چیـک و دوو ملیـۆن سـلۆڤاک و سـێ ملیـۆن و نیو ئەڵمانی و نزیکـەی ملیۆنێـک لـە مەجـەر، لەگـەڵ ئەوەشـدا سیاسـیەکانی چیکوسـلۆڤاکیا هەوڵیـان دا بـۆ پێکهێنانـی دەوڵەتێکـی دیموکراسـی، دەوری ئاشـکرا بـۆ هەردوو سـەرکردەی بەتوانا و لێهاتـوو سـەرۆک (مازاریـک) دەگەڕێتـەوە کـە بەسـەرۆکی کۆمارەکـە هەڵبژێـردارو دکتۆر (پینـش) بـە وەزیـری دەرەوەو دوایـی بـە سـەرۆک کۆمـار پـاش مردنـی مازاریـک دانـرا، بـاری وڵاتیـش بـەرە بـەرە رووی لـە باشـی دەکـرد بـە تایبەتـی لـە رووی ئابووریـەوە تاکـو چیکـو سـلۆڤاکیا بـوو بـە کۆمارێکـی بەهێـز و هاوچـەرخ.

## یوگسلاڤیا:

سربیا لەئەنجامی جەنگ بوو بە دەوڵەتێکی فراوان، رووبەرەکەی بوو بە سێ ئەوەندەی جاران و بەدەوڵەتی یوگسلاڤیا ناودەبرا کە ناوچەی چیای رەش مونتینگرۆ و دلماسیا و بۆسنەو سلۆڤینیای (Slovenia) خرایە پاڵ، و ژمارەی دانیشتوانیش لە چوار ملیۆنەوە بۆ (١٣) ملیۆن چوو زۆربەی هەرە زۆریان یۆگسلاڤین. بەڵام هەندێ جیاوازی کۆن هەبوو بە تایبەتی لەنێوان کروات و سلۆڤینیەکان کە پێویست بوو چاوپۆشی لێبکرێت بۆ پێکهێنانی میللەتێکی یەکگرتوو، بەڵام پێکهێنانی دەوڵەتێکی یەکگرتوو کە بەڕێوەبردنەکەی ناوەندی بێت. وتووێژێکی دوورو درێژ لە پەرلەمانی یوگسلاڤی و ناکۆکیەکی پارتایەتی و روژاند، ئەمیش بووە هۆی ئەوەی کە ئەسکەندەرشا دەستوور هەڵوەشێنێتەوە و حوکمێکی دیکتاتۆری وڵات بکات پاشان لە ساڵی ١٩٣١ شێوەیەکی نوێ لە رژێمی نوێنەرایەتی بۆ حوکمی وڵات ئامادە کرد تاکو هەستی نەتەوەیی گەشە دەکات، ئەسکەندەر لە ساڵی ١٩٣٥ز لە مارسیلیا دا کوژرا و پادشایەتی لە یوگسلاڤیا خرایە ژێر چاودێری میر (پۆل).

## پۆلندە:

لەوانەیە پۆلەندە فراونترین و مەزنترین دەوڵەتی نوێ بێت کەلە ئەورووپا پاش جەنگ هاتە کایەوە. کیچشەی پۆڵەندە هەستی گشت هاوپەیمانەکانی بۆ لای خۆی راکێشا هەموویان رایان وابوو کە یارمەتی بدەن و دەوڵەتی پۆڵەندی پێک بهێنن کە چەندە جارێک لەنێوان دەوڵەتە دراوسێکاندا بەش کرا (پۆڵەندە چوار جار پێش جەنگی یەکەمی جیهانی دابەش کرا لە ساڵانی ١٧٧٢ز و ١٧٩٣ز و ١٧٩٥ز و ١٨١٥ز) وە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بۆ پێنجەمین جار لە ساڵی ١٩٣٩ز دابەش کرا هەرچەندە کە دەوڵەتێکی مەزنە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەوتۆتە نێوان سێ دەوڵەتی گەورەوە (روسیا و پروسیا ونەمسا) و سنوری سروشتی نییە، وای لێکرد کە بکەوێتە بەردەستی چاوچنۆکی ئەم دەوڵەتانە , بۆیە لە بەشێکی پێشو بینیمان چۆن کێشەی سنوور لەگەڵ ئەڵمانیا برایەوە، بە تایبەتی ئەوەی لە بەڕێوەبردنی (دانزاک) و دابەشکردنی (سیلیزیا) بە جۆرێک کە پۆڵەندە توانی دەست بەسەر شاری ڤلنا (vilna) لە لیتوانیا بگرێ و مارشال پیلسۆدیکسی ((pelsodiski کە بە تێکۆشان لەگەڵ هاوپەیمانەکان لە کاتی جەنگدا ناوی دەرکردبوو , توانی کێشەی سنووری خۆرهەڵاتی لەگەڵ روسیادا ببڕێتەوە ئەویش بە بەستنی پەیمانی ئاشتی لە (ریگا) (riga) لە ساڵی ١٩٢٠ ز دا.

بەڵام ئەو بارە دیموکراتییەی کە لە پۆڵەندە پێکهات , بواری ناکۆکی و پارتایەتی و کەسایەتی دا , ئەمیش وای لە پیلسۆدیکسی کرد کە لە ساڵی ١٩٢٦ز دا کودەتایەک بەرپابکا و رژێمی حوکم بگۆڕێت بۆ رژێمێکی دیکتانۆری. پیلسۆدیسکی لە ساڵی ١٩٣٣ ز وای بینی کە هاوکاری لەگەڵ ئەڵمانیا بکات پاش هاتنی پارتی نازی بۆ سەر حوکم و لە ساڵی ١٩٣٤ز دا پەیمانی دەستدرێژی مەکردنە لەگەڵیان بەست وحکوومەتی پۆلەندی دۆستاتییەکەی هەر لەگەڵ ئەلمانیادا بەردەوام بوو تا پەیوەندی نێوانیان دووبارە شلۆق بوو. لەو کاتەدا کێشەی دانزک و دەروازەی پۆلۆنی هاتە ئاراوە ئەو کێشەیە کە بەهۆیە ڕاستەوخۆکانی جەنگی دووەمی جیهان دادەنرێت.

## هەندێ گۆڕانکاری تر:

رۆمانیش هەندێ بەشی گرنگ لە مەجەر خرایە پاڵی , ترانسلڤانیای دەوڵەمەند بە کانزاو دارستانەکانی لێ وەرگیرا و بۆکۆڤینیای لە نەمسا وەرگرت و بسارابیاش لە روسیا. بەم جۆرە رووبەر و دانیشتوانی پاش ئەم رێکخستنە دووجار زیادبوو. بەڵام بوونی هەندێ رەگەزی جگە لە رۆمانی هەندێ کێشەی نەتەوەیی جۆراجۆری بۆ پەیداکرد , هەروەها رژێمی حوکم تیایدا لەسەر بنچینەی نەتەوەیی نەبوو دابەشکردنی زەوییەکانی دەرەبەگەکان بەسەر جوتیاران سەرەڕای بەرهەڵستیکردنی چینی ئۆرۆستۆکراتی بە گرنگترین ئیشەکانی ئەو حکومەتە تازەیە دادەنرێت.

بەشی ئیتاڵیا لە میراتی پادشایەتییە دووقۆڵیەکەی نەمسا و مەجەر کەم نەبوو , سنووری ئیتاڵیا گەیشتە گەرووی برینەر (brenner) و دەستی بەسەر سنووری سروشتی (تیرۆڵ) گرت , بەڵام لەبەر بەشداربوونی لە جەنگ لە پاڵ هاوپەیمانەکان دا پاش بەستنی پەیمانی لەندەنی نهێنی (١٦ ە نیسانی ساڵی ١٩١٥ز) داوای لەوە زیاتری دەکرد , داوای گرتنە خۆی (ئوستریا دلماسیا و فیۆمی) دەکرد , کەچی وڵسن هەروەکو لە کۆنگرەکە بینیمان رویدا , دووای ئەوەی رێککەوتن بە گفتوگۆ کۆتایی پێ هات لە نێوان ئیتاڵیا و یۆگسلاڤیادا پاش داگیرکردنی (فیۆمی) لە لایەن ئیتاڵیاوە.

بێنیتۆ مۆسۆلینی

هەروەها ئیتاڵیا شاری (زازا) ی لە دلماسیا گرتە خۆی , بەم جۆرە ئیتاڵیا نزیکەی نیو ملیۆن سلاڤی سەرەڕای چارەکە ملیۆنێک ئەڵمانی لە تیرۆڵ گۆتە خۆی.

# یەکیێتی سۆڤییەت

بەشداربوونی روسیا لە جەنگدا یارمەتی زۆری دا لە رووخانی رژێمە زۆرداریيەکەی قەیسەر , ئەوەبوو شۆڕش لە ساڵی ١٩١٧ز بەرپا بوو بۆ رزگار بوون لە دەست رژێمی قەیسەری و پێکهێنانی و پێکهێنانی حکومەتێکی کاتی بەمەبەستی دامەزراندنی رژێمێکی دیموکراتیانە لە روسیا و بەردەوان بوون لە جەنگدا , بەڵام ئەم حکومەتە بێ هێز و پارچە پارچە بوو , شۆڕشگێرە بەلشەفییەکان کە بە چالاکی و خۆراگرتن ناویان دەرکردبوو , توانیان رژێمی حوکم هەڵگەڕێننەوە و حکومەتێکی (سۆشیالیستی) دابمەزرێنن لەسەر بنەمای بیروباوەڕەکانی کارل مارکس.

بەڵام شۆرشی سۆشیلیستی کە لە روسیا بەرپا بوو نیازی وابوو رژێمی سەرمایەداری لە روسیا هەڵوەشێنێتەوە بەردەوام بێت لەسەر شۆڕش لە گشت جیهاندا بە هاوکاریکردن لەگەڵ کرێکارانی جیهان تا سەرکەون و رژێمی سەرمایەداری بشکێنین. بەڵام ئەم شۆڕشە سۆشیالستەی کە لە روسیا سەرکەوت نەیتوانی بەردەوام بێت لە دەرەوەی روسیادا سەرەڕای پێکهێنانی (نێونەتەوەیی سێیەم) بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی ئەم رێبازە لە هەموو جیهاندا. بەڵام کاتێک کە لینین لە ساڵی ١٩٢٤ ز دا کۆچی دوایی کرد و ستالین شوێنی گرتەوە , ئەم وای ئاشکرا کرد بەرنامەکەی تەنیا روسیا دەگرێتەوە , وە ئەگەر سەرکەوت ئەوا کرێکارانی جیهان هەموو لە ژێر سایەیدا یەک دەخەن و بزووتنەوەکەی روسیا دەکەن بە نموونە ئەم سیاسەتەش بووە بووە هۆی ناکۆکی لە نێوان ستالین و ترۆتسکی , چونکە ترۆتسکی داوای بەردەوامبوونی شۆڕشە جیهانییەکەی دەکرد نەک تەنیا روسیا بگرێتەوە , ئەم ناکۆکییە بووە هۆی دەرکردنی ترۆتسکی لە پارتی کۆمۆنستداو دوایی دەرکردنی لە روسیادا کە بەگەڕان لە نێوان ئەوروپا و ئەمریکادا ژیانی بەسەربرد تاکو لە ساڵی ١٩٣٩ ز دا لە مەکسیکدا کوژرا. لە بواری پەیوەندییەکانی دەرەوەدا , روسیا پەیمانی ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیا دا بەست و کۆتایی بە جەنگ هێنا تاکو لە کاروباری ناوەوەدا خۆی تەرخان بکا. دوای ئەوە

هەندێ پەیمانی دەستدرێژی نەکردنی لەگەڵ گشت دەوڵەتە دراوسێکانی بەست و پاش ئەوە دەوڵەتە گەورەکان بەرەبەرە دانیان نا بە یەکێتی سۆڤییەت وەکو ئیتاڵیا لە ساڵی ١٩٢٢ز دا بەریتانیا لە ساڵی ١٩٢٤ز دا , و دوای ئەوە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٣٤ز دا. لە ساڵی ١٩٢٨ز دا ستالین دەستی کرد بە جێبەجێکردنی پرۆژەی (پلانی پێنج) ساڵی بە مەبەستی زیادکردنی بەرهەم و فراوانکردنی پیشەسازی لە یەکێتی سۆڤیییەت دا حکومەت لە بڕینی هەنگاوی فراوان لە پیشەسازی دا پێش کۆتایی پێنج ساڵەکە سەرکەوت وە بە تایبەتی لە کاتی جێبەجێکردنی پرۆژە پێنج ساڵییەکەی دووەم ١٩٣٣ز- ١٩٣٨ز.

کاتێک کە حوکمی نازی لە ئەڵمانیا هاتە کایەوە , روسیا لە بەرەی هاوپەیمانەکان نزیک بۆوە لە ساڵی ١٩٣٤ز دا چووە ناو کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە , دووای ئەوە لە ساڵی ١٩٣٤ز دا هاوپەیمانی لەگەڵ فەڕەنسا کرد و لە ئابلۆقەکەدانی ئابووری لە دژی ئیتاڵیا بەشداری کرد بە پێی ماددەی (١٦) لە بەڵگەنامەی کۆمەڵەی نەتەوەکاندا پاش دەستدرێژی کردنەکەی بەسەر حەبەشەدا، بەڵام لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان پاش کۆنگرەی میونخ خۆی دوورە پەرێز گرت، چونکە رێگەیان نەدا هاوبەشی ئەم گۆنگرەیە بکات , لەک کارەدا هەستی بە مەترسی کرد و ئەم هەستەش پاڵی پێوەنا بۆ بەستنی پەیمانی دەستدرێژی نەکردن لەگەڵ ئەڵمانیادا لە ئابی ١٩٣١ زدا.

روسیا هەندێ هەنگاوی خێرای نا بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ هاوپەیمانەکان پاش ئەوەی هێرشی هێنرایە سەر لەلایەن هیتلەرەوە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١ز دا تا دواجارچووە ریزی نەتەوە یەکگرتووەکان و پایەی نێودەوڵەتی خۆی بەهێز کرد.

# پەیدابوونی بزووتنەوەی فاشستی لە ئیتاڵیادا

لە بەشی پێشوودا بینیمان چۆن ئیتاڵیا گشت داخوازییەکانی لە کۆنگرەی ئاشتبوونەوە لە پاریسدا بەدەست نەهێنا , هیوای وابوو هەندێ ناوچەی دەوڵەمەند بە سامانی کانزایی بەدەست بێنێ. بەڵام لە کۆنگرەکەدا بەبێ ئومێدی مایەوە , هەرچەندە لە پاڵ دەوڵەتە سەرکەوتووەکان بوو , پاش جەنگ ماوەی شپرزەی ئابووری و ناکۆکی توند لە نێوان کرێکارەکان و سەرمایەدارەکان تیایدا هاتەکایەوە هەریەک لە نیتی (niti ) و جولیتی (Giolrtti ) هەوڵی چارەسەر کردنی کێشەکەیان دا بە پێکهێنانی هەندێ وەزارەتی ئیتلافی، بەڵام ناکۆکی توند لەنێوان پارتەکان وای کرد کە وڵات لە ئاژاوەو شپرزەیی بمێنێتەوە لە هەموو روویەکەوە.

ئەدۆلف هیتلەر

لەم کاتەدا بێنیتۆ مۆسۆلینی (Benito Mussolini ) سەربەکۆمەڵێک بە ناوی فاشستەکان پەیدا بوو لەبیرو باوەڕەکەیان دا، رای سۆشیالزم و نەتەوەییان تێکەڵ کرد. بانگەوازەکەیان لەلایەن هەندێ لەپیاوانی سوپاو رۆڵەکانی چینی بورجوازیدا قبوڵکرا. یەکەمجار مۆسۆلینی ئەندامێکی پارتی سۆشیالیستی بوو. لە ساڵی ١٩١١ ز دا بەرهەڵستی حکومەتی ئیتاڵیای لە داگیرکردنی لیبیا کرد، بۆیە پێنج مانگ حوکم درا. بەڵام کاتێک کە ئاگری یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا ویستی بەشداری بکا دژی ئارەزووی پارتەکەی کە تیایدا ئەندامەو بۆیە وازی لێهێناو دەستی دایە دەرکردنی رۆژنامە بەناوبانگەکەی (گەلی ئیتاڵی popolo d, italia) دوایی بەشداری لە جەنگدا کرد و برینداربوو، گەڕایەوە بۆ دەرکردنی رۆژنامەکەی. پاش ئەوەی جەنگ کۆتایی پێهات و ئاواتەکانی ئیتاڵیا لە کۆنگرەی ئاشتبوونەوە بێ ئومێد بوو. کۆمەڵێک کە بەم

نائومێدیـە نـارازی بـوون لـە دەوری کۆبوونـەوە دوای ئـەوە بزوتنـەوەی فاشسـتی کـە مۆسـۆلینی بـووە سـەرکردەی بەهێـز بـوو.

فاشسـتەکان پـاش شـپرزەیی ناوخۆیـی و کەوتنـی یـەک لـەدوای یەکـی وەزارەتـەکان کۆنگرەیەکیـان لـە ناپۆلـی بەسـت لـە سـاڵی ١٩٢٢ ز دا، لاوانـی فاشسـتی ئیتاڵـی کۆبوونـەوە مۆسـۆلینی وتارێکـی بڵاوکـردەوە تیایـدا ئاشـکرای کـرد کەئەگـەر حوکمـی نەدرێتـە دەسـت هێـرش دەباتـە سـەر رۆمـاو بەهێـز دەسـتی بەسـەر دا دەگـرێ. لـەو کاتـە دا وا رویـدا کـە سـەرەک وەزیـران دەسـتی لەکارکێشـابۆوە و پادشـا ڤیکتـۆر عەمانوێلـی سـێیەم داوای لـە مۆسـۆلینی کـرد کـە وەزارەت پێکبهێنـێ.

مۆسـۆلینی حوکمـی گرتـە دەسـت و دەسـەڵاتی تـەواوی دایـە پەرلەمـان بۆمـاوەی سـاڵێک بـۆ لەناوبردنـی ئـاژاوەو دانانـی بناغـەی سـەقامگیری ناوخـۆ. بـەڵام مۆسـۆلینی ئـەم کارانـەی بـۆ پتەوکردنـی پارتەکـەی بەکارهێنـا و بـە وتارێکـی ئاگریـن رەزامەنـدی گەلەکـەی بـەلای خۆیـدا راکێشـا بەتونـدی بەرهەڵسـتی دوژمنانـی کـرد، ئەویـش بـە لەناوبردنـی بزووتنەوەکانـی مانگرتـن و بەندکردنیـان لەلایـەن پاشـاوە پشـتگیری لێکـرا، لەراسـتیدا مۆسـۆلینی هەوڵێکـی زۆری بـۆ رێکخسـتنی بەرێوەبـردن و وشـک کردنـەوەی زەلـکاوەکان و کردنـەوەی رێـگا و بـان دا و ئەمیـش وای لەبەشـێک لـە گەلـی ئیتاڵـی کـرد کـە پشـتگیری بکـەن بـۆ بڵاوکردنـەوەی ئاسـایش و لەناوبردنـی ئـەو مانگرتنانـەی کـە شـارەکانی ئیتاڵیـای گرتبـۆوە لـە ئەنجامـی جەنگدا.

مۆسـۆلینی تـا سـاڵی ١٩٢٨ ز دا توانـی رژێمـی حکـوم لـە ئیتاڵیـا لـە شـێوەی دیموکراتییـەوە بگۆرێتـە سـەر شـێوەی دیکتاتـۆری رووت. لـە سـاڵی ١٩٢٣ ز دا توانـی وا لـە پەرلەمـان بـکا کـە دوو لەسـەر سـێی ئەندامەکانـی لـە پارتـی فاشسـتی بـن. وە لـە سـاڵی ١٩٢٤ ز دا توانـی لـە ماتیۆتـی (Matteotti ) سـەرۆکی پارتـی سۆشیالیسـتی رزگاری ببـێ پـاش ئـەوەی فاشسـتەکان کوشـتیان. وە لەسـاڵی ١٩٢٥ ز دا دەسـتی

کـردە راونانـی ئـەو کەسـانەی کـە سـەر بـە بزووتنـەوەی فاشسـتی نەبـوون لـە کارگێـڕی حکومـەت دەری کـردن وە لـە سـاڵی ١٩٢٨ ز دا رژێمـی هەڵبژاردنـی وەکـو راوەرگرتنێکی لێکـرد، کـە ئەنجوومەنـی بـاڵا لیسـتەیەک بەنـاو پاڵێـوراوەکان دادەنـێ ئـەم لیسـتە دەخرێتـە بـەردەم گـەل بـۆ دەنگدانیـان لەسـەریان بـە کۆمـەڵ.

مۆسـۆلینی لەچارەسـەر کردنـی کێشـەی پاپایەتـی کەهـەر لـە سـەردەمی کاڤـورەوە هـەروا مابـوو، سـەرکەوت وە بینیمـان چـۆن پاپـا رۆمـای نەخسـتە سـەر ئیتالیـاو وای ئاشـکرا کـرد کـە ئـەو بەندکـراوە لـە ڤاتیـکان وەکـو نارەزاییـەک بەرانبـەر کردەوەکـەی حکومەتـی ئیتاڵیـا. هەروەهـا پاپـا لـەو کاتـەدا لـە وروژاندنـی رای گشـتی جیهانـی کاسـۆلیکی دژی حکومەتـی ئیتاڵیـا سـەرکەوت بۆیـە مۆسـۆلینی وای بینـی کـە ئـەم کێشـەیە چارەسـەر بـکاو لایەنگـری کلێسـای کاسـۆلیکی بـۆ رژێمـی فاشسـتی بەدەسـت بێنـێ. لـە سـاڵی١٩٢٩ ز دا پەیمانێکـی لەگـەڵ پاپـا بەسـت و بەپـێ ی ئـەم پەیمانـە حکومەتـی ئیتاڵیـا دانـی نـا بـە سـەربەخۆیی دەوڵەتـی پاپایەتـی کەڤاتیـکان دەگرێتـەوە و پاپـاش بەرانبـەر بـەوە دانـی نـا بـە حکومەتـی ئیتاڵیـا کـە رۆمـای بچێتـە پـاڵ.

بـەڵام لـەڕووی پڕچـەک کـردن و ئیسـتعماری دا مۆسـۆلینی ئـەوەی بـە رواڵەتـی بزووتنەوەکـەی فاشسـتی دادەنـاو خزمەتکردنـی سـەبازی کـردە گشـتی و سـوپای دووبـارە رێکخسـتەوە، بـەڵام بەرنامـە ئیسـتعمارییەکەی بریتییـە لـە کۆششـکردن بـۆ جێبەجێکردنـی خەونـە کۆنەکـەی ئیتاڵیـا، ئەویـش دەسـت بەسـەر داگرتنـی هەمـوو کەنارەکانـی دەریـای ناوەڕاسـت و کردنـی ئـەم دەریایـە بـە دەریاچەیەکـی (ئیتاڵـی).

# پەیدابوونی نازییەت لە ئەڵمانیا و گەشەکردنی

پاش کەوتنی بنەماڵەی هۆهنز لۆرن حکومەتێکی کۆماری دیموکراتیانە بەپێی دەستووری ڤایمار ( Weimar) لە ساڵی ١٩١٩ ز دا لە ئەڵمانیا پێکهات. ئەمە یەکەم حکومەتە کە هاتە کایەوە بەپێ ی ئەو بیروڕایانەی کە ولْسن بڵاوی کردەوە و لەپێناوی دا ویلایەتە یەکگرتووەکان چووە جەنگەوە، بەڵام ئەم حکومەتە نوێیە باری شیاوی بۆ نەگونجا لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە هیچ بەزەییان پێدا نەهاتەوە بە کۆت و پەیوەندی بژاردنەوە بەسترابۆوە، وتوشی کێشەی ئابووری ترسناک بوو کە وای لێکرد بێهێز بێت لە رووی سەربازی و دەسەڵاتی دەرەوە، هەروەها جێی رێز لێگرتنی گەلی ئەڵمانیا بوو. پارتەکان زۆلر بوون و ناکۆکی پارتایەتی لە ( رایخشتاخ) پەرەی سەند وای لە وەزارەتەکە جیاجیاکانی کرد کە یەک لەدوای یەکدا هاتنە سەر حوکم نەتوانن چارەسەری باری ناوخۆی وڵات بکەن.

ئەم هۆیانە نیشتمان پەروەرە توندڕەوەکان و پارێزگارەکانی ئەڵمانیای وروژاند وای لێکردن کە بەرهەڵستی لایەنگیرەکانی کۆماری و حوکمی دیموکراتی بکەن و پشتگیری پارتە نەتەوایەتییەکان بکەن. گرنگترینی ئەم پارتانە (پارتی سۆشیالیستی نیشتمانی) بوو کەوا رێککەوت کە لەدوایدا دەست بەسەر حوکمدا بگرێت. وە لە پیاوانی جەنگی رابردوو دا لاوەکان و هەندێ لایەنی پارێزگار پێکهات خەڵکی بۆلای خۆی راکێشا بەبیانوی ئەوەی کە ئەڵمانیا لە جەنگی یەکەمی جیهانی تێک نەشکا، بەڵکو هەندێک کۆمەڵ لەناوخۆدا ناپاکیان کرد (مەبەستیش جولەکەکانە) ئەمەش وای کرد خۆی بدا بە دەستەوە و یەکگرتنی میللەت ئامانجی پارتەکەیە و بۆ گەڕاندنەوەی پایەی ئەڵمانیا و دەسەڵاتی پێشوی نێوان دەوڵەتە مەزنەکان هەوڵ دەدا. دەوری دیار لە رێکخستنی ئەم پارتەو پرۆپاگەندە کردن بۆی دەگەڕێتەوە بۆ ئەدۆلف هیتلەر (Adolph Hitler ) کە یەکێک بوو لو ئەڵمانیە نەمساویەکان و لەکاتی جەنگدا چووە ریزی سوپای ئەڵمان، بەڵام لە سوپادا لە پلەی عەریفی ( Corporal ) تێنەپەڕی. وەپاش شەڕ راگرتنەکە لە سیاسەتدا ئیشی کرد و پارتی سۆشیالیستی نیشتمانی رێکخست و لە ساڵی ١٩٢٠ ز دا بەرنامەکەی کە بوار بە گۆڕان نادات

دانا. تیایدا پارتەکە دانی نەنا بە بڕیارەکانی کۆنگرەی ئاشتبوونەوە لە پاریس. و داوای یەکگرتنەوەی هەموو ئەڵمانیەکانی دەکرد بۆ پێکهێنانی ئەڵمانیای گەورە و گەڕانەوەی داگیرگە ئەڵمانییە پێشوەکان و پرچەک کردنی ئەڵمانیای مەبەست بوو. بیروباوەڕی سۆشیالیستی جیا لە مارکسیەتی وەرگرت و ئاشکرای کرد کە دان بەرژێمی پەرلەمانیدا نانێ.

لە ساڵی ١٩٢٣ ز دا هیتلەر لەگەڵ لۆندرۆف رۆڤا لە شۆڕشەکەی میونخ بۆ گەڕانەوەی رژێمی حوکم بەشدار بوو، بەڵام ئەم بزووتنەوەیە سەرنەکەوت و هیتلەر لە ئەنجامی پیلانگێڕی لە دژی دەوڵەت بەند کرا وەی ئەو کاتەی کە لە زیندان بوو بە نوسینی کتێبە گەورەکەی (خەباتی من) (Mein Campt) بەسەر برد. وەی کاتێک کە ((ئیپرت)) سەرۆکی یەکەمین کۆمار بوو لە ساڵی ١٩٢٥ ز دا کۆچی دوایی کرد سۆشیالیستی بوو، پارتەکانی تر (هەندنبرگ) یان هەڵبژارد و حەفت ساڵ بە هاوکاری کردن لەگەڵ پارتە دیموکراتییەکان بەسەرۆک کۆماری بەسەربرد. بەڵام پارتی سۆشیالیستی نیشتمانی ((کەناوی بووە پارتی نازی)) پەرەی سەند و هەندنبرگ لە ساڵی ١٩٣٠ ز دا پایەی راوێژکاری دابووە برۆنگ ( Heinrich Brunnig) بۆ قوتارکردنی کۆمارەکە لە توندڕەوەکان، بەڵام ناکۆکیەکان بوونە هۆی ئەوەی کە حکومەت دەست بەسەر ئەنجومەنی میللەت (رایخشتاغ) دانەگرێ.

کاتێک کە ماوەی سەرۆکایەتی هەندنبرگ لە ساڵی ١٩٣٣ ز دا کۆتایی پێهات. هیتلەر خۆی بۆ سەرۆکایەتی دانا کەچی برۆننگ بۆ لاینگری هەندنبرگی دەرکرد و کۆمەنیستەکان تیلمان ( Thailman) یان هەڵبژارد و هەندنبرگ هەم سەرکەوت و ئەمە بووە هۆی بەردەوامبوونی رژێمی کۆماری لە ئەڵمانیا دا، برۆننگ لە چارەسەر کردنی کێشەی ئابووری گەلێک کۆسپی هاتە رێ بۆیە بڕیاری چاککردنی باری جوتیارانی دا بە دانانی سیاسەتێکی ئابووری سەربەستانە کەچی هەندنبرگ ئەم سیاسەتەی بە زیادەڕۆ داناو برۆننگی لابردو راوێژکاریەکەی دا بە ڤۆن پاپن( Von Papen) پارتی نازی لەو کاتەدا بوبوە

هێزێکی گەورەو وای کرد کە ناوەندی وەزارەتەکان شلۆق بکات بە بەرهەڵستی کردنی. بۆیە زۆری پێنەچوو کە دەستی لە کارکێشایەوەو راوێژکاریەکەی درایە ڤۆن شلایخر ( Von shleicher)، ئەمیش لەگەڵ هیتلەردا هاوکاری کرد و ناوەندی شلایخریان لەق کرد، ناچاربوو دەست لەکار بکێشێتەوە جا هەندنبرگ چاری نەماو هیتلەری بانگ کرد پایەی راوێژکاری لە کانوونی دووەمی ١٩٣٣ ز دا پێ بەخشی.

## هیتلەر راوێژکاری ئەڵمانیا:

هیتلەر پاش وەرگرتنی راوێژکاری دەستی دایە هەڵبژاردنی تازە بۆ رایخشتاغ زۆربەی بۆ پارتەکەی بەدەست هێنا و کەوتە بەرهەڵستی پارتەکانی تر بە تایبەتی پارتی کۆمۆنست و رژێمی دیموکراتیەکەی حکومەتی گۆڕی بۆ حکومەتێکی دیکتاتۆری هەندنبرگیش رازی بوو کە دەسەلاتێکی دیکتاتۆریانە بۆماوەی چوار ساڵ بداتە حکومەتەکەی هیتلەر، کە بەهۆی ئەوەوە توانی هەر بەرهەڵستییەکی پارتایەتی رۆژنامەگەری کۆمەڵ و گشت ئەو دامەزراوانە کە بەرهەڵستی پارتەکەی دەکەن لەناویان بەرێ، جۆزیف غوبلز کە بەتوانا بوو لە پروپاگەندە کردندا یارمەتی دەدا و بەوەزیر دانراو کەوتە بەرهەڵستیکردنی پارتەکان و لەناوبردنیان تاکو وای لێهات گشت دامەزراوەکانی دەوڵەت کەوتە ژێر دەسەلاتی نازییەکان. دوای هیتلەر روی کردە چەسپاندنی پارتەکەی و پەیوەندیکردنی بە دەوڵەتەوە، وە لە ساڵی ١٩٣٣ ز دا وای لە پارتەکەی کرد کە بەشێکی جیانەکراوەی دەوڵەت بێت. دوایی پەرلەمان خۆجێییەکانی هەڵوەشاندەوەو هەر ویلایەتێکی کردە ناوچەیەکی کارگێڕی سەربە حکومەتی ناوەندییەوە. لە ساڵی ١٩٣٤ ز دا ئەو رایخشتاغەی هەڵوەشاندەوە بەو جۆرە ئەڵمانیای یەکگرتوو هاتە کایەوە و رایخی سێیەم دامەزرا.

لە ساڵی ١٩٣٤ ز دا دوو رووداوی گرنگ رویداکە یارمەتی هیتلەریان دا بۆ چەسپاندنی دەسەلاتەکەی، یەکەمیان رزگاربونیان لە رۆیم ( Ernent Rohm) کە یەکێک بوو لە سەرکردەکانی نازی وای دەبینی کە بزووتنەوەکەی نازی پێویستە لەوە زیاتر توندڕەتر بێت وەک ئەوەی هیتلەر دەیویست واباو بوو کە دەیەوێت

پیلانێک بگێڕێ بۆ تیرۆرکردنی هیتلەر بۆ ئەوەی شوێنەکەی بگرێتەوە، هیتلەر و غرنگ و غوبلز هاوبەشییان لە لەناوبردنی ئەم بزووتنەوە کردو (رۆیم) یان کوشت رووداوی دووەم مردنی هندنبرگ و وەرگرتنی هیتلەر بۆسەرۆکایەتی دەوڵەت سەرەڕای پایەی راوێژکاری. هیتلەر پاش جێگیربوونی حوکمەکەی لە ناوخۆدا، رووی کردە رەگەز جەرمانیەکانی دەرەوەی ئەڵمانیا بۆ رایخی سێیەم و هەوڵی دا نەمسا بخاتە پاڵ ئەڵمانیاوە، پرۆپاگەندەی نازی لە نەمسادا بڵاوکردەوە و نازییەکان دەستیان کرد بە بزووتنەوەو دلفۆس (Dalfuss )ی سەرۆک وەزیرانیان کوشت کە دژی ئەم بزووتنەوەیە بوو، بزووتنەوەکە سەرنەکەوت، چونکە زۆربەی نەمساویەکان بەرهەڵستیان دەکرد و سەرەڕای لایەنگیری مۆسۆلینی بۆ حکومەتی نەمسا، بەریتانیا فەرەنساو چیکوسلۆڤاکیا لایەنگیریان لە سیاسەتی مۆسۆلینی دەکرد. بەڵام هیتلەر لەجیاتی سەرنەکەوتنەکەی لە نەمسادا (سار) ی خستەسەر ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٥ز دا ئەمەش ساڵی راوەرگرتن بوو لەم ناوچەیەدا بۆ بڕیاردانی چارەنووس پاش تێپەڕینی پانزە ساڵ بەسەر بەستنی پەیمانی ڤرسای، کاتێک کە راوەرگرتن هاتەدی زۆربەی دانیشتوان دەیانویست بچنە پاڵ ئەڵمانیاوە.

هیتلەر لە سیاسەتی دەرەوەی دا هەوڵی پێکهێنانی هاوپەیمانێکی بەهێزی دا بۆ هاوکاریکردن لەگەڵیاندابۆ ئەوەی وا لە دەوڵەتی دیموکراتیەکان بکات کە رێگە بدەن هەرێمەکانی تری جەرمەنی (نەمسا و هەندێ بەشی چیکوسلۆڤاکیاو پۆلەندا) بخاتە پاڵ ئەڵمانیا، وە توانی ئەم هاوپەیمانەبدۆزێتەوە و بارێکی شلۆقی ترسناک لە هاوسەنگی نێوان وڵاتانی پەیدا بکات هەروەکو لە بەشی داهاتوو دا دەیبینین.

# بەشی دووەم

## بارودۆخی تورکیاو ئێران لەدوای جەنگی یەکەمی جیهاندا

### تورکیا:

دەوڵەتی عوسمانی لە پاڵ ئەڵمانیا بەشداری جەنگی یەکەمی جیهانی کرد لەژێر زەبرەی ئەنوەر و جەمال و تەلعەت و چەندانی کە لە ئیتیحادییەکان وایان دەدی لە سەرکەوتنی ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی ئاواتیان دێتەدی لەگێڕانەوەی ئەو موڵکانەی کە دەوڵتی عوسمانیدا لە لیبیاو بەلقان لەدەستیان چووبوو.پروپاگەندەی ئەڵمانی کاری خۆی کرد لە هاندانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ بەشداربوون لە جەنگ کە هەرچەندە بەریتانیا ویستی وای لێ بکات بەشداری جەنگ نەبێت، بەڵام دەوڵەتی عوسمانی بەشداری لە جەنگ کردو بەرهەڵستی پەلاماری بەریتانیای کرد لە دەردە نیل و وڵاتە عەرەبیەکان هەتا کۆتایی ئەو جەنگە کاتێک شەڕ وەستا لە نێوان بەریتانیا و دەوڵەتی عوسمانی لە مۆدرۆس (Mudrus)لە ٣٠ تشرینی یەکەمی ساڵی١٩١٨ز دا کە کەشتیگەلی هاوپەیمانەکان چونە ئاوی دەردە نیل و بۆسفۆرەوە، وە چون هێزێکی سەربازی لە هاوپەیمانەکان لە ئەستەنبۆڵ دابەزێنن بۆ دەست بەسەر داگرتنی کاروباری دەوڵەتی عوسمانی.

کاتێک کۆنگرەی ئاشتبوونەوەلە پاریسدا بەسترا هاوپەیمانەکان سەیری کاروباری دەوڵەتی عوسمانیان کرد لەنێوان خۆیاندا و لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا پەیمانی سیڤەر ( Severs) یان بەست لە ١٠ ی ئابی ساڵی ١٩٢٠ ز کە دەوڵەتی عوسمانی تیایدا کەرت بوو کوردستان و ئەرمەنستان و نیشتمانی عەرەبی لێکرایەوەو دورگەکانی دۆدیکانیزی لێ داپچڕاو درا بە ئیتاڵیا تەراقیای خۆرهەڵات و ئەزمیر بوون بە بەشێک لە یۆنان وە لەئەنجامیئەو موڵکانەیان کۆڵیەوە کە لە دەوڵەتی عوسمانی ماوەتەوە لە میسرو لیبیا و تونس و مەغریبدا.گەرووە ئاوییەکانیان خستە ژێر دەسەڵاتی وڵاتانی هاوپەیمانەوە،مافە تایبەتییەکانی وڵاتە بیانیەکان وەکو خۆی ماوە ئەنادۆڵ دابەشکرا بە ناوچەی دەسەڵات لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتاڵیاداو کاروباری دارایی دەوڵەتی عوسمانیش درایە دەست لیژنەیەکی دارایی لە هاوپەیمانەکان بۆ ڕێکخستنی قەرز و گیرو گرفتە داراییەکان.

## بزوتنەوەی کەمالییەکان:

پەیمانی سیڤەر بەچاو تورکەکانەوە دڵتەزێن بوو. بۆیە نارەزاییان دەربڕی و بەرهەڵستییان بە سەرۆکایەتی مستەفا کەمال پاشا پیشاندا، مستەفا کەمال پاشا لە ساڵی ١٨٨١ ز دا لە سلانێک لەدایک بووە و لە فێرگە سەربازییەکەی دا دەرچووە،ئەمجا فێرگەی جەنگی لە ئەستەنبۆڵ، دوای فێرگەی ئەرکان تا بە پلەی سەرۆک روکن دەرچووە، لە جەنگی لیبیا دا بەشدار بووە لە بولگاریاو قەفقاس جەنگاوە لە بەرگری گەروو ئاوییەکان و هێرشی عوسمانی بۆ سوریا بەشداری کردوە، لەدوای کۆتایی جەنگ گەڕوەتەوە ئەستەنبۆڵ و بە سەرپەرشتیاری سوپای ئەنەدۆڵ دانراوە کە گەیشتۆتە ئەرزرۆم لە باکوری کوردستان هەوڵی کۆکردنەوەی هەموو هێزێکی عوسمانی پەرش و بڵاوی داوە، چەند ئەفسەرێکی لەدەوردا کۆبۆتەوەو بانگە کۆنگرەیەکی نیشتمانی راهێشت کە لەئەرزرۆم بەستراو نوێنەری هەموو لایەکی ئەنادۆڵی تیادا ئامادە بوو، کۆنگرەیەکی تر لە سیواس بەسترا. بڕیاری بەشداربوانی کۆنگرە پێویستی راپەرین و وەرگرتنەوەی ئازادی بوو، مستەفا کەمالیان هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتی بزووتنەوەکە و ئەنجوومەنێکیان هەڵبژارد بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کە ناونرا ((ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی)).

## بەڵگەنامەی ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی :

کاتێک ئەم ئەنجوومەنە گوێزرایەوە بۆ ئەنقەرە بەڵگەنامەی ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی دانا، کە بروانامەی بزووتنەوەی نیشتمانی بوو، ئەم بەڵگەنامەیە ئاشکرای کرد کە هەموو ئەو ناوچانەی کە تورک زۆربەن یەکێتیەک پێکدەهێنێت کە دابەشبوونی بۆ نییەو دەوڵەتێکی سەربەخۆیی تەواوی لێ پێکدێت.کاتێک وەزارەتی داماد فرید پاشای لە ٥ ی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ ز پێکهات کە دوژمنی سەر سەختی بزووتنەوەی کەمالییەکان بوو، مستەفا کەمال ئاشکرای کرد کە پەیوەندی لەگەڵ حکومەتی ئەستەنبۆڵ بڕیوە و لە ئەنقەرە لە حکومەت جیا بۆتەوە.


مستەفا کەمال

ئەو مەترسیانەی کە ڕووبەڕووی تورکیا بوونەوە مەزن بوو، یۆنان لە خۆرئاوا و ئەرمەن لە خۆرهەڵات و فەڕەنسییەکان لە باشوور، حکوومەتی ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی ڕێکخستنەوەی سوپاو بەرهەڵستیکردنی دوژمنانی گرتە ئەستۆ لە ٢٠ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢١ ز بڕیاری دەستورێکی تازەی دا کە بە ناوی یاسای ڕێکخستنی بنچینەیی ناونرا، وە بەو پێیەش ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی بە دەسەڵاتی یاسادانان لە قەڵەم درا لەو ئەنجوومەنە سەرۆک وەزیرەکان کە نوێنەری دەسەڵاتی جێبەجێکەرن هەڵدەبژێردرێن.

ئەمجا حکومەتی ئەنقەرە کەوتە بەرهەڵستی کردنی دوژمنانی تورکیا، سوپاکەی توانی ئەریڤان پایتەختی ئەرمینیا داگیر بکات و بەرهەڵستی کردنی ئەرمەن کۆتایی پێهات. لەو کاتانەشدا وەزارەتی فنزیلۆس ڕوخا لە یۆنان و پادشا قوستەنتینبۆ جاری دووەم هاتەوە سەر تەخت (کە لەکاتی جەنگدا تەختی شاهانەی بەجێ هێشتبوو) ئەم ڕووداوانە بووە هۆی گۆڕینی سیاسەتی هاوپەیمانەکان بەرانبەر بە تورکیا. فەڕەنسا و ئیتاڵیا لەو باوەڕە بوون کە پێویستە پەیمانی سیڤەر بگۆڕدرێت بەو پێیەی کە ئەو سیاسەتەی بەرهەڵستی کە (فنزیلۆس) گرتبویەبەر شکستی هێنا بەرووخانی وەزارەتەکەی.

ئەمە جگە لەوەی کە ئەم دوو دەوڵەتە دەیانویست بەرهەڵستی سیاسەتی بەریتانیا بکەن کە پەلاماردانەکەی یۆنانی کردبوو بە بەهانە بۆ ئەوەی دەست بەسەر ئاسیای بچوکدا بگرێت، بڕیاردرا بە بەستنی کۆنگرەی هاوپەیمانەکان لە لەندەن کە ئەم کۆنگرەیە بەسترا بڕیاردرا بە گۆڕینی پەیمانی سیڤەر، بەڵام بڕیارەکانی ئەم کۆنگرەیە دوورو درێژی دواخرا بۆ کۆنگرەیەک لە پاریس بەسترا لە ٢٤ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢١ ز، بەڵام یۆنان سووربوو لەسەر داواکارییەکانی کاتێ سوپاکەی لە شەڕی (ئینۆنۆ) شکا ناچار بوو کە قایل بێت بە ناوبژیکردنی هاوپەیمانەکان بەهۆی لیژنەیەک کە پێکی بهێنی بۆ لێکۆڵینەوەی لەو خاڵانەی کە لەسەری ناکۆک بوون بە تایبەتی لە ڕاستو دروستی زۆرینەی دانیشتوانی ئەزمیر و تەراقیادا، بەریتانیاش دانی نا بە حکومەتی ئەنقەرەو تورکەکان قایل بوون بەمەرجێک سوپای یۆنانی لێ بکشێتەوە لێی و هاوپەیمانەکان جێگای یۆنان بگرنەوە تا ئەو کاتەی دەنگدان تەواو دەبێت. بەڵام یۆنان بەمە قایل نەبوو.

## جەنگ لەگەڵ یۆناندا:

جەنگ بۆ جاری دووەم لەنێوان یۆنان و تورکەکان بەرپا بۆوە، سوپای تورکی لە زنجیرەیەک شەڕدا سەرکەوت و توانی کە یۆنانیەکان لە ئەنادۆڵ دەربکات. کاتێکیش سوپای تورکی چووە ئەزمیرەوە سوپای یۆنان لێ ی کشاوەو. تورکەکان لەو ماوەیەدا یارمەتیان لە سۆڤیەت وەرگرت کە پەیمانی دۆستایەتی و ئاشتی لەگەڵ بەست (لە ١٦ی ئازاری ساڵی ١٩٢١ ز) هەوەها یارمەتییان لە فەرەنسا وەرگرت (لە ٢١ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢١ ز) گەلێ تفاقی جەنگیان بۆ بەجێ هێشتن کاتێک سوپاکەی لە کیلیکیا کشاندەوە.

ئەمجارە مستەفا کەمال دوای ئەوەی کە سوپای یۆنانی لە ئەنەدۆڵ شکاند هەموو هەوڵ و تەقەلـلای ئاراستەی تەراقیان کرد. زۆر نەمابوو لەگەڵ سوپای بەریتانی بەیەکدا بدەن، بەڵام بەریتانیا رێگەیان بە سوپای تورکیا دابوو کە تەراقیای خۆرهەڵات داگیر بکات بە پێچەوانەی پەیمانی سیڤەرەوە. شەر وەستاندن هاتە کایەوە لەنێوان تورک و یۆنانەکان لە ( مۆدانیا) (Mudania ) لە ١١ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٢ ز.

## کۆنگرەی لۆزان:

کاتێک کۆنگرەی لۆزان بەسترا لە (تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ ز) دا بۆ نەهێشتنی گیروگرفتی خۆرهەڵاتی نزیک کۆنگرە نەیتوانی بگاتە چارەسەرێک بەهۆی سوور بوونی لۆرد کرزن نوێنەری بەریتانیا و وەزیری دەرەوەی هەروەها لەبەر سووربوونی عصمت پاشا نوێنەری تورکیا هەر یەکە لەسەر داواکارییەکانی خۆیان، کۆنگرە دواخرا کاتێکیش دەستی کردەوە بەئیش لەدوای سێ مانگ سێرهۆراس رمبۆڵد باڵوێزی بەریتانیا لە تورکیا بوو بە نوێنەری بەریتانیا لە جیاتی کرزن، رێککەوتن ساز بوو ئیمزا لەسەر پەیمانی لۆزان کرا لە ٢٤ ی تەمموزی ساڵی ١٩٢٣ ز لەو پەیمانە بریار درا کە تورکیا واز لە هەموو مافەکانی بێنێت لە عێراق و سوریا و فەلەستین و قوبرس و دورگەکانی دودیکانیز و میسرو لیبیا، بەڵام باکوری کوردستان و ئەزمیر و ئەرمینیا و وکیلیکیا و تەراقیای خۆرهەڵاتی و هەموو مافەکانی پێشووی لە ئەستەنبۆڵ بۆ مایەوە کە بەتەما بوو بەپێ ی پەیمانی سیڤەر لەدەستی دەربچێت. هەروەها بریاردرا بە گۆڕینەوەی دانیشتوانی یۆنانی و تورکی،

ئەو یۆنانیانەی کە لەناوچەی تورکیدا هەن بگەڕێنەوە بۆ یۆنان، لە جیاتی ئەوان ئەو تورکانەی کە لەناوچەی یۆناندا دەژین بگەڕێنەوە تورکیا، هەروەها بڕیاری لابردنی مافە تایبەتییەکانی بیانی لە تورکیادا درا , بەڵام ئەوەی کە تایبەتە بە گەرووە ئاوییەکانەوە ئەوا بڕیار درا کە هەموو کەشتییە بازرگانییەکان بە ئازادی پیایدا بڕوات لە کاتی ئاشتی دا و کەشتی وڵاتە بێ لایەنەکان لەکاتی جەنگدا. ئە و ناوچانەی گەرووە ئاوییەکان پڕ چەک نەکرێت.

## چاکسازییەکانی ناوخۆ:

مستەفا کەمال دوای ئەوەی کە لای کردەوە بە لای رێکخستنی کاروباری ناوخۆی وڵات لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٣ ز بانگ راهێشتنی کۆماری بە شێوەیەکی رەسمی درا و مستەفا کەمال بە سەرۆک هەڵبژێردرا.

دوایی بۆ جارێکی تر کە دوبارە هەڵبژێردرایەوە دوای تەواوبوونی ماوەی سەرۆکایەتی یەکەم ئەم ئەمجارە بوو بە سەرۆک بە درێژایی ژیانی. خەلافەت دوای ماوەیەکی کەم لە ئاشکراکردنی رژێمی کۆماری لابرا. دوا خەلیفەی بنەماڵەی عوسمانیەکان لە ٢٤ی ئازاری ساڵی ١٩٢٤ ز دا ئەستەنبوڵی بەجێ هێشت. وەزارەتی ئەوقاف لابراو هەموو ئەو فێرگانەی کە تایبەت بوون بەو وەزارەتەوە خرایە خرایە سەر وەزارەتی مەعاریف , جکومەت گرنگی دا بە یاسای فێرکردن و بڵاوکردنەوەی لەنێو رۆڵەکانی گەلدا. هەروەها زنجیرەیەک گۆڕانکاری گرنگ لە کۆمەڵگەی تورکی هاتە کایەوە لەوانە بڕیاری ئەنجوومەنی گەورەی نیشتمانی بوو بە جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت دا. ئەمجا بەکارهێنانی پیتی لاتینی لەجێی پیتی عەرەبی (لە ساڵی ١٩٢٩ ز) هەروەها مستەفا کەمال بایەخی دا بە لایەنی ئابووری , بۆ ئەم مەبەستەش هانی بزووتنەوەی پیشەسازی داو بانکەکانی تورکیای کردەوە کە ئەرکی دەرکردنی پارەی تورکی گرتە ئەستۆی خۆی و هەندێ کاروباری ئابووری دا بە هەندێ لە کۆمپانیاکان بۆ سوودوەرگرتن لە سەرمایەکانیان , و بەری بەری رۆژنامەی گرت و چاودێریێکی وردی خستەسەر ئەو کۆمەڵانەی کە گومانی دوژمنکارانەیان لێ دەکرێت لە بەردەم سیاسەتی چاکسازیەوە مستەفا کەمال ئەم جۆرە حوکمەی هەڵبژارد چونکە بەهۆیەکی دەزانی بۆ بنیات نانی قەوارەی دەوڵەتێکی تازەی خاوەن رێبازی سەردەم.

## ئەو پرەنسیپانەی (بیروباوەڕانەی) کە بزووتنەوەی چاکسازی پشتی پێ بەست

ئـەم چاکسـازیانەی تورکیـا لەبـەر ڕۆشـنایی پرەنسـیپی گشـتی هاتـە کایـەوە دوایـی کـە بەفەلسـەفەی کودەتـای تورکـی ناونـران ئـەم پرەنسـیپانەش ئەمانەبـوون:

**یەکەم:** ڕژێمی کۆماری: کە ئەمە پرەنسیپی ڕژێمی حوکمی تازەی تورکیا بوو.

**دووەم:** نەتەوایەتـی: کـە ئەویـش پرەنسـیپی بەهێزکردنـی نەتەوەیـە بـە تایبەتـی لـەڕووی ڕۆشـنبیریەوە بەگەڕانـەوەی بـۆ زمـان و مێـژووی تورکـی , لـە ڕواڵەتەکانـی ئـەم لایەنـە چاککردنـی زمانـی تورکـی و هەوڵدانـی پاککردنـەوەی لـە وشـەی بیانـی و دامەزراندنـی کۆمەڵـەی مێـژووی نەتەوەیـی کـە مێـژووی تورکیـای لـە چـوار بـەرگ دا دانـا بەپێـی ئاراسـتەی نەتەوایەتـی.

**سێیەم:** عیلمانیـەت: بیروبـاوەڕی جیاکردنـەوەی ئاینـە لـە دەوڵـەت و بـەو پێیـە کـە ئاییـن مەسـەلەیەکی تایبەتـە بـۆ خـودی کەسـە کـە خـۆی دەگەڕێتـەوە. لـە ڕواڵەتەکانـی ئـەم بیروبـاوەڕە لابردنـی خەلافـەت و وەزارەتـی ئەوقـاف و تەکیـە و پەیـڕەو کردنـی یاسـای مەدەنـی سویسـری.

**چوارەم:** میللەتخوازی: پرەنسـیپی یەکسـانییە لەنێـوان خەڵکـداو دان نەنـان بەبـاری چینایەتـی و چەوسـاندنەوەی چینێـک بـۆ چینێـک کـە مافـی تایبەتـی نابێـت هەبێـت بـۆ هەنـدێ چیـن و کۆمـەڵ , ئەمـەش لەبڵاوکردنـەوەی فێرکـردن و یەکسـانی لـە ڕووی یاسـادا دەردەکەوێـت.

**پێنجەم:** دەوڵەتیبوون: پرەنسـیپی ئابـووری دەوڵەتـە بـەو پێیـەی کـە هەمـوو دەزگایەکـی گشـتی موڵکـی دەوڵەتـە , لـە دیارتریـن نموونـە بـۆ ئەمـە وەکـو هێڵـی شـەمەندەفەر کـە موڵکـی دەوڵەتـە و دەسـتگرتن بەسـەر بانکـەکان و دامەزراندنـی کارگـەی حکومـی.

**شەشـەم:** کودەتا (الانقلاب ): پرەنسـیپی پێشـکەوتن و سەربەسـتی بیـر و بەگژداچوونـی ئەفسـانە و پەیڕەوکردنـی تازەتریـن بیروبـاوەڕی زانسـتی و کۆمەڵایەتـی و خۆرئاواییـە , لـە ڕواڵەتەکانـی ئـەم بیروبـاوەڕە ڕزگارکردنـی ئافـرەت و بەشـداری کردنییەتـی لـە مەیدانـی سیاسـەت و ئیـش کردنـدا.

تورکیـا گەلـێ هەنـگاوی گـەورەی نـا لـەڕووی نێـو دەوڵەتیـەوە , پایـەو شـوێنی خـۆی

بەهێـز کـرد بـۆ بەسـتنی کۆنگـرەی پەیمانـی بەلقـان سـاڵی ١٩٣٤ ز بـۆ راوێژکردنـی لـە کۆنگـرەی مۆنتـرۆ (Montreux) لـە سـاڵی ١٩٣٦ ز دا ئاواتـی هاتـە دی بـە قایـل بوونـی دەوڵەتـان لـە پرچەککردنـی کەنارەکانـی دەوروبـەری گـەرووە ئاوییـەکان لـە ساڵی ١٩٣٩ ز دا ویلایەتـی ئەسـکەندەروونەی خرایـە سـەر , لەهەمـان ساڵدا بـوو بـە هاوپەیمـان لەگـەڵ بەریتانیـا و فەرەنسـادا بـەڵام لەکاتـی جەنگـی دووەمـی جیهانـی چاودێـری رووداوەکانـی دەکـرد , دەیویسـت سـوود لەئەنجامـی جەنـگ وەربگرێـت , دوایـی کەوتـە پـاڵ ئـۆردوگای خۆرئاوایـی سـاڵی ١٩٣٤ ز.

## ئێران

راپەرینـی نەتەوایەتـی لەئێرانـدا لـەو کاتـەوە دەسـتی پێکـرد کە (جمـال الدیـن الافغانـی) بانگـی راهێشـت بـۆ بەگژداچوونـی ئیسـتعماری ئەوروپـی لـە سـەردەمی (شـا ناصر الدین) کـە لەسـەردەمی ئەمـدا ئـاژاوە پـەرەی سـەند و وای لێهـات پلـەو پایـەی دەوڵـەت و مافـی نەتـەوە گاڵتەیـەک بـوو بەدەسـت کاربەدەسـتانەوە وە

لەسـاڵی ١٨٩٠ ز شـا مافـی قۆرغـکاری توتنـی دا بـە کۆمپانیایەکـی بەریتانـی , ئەمـە بـووە هـۆی ئـەوەی کـە بازرگانەکانـی توتـن لـە ئێـران توشـی زیـان بـن , رای گشـتی وروژانـد خەڵـک جگـەرەی نەکێشـابەهۆی دوانـی جمال الدیـن الافغانـی کـە داوای لێکـردن واز لـە جگەرەکێشـان بهێنـن , شـا ناچـار بـو ئـەو مافـە هەڵوەشـێنێتەوە , ئـەم کارەسـاتە بووەهـۆی جوڵانەوەیەکـی نیشـتمانی بـۆ بەرهەڵسـت کردنـی سـتەمکاری شـاو دەسـەڵاتی بیانـی رک و کیـن بـەردەوام بـوو بەرانبـەر بـە شـا تـا لـە سـاڵی ١٨٩٦ کـوژرا , گـەل جارێکـی تـر لـە سـەردەمی ( مظفر الدین شا ) ئەویـش شۆڕشـی بەرپاکـرد , چونکـە حکومـەت بـەردەوام بـوو لـە قـەرز کـردن , دوایـی شـا ناچـار کـرا بەئاشـکراکردنی دەسـتور سـاڵی ١٩٠٦ ز , ئـەوە بـوو یەکـەم ئەنجوومەنـی نوێنەرایەتـی بـۆ وڵات کرایـەوە. بـەڵام (شـا محمـد علـی میـرزا) کـە لـەدوای مزەفەرەدیـن هاتـە سـەر خـەت قینـی لەژیانـی نوێنەرایەتـی دەبـۆوەو , کاتێـک ویسـتی لای بەرێـت بـووە هـۆی بەرپابوونـی شۆڕشـی سـاڵی ١٩٠٩ ز , شۆڕشـگێران جێـگای ئەویـان گرتـەوە لـە جیاتـی ئـەو سـوڵتان (احمد میرزایـان) دانـا , بـەم جـۆرە ژیانـی دەسـتووری گەڕایـەوە و ئەنجوومـەن دەسـتی کـرد بـە کۆبونەوەکانـی.

کاتێک شۆڕشی رووسی بەرپا بوو (ساڵی ١٩١٧ز) بەریتانیەکان دەستیان بۆ هەموو لایەکی ئێران درێژ کرد و وڵاتیش لە ژێر دەسەڵاتیان مایەوە تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی، دوایی لە ١٩١٩ز رێککەوتن نامەیەکی لەگەڵ ئێراندت بەست کە ئێران بەپێی ئەوە قایل بوو بەئیش کردنی راوێژکاری بەریتانیا لە هەموو فەرمانگەکانی حکوومەتدا.

بەڵام ئەم بارە هەروا بەردەوام نەبوو لەم کاتەدا (رەزاشاە پەهلەوی) دەرکەوت کە توانی بەندەکانی رێککەوتن نامەی ساڵی ١٩١٩ز لابەرێت و گفتوگۆ لەگەڵ بەریتانیا بکاتەوە لەگەڵیاندا پەیمانێک لە ٢٦ی شوباتی ١٩٢١ز ببەستێت کە بەریتانیا بەپێی ئەو پەیمانە دانی نا بە سەربەخۆیی ئێراندا.

شا کەوتە چاککردنی باری ژیانی ئابووری و کارگێڕییەوە، ئەندازیارانی لە ئەڵمان و ئیتاڵییەکان بەکارهێنا، وەبەهۆی فەرمانبەرانی دارایی ئەمریکییەوە کاروباری دارایی حکومەتی ئێرانی رێکخست هەروەها بایەخی دا بەلایەنی ئاوەدانییەوە بەتایبەتی رێگای هاتووچۆ بەستنی بەشە جیا جیاکانی ئێران بەیەکەوە وای لێهات شەمەندەرفەر باکووری ئێران لە دەریای قەزوینەوە بە باشوورەوە ببەستێتەوە. بایەخی دا بە بوژانەوەی ئابووری وڵات بە دامەزراندنی کارگە و هاندانی پیشەسازی و نیشتمانی و بەستنی رێککەوتن نامەی بازرگانی لەگەڵ دەوڵەتانی بیانیدا.

بەڵام لە رووی پەیوەندییەکانی دەرەوە ئێران پەیمانێکی بەست لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت، لە ساڵی ١٩٢١ز دا سۆڤیەت بەو پێیە دانی نا بە سەربەخۆیی ئێران و لە هەموو قەرز و قۆڵەیەکی پێشوو مافی تایبەتی لە بەندەرەکانی و رێگای هاتووچۆ رێگای شەمەندەفەر خۆش بووە، لەگەڵ ئەفغانستاندا پەیمانێکی بەست ساڵی ١٩٢٣ز هەردوو دەوڵەت دانیان نا بە سەربەخۆیی ئەوی تریان، ئەمجا لەگەڵ تورکیادا پەیمانێکی ئاشتی هەمیشەیی و بێ لایەنی بەست.

ئێران و تورکیا بوون بە دوو دەوڵەت کە لە خۆرهەڵاتی نزیکدا بایەخیان هەبێت. وە لە ٨ی تەموزی ساڵی ١٩٣٧ز پەیمانی سعد ئاباد لە نێوان تورکیا و عێراق و ئیران و ئەفغانستان بەسترا، بەپێی ئەم پەیمانە ئەم چوار دەوڵەتە بڕیاریان دا کە لە نێوانی خۆیاندا لە رووی سیاسەتی دەرەوە راوێژ بکەن.

# بەشی سێیەم

## پەیوەندییەکانی نێو دەوڵەتان لە نێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمدا ١٩١٨ز-١٩٣٩ز

### ١ – پێشەکی:

دوای ئـەوەی کـە کۆنگـرەی ئاشـتبوونەوە نەخشـەی تـازەی ئەورووپـای بڕیـار لەسـەردا، وڵاتـە سـەرکەوتووەکان هەمـوو هۆیەکیـان لـە پێنـاو پاراسـتنی بـاری تـازەی نێـو دەوڵەتـان ئامادەکـرد بـۆ ئـەوەی هیـچ شـتێک نەبێتـە هـۆی شـێواندنی هـەوڵ و تەقـەلای دەوڵەتـە گـەورەکان وە بەتایبەتـی فەڕنسـا بـۆ ئـەوە دەچـوو کـە ڕێـگا لـە زیادەڕۆیـی ئەڵمانیـا بگرێـت و هـەوڵ نـەدات کـە سـنووری نێـوان پەیوەنـدی نێـوان وڵاتـان لـە نێـوان هـەردوو جەنگـی یەکەمـی و دووەمـی جیهانـی بـۆ ئـەوە دەچـوو کـە کۆشـش بکرێـت بـۆ دۆزینـەوەی دەسـتەبەرێک بـۆ بەردەوامی بـاری تـازە و پەیڕەوکردنی



شێوازی ئاشتییانە لەبری پەنابردن بۆ جەنگ بەمەبەستی گۆڕینێک لەباری تازەدا , وڵاتە سەرکەوتووەکان و بچووکەکان پشتیان بە کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە بەست بۆ پاراستنی ئاشتی جیهانی و دەیانەویست ببێت بەکۆڕێکی نێودەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی ئەوکێشانەی کەهەن لەنێو دەوڵەتاندا , بەڵام کۆمەڵەی نەتەوەکان نەتەوەکان توشی بێ هێزی بوو لەڕووی هەندێ دەوڵەتاندا چونکە نەیدەتوانی رووبەڕووی گیروگرفتە گەورەکان ببێتەوە بەڵکو تەنیا بۆ ئەوە دەچوو کە گیروگرفتی سیاسی بچووک چارەسەر بکات.

## ٢-هەوڵ و تەقەلای دەوڵەتە گەورەکان لە پێناوی ئاشتی ئەوروپی دا

وڵاتە یەکگرتووەکان لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم زۆر بایەخی بە کۆمەڵەی نەتەوەکان دەدا , بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری لەسەر بەڵگەنامەی کۆمەڵەنەتەوەکان نەدا و بەگۆشەگیری مایەوە لەبەشدار نەکردنی کاروباریدا , بۆیە کۆمەڵەی نەتەوەکان رووبەڕووی بێهێزییەکی بنەڕەتی بوو لەبەشدار نەبوونی ئەم دەوڵەتە مەزنە. هەروەها یەکێتی سۆڤیەتیش لێ ی بەدوور بوو تا ساڵی ١٩٣٤ ز. بەم جۆرە کۆمەڵەی نەتەوەکان لە داکۆکیکردنی ئەم دوو دەوڵەتە مەزنە بێ بەش بوو هەر لەسەرەتای دامەزراندنییەوە.

### فەڕەنساو کۆمەڵەی نەتەوەکان

فەڕەنسا وا سەیری کۆمەڵەی نەتەوەکانی دەکرد کەهۆیەکە بۆ پاراستنی باری تازەی دەوڵەتان و دەیویست کەم و کورتیەکانی بەڵگەنامەکە بگۆڕێت تا بتوانێت رووبەڕووی هەر پەلاماردانێکی ئەڵمانی یان دەوڵەتێکی تر ببێتەوە کە بیەوێت باری تازەی بگۆڕێت. فەڕنسا ئاشکرای کرد کە نەبەڵگەنامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان ناوەڕۆکی پەلاماردان (Aggression ) دەردەخاتو نەئەو شێوازانەی کە کۆمەڵەی نەتەوەکان دەیگرێتە بەر دژی دەوڵەتە پەلاماردەرەکە , وە بۆ تەواوکردنی ئەم کەم و کورتییە ساڵی ١٩٢٣ ز پەیمانێکی ئامادەکرد بەناوی پەیمانی هاریکاری هاوبەشی

(Treaty of mutual essistauce) ئەم پەیمانە ئاڵوگۆڕی بەسەرداهات تا کەم و کورتییەکانی بەڵگەنامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان چارەسەر بکرێت ئەوەی تایبەتە بەپاراستنی یەکێتی و سەربەخۆی دەوڵەتانی هاوبەش لە کۆمەڵەی نەتەوەکان و چارەسەرکردنی گیروگرفتی نێوان وڵاتان بەشێوەیەکی ئاشتی. ئەم پەیمانە لە ناوەڕۆکەکەی دا هاتووە کە هەر ناکۆکییەکی نێوان وڵاتان پێویستەبەناوبژی یان بە گفتوگۆ چارەسەربکرێت.وەئەو دەوڵەتەی کە نایەوێت هانا بۆ ئەم رێگا ئاشتییانە بەرێت بە (دەوڵەتی پەلاماردەر) دادەنرێت , بۆیە هەر دەوڵەتێک کە ئیمزای لەسەر ئەم پەیمانە کردووە بەڵێن دەدات کە دژی ئەو دەوڵەتە پەلامار دەرە کاربکات بەنیسبەت شوێنی جوگرافی و دەسەڵات و توانای سەبازی. بەڵام وەزارەتی پارێزگاران لە بەریتانیا (کە لەدوای وەزارەتی کرێکارانەوە هات ساڵی ١٩٢٤ ز) بڕیاری لەسەر ئەم پەیمانە نەدا , چونکە نەی دەویست خۆی ببەستێتەوە بە پەیمانێکی ئەوروپییەوە , وەنەشی دەویست کە ڕابکێشرێت بەرەو جەنگێک لەگەڵ هەندێک لەدەوڵەتان کە لەدەرەوەی کۆمەڵە نەتەوەکان دان وەک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یان خۆی بخاتە گیروگرفتی دەرەوەی بواری بەرژەوەندییەکانی. بەم جۆرە پڕۆتۆکۆڵی جنێڤ سەری نەگرت.

## بەڵگەنامەی لۆکارنۆ:

بارودۆخی نێوان دەوڵەتان ساڵی ١٩٢٥ ز باش بوو دوای زنجیرەیەک لە پەیمانبەستن لەلۆکارنۆ کە ناونرا بەڵگەنامەی لۆکارنۆ. چونکە باری ئابووری لە ئەڵمانیادا باش بوو بەسەرکەوتنی پرۆژەی داوز بۆ پێدانی بژاردن. هەروەها هەبوونی دوو کەسی بەتوانا و ئاشتی پەروەر لە وەزارەتی دەرەوەی فەرەنسی و ئەڵمانی کە ئەوانیش ئارستید بریاند ( Urusid Briand) و ستریزمان (Streres mann) بوون کە ئەم دوو سیاسیە لەو باوەڕە دابوون کە دەتوانرێت لێک تێگەیشتن لەنێوان ئەم دوو دەوڵەتەدا بکرێت و ناکۆکی لەنێوانیاندا بە گفتوگۆ چارەسەر بکرێت.

وەزیـری دەرەوەی بەریتانـی سیرئۆسـتن تشـمبرلن (Sir ousten chamberlain) پشـتگیری ئـەم لێـک تێگەشـتنەی دەکـرد , چونکـە بەرژەوەنـدی بەریتانیاشـی تێـدا بـەدی دەکـرد. ئەڵمانیـا بەڵێنـی دا کەبەشـداربێت لـە کۆمەڵـەی نەتـەوەکان و کورسـی هەمیشـەیی لەئەنجوومەنەکەیـدا هەبێـت وەک دەوڵەتێکـی مـەزن. هەروەهـا بڕیـاری دا کەرێـگای توندوتیـژی نەگرێتەبـەر بـۆ گۆڕینـی پەیمانـی ڤرسـای , بەڵکـو پەنادەباتـە بـەر گفتوگـۆ بـۆ چارەسـەرکردنی هـەر ناکۆکییـەک کـە ڕوودەدات لەنێـوان ئەڵمانیـا لەگـەڵ فەرەنسـا و بەلجیـکا و پۆلەنـدە و چیکوسـلۆڤاکیادا , فەرەنسـاش بەڵێنـی دا کـە ئەڵمانیـا مافـی هەبێـت لەداواکردنـی گۆڕینـی سـنووری خۆرهەڵاتـی , بـەڵام بەڵێـن بـدات کـە سـنووری خۆرئـاوای کۆتاییـەو ناتوانرێـت دەسـتکاری بکرێـت وەلەئەنجامـی بەڵگەنامـەی لۆکارنـۆ هاریـکاری لەنێـو دەوڵەتـان هاتـە کایـەوە لەسیاسـەتی ئەوروپیـدا تـا ئـەو گیانـە ناونـرا بـە ((گیانـی لۆکارنـۆ)).

## بەڵگەنامەی کیلۆک:

لـە سـاڵی ١٩٢٨ز دا فەرەنسـا پەیمانـی بەسـت لەگـەڵ ویلایەتـە یەکگرتووەکانـی ئەمریـکادا ناسـرا بـە بەڵگەنامـەی کیلـۆگ- بریـان (Kellogg-briand pact) کـە ناوەڕۆکەکـەی بریتـی بـوو لەدانانـی جەنـگ بـە کارێکـی نادەسـتووری و پەنـا بۆبردنـی بـە نـاڕەوا دابنرێـت بـۆ چارەسـەرکردنی ناکۆکییەکانـی نێـوان دەوڵەتـان هەروەهـا ئـەم پەیمانـە ناونـرا بـە پەیمانـی پاریـس یـان پەیمانـی ڕێنەدانـی جەنـگ , زۆربـەی دەوڵەتانـی سـەربەخۆ لەجیهانـدا ئیمزایـان لەسـەرکرد وە لەوانەیـە لەبـەر ئـەوە بوبێـت , چونکـە هیـچ ئەرکێـک بەسـەر دەوڵەتانـەوە نەبـووە بـۆ جـێ بەجـێ کردنـی بیروبـاوەڕی ڕوونەدانـی جەنـگ , بۆیـە گرنگـی ئـەم پەیمانـە زیاتـر تیـۆری بـوو نـەک کـرداری , کەچـی گرنگـە , چونکـە یەکەمجـار بـوو پەنابـردن بـۆ جەنـگ بەکارێکـی نـا دەسـتووری دابنرێـت، بـەڵام ئـەم پەیمانـە سـودێکی بـە کـرداری نەبـوو چونکـە هیـچ شـتێکی دانەنەبـوو لەسـەر ئـەو دەوڵەتانـەی کـە ئیمـزای دەکـەن ئەگـەر هاتـوو لـە

ناوەڕۆکی بەندەکان دەرچوون. بەڵام فەرەنسا بەمانەش هەمووی نەوەستا بەڵکو هەر بەردەوام پەیڕەوی سیاسەتێکی سەربەخۆی دەکرد لە دۆستایەتی کردنی ئەو دەوڵەتە تازانەی لە ئەورووپادا پەیدابوون بە مەبەستی پاراستنی باری تازەو بەرهەڵست کردنی هەر ئاڵوگۆڕییەک لە پەیمانی ئاشت بوونەوەدا. فەرەنسا ئەو سیاسەتەی گرتەبەر هەر لە ساڵی ١٩٢٠ز کاتێک لەگەڵ بەلجیکادا پەیمانی بەست دژی هەر پەلامار دانێک کە بکرێتە سەر یەکێ لەم دوو دەوڵەتە، وەهەمان پەیمانی بەست لەگەڵ پۆڵەندە ساڵی ١٩٢١ز وەیەکێکی لەگەڵ چیکوسلۆڤاکیا و رۆمانیا و یوگسلاڤیا، فەرەنسا لایەنگیری ئەم پەیمانە بوو وەداکۆکی لەسەر کرد بۆ پاراستنی ئەم بارە تازەیە لە ناوەڕاستی ئەورووپادا.

**هەڵوێستی ئەڵمانیا:**

بەڵام ئەڵمانیا چاوەڕێی گۆڕینی دەکرد لە پەیمانی ڤرسای بەرانبەر چوونە نێو و بەشداریکردن لە بەڵگەنامەی لۆکارنۆ و پەیمانی ڤرسایدا ئەوەی کە تایبەتە بە لێپرسینەوەی جەنگ و بژاردن و دانانی سنورێک بۆ هێزی سەربازی و کێشەی سنووری خۆرهەڵاتی، بەرهەڵستی فەرەنسا بۆ گۆڕینی سنووری خۆرهەڵاتی ئەڵمانیا دەگرێتەوە بۆ پەیمان بەستنی لەگەڵ هەندێ دەوڵەتی تازە لە ئەورووپا هەروەکو بینیمان لەو باوەڕدا دابو کە ئەم پەیمانە دەبنە دەستەبەرێک بۆ مانەوەی باری تازە، لە پێناوی ئەوەدا رای گشتی ئەڵمانی زۆر بێزار بوو لە مانەوەی کۆت و پەیوەندی پەیمانی ڤرسایدا وە بەتایبەتی ئەوەی کە تایبەتە بە بژاردن و چەک داماڵین، ئەمە یەکێکە لەو هۆیە کاریگەرانەی کە حکومەتی ئەڵمانیای گۆڕی بۆ حکومەتێکی دیکتاتۆری و پەیڕەو کردنی سیاسەتێکی (خراپ) بۆ رزگار بوون لە کۆت و پەیوەندی پەیمانی ڤرسای.

## ٣ – ئەو گیروگرفتە گرنگانەی پێش پەیدابوونی بزووتنەوەی نازی لە ئەڵمانیادا سەریان هەڵدا:

**بژاردن (قەرەبوو):**

لەو گیروگرفتانەی کە ڕووبەڕووی ئەڵمانییەکان بۆوە لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی کە هۆی سەرەکی بوون بۆ مانەوەی دوژمنایەتی لە نێوان ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانیدا گیروگرفتی بژاردن سپاردبو بە لێژنەیەکی هونەری کە توانای ئەڵمانیا بۆ بژاردن بگرێتە ئەستۆی خۆی، لە ساڵی ١٩٢٠ز کۆنگرەیەکی لە (سبا) لە بەلجیکا دا بەست کە ڕێژەی بژاردنی بەم شێوەیە دانا ٥٢٪ بۆ فەڕەنسا، ٢٢٪ی بۆ بەریتانیا، ١٠٪ی بۆ ئیتالیا و ٨٪ بۆ بەلجیکا وە ٨٪ بۆ هاوپەیمانەکانی دی.

لێژنەی بژاردن جارێکی کەش ساڵی ١٩٢١ز کۆبۆوە و بڕیاری دا کە ئەڵمانیا دەبێت ٢٢ ملیۆن دۆلار بدات، ئەم پارەیەش گەلێ لەوە کەمترە کە کلیمانسۆ و لوید جۆرج پێشنیاریان کردبوو، کە لە توانای ئەڵمانیا دا نەبوو ئەم بژاردنە بە پارە بدات، هاوپەیمانەکان قایل بوون بە بژاردنی خەڵوز و بەرهەمی ئاسن و کوتاڵەوە، بەڵام ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە خاوەن کارگەکان لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان بوروژێنێت، چونکە بووە هۆی ئەوەی کە بەرهەمەکانیان کەم بفرۆشرێت. بۆیە ئەم دەوڵەتانە ناچار بوون بە قستی ساڵانە پارە وەربگرن.

بەڵام ئەڵمانیا توانای دانی پارەی نەبوو بە تایبەتی کە باری ئابووری زۆر خراپ بوو لەچاو ئەو بارەی پێش جەنگی یەکەمی جیهانی. بازرگانی دەرەوەی بەرەو کزی هات و بووە هۆی هەرسهێنانی مارکی ئەڵمانی هەتا وای لێهات نرخەکەی زیاتر نەبوو لە نرخی ئەو کاغەزەی کە لێی دروست دەکرێت. بۆیە ئەڵمانیا ناچار بوو ساڵی ١٩٢٢ز ئاشکرای بکات کە توانای دانی ئەو بژاردنەی نییە و داوای لە هاوپەیمانەکان کرد کە دوو ساڵی دووا بخەن ، بەریتانیا قایل بوو ، بەڵام فەڕەنسا ڕەتی کرد. بۆوانکاریە دەیوست ئەڵمانیا بەزۆر ناچار

بکات بۆ دانی ئەم پارەیە لە ساڵی ١٩٢٣ز هێرشێکی کردە سەر ئەلمانیا دوای ئەوەی لە راین پەڕیەوە (روهر)ی داگیر کرد کە بووە هۆی ڕەخنە لێگرتن لە لایەن بەریتانیاو ئەڵمانیاش تورەبوو، بۆیە ساڵی (١٩٢٤) گفتوگۆ دەستی پێکرد بۆ چارەسەر کردنی ئەم گیرو گرفتە، کۆتایی هات بە دانانی لیژنەیەک بە سەرۆکایەتی مستر داوز (charies Dawse) یەکێک لە شارەزا داراییەکانی ئەمریکی، ئەو بژاردنەی دابەش کرد بە قیستی ساڵانەی کەم کە وردە وردە زیاد بکات و تا پارە دانەکە تەواو دەبێت. کە بار بەرەو چاکی ڕۆیشت سوپای داگیرکەری فەڕەنسی کشایەوە.

لەساڵی ١٩٢٩ز قەیرانێکی دارایی جیهانی هاتە کایەوە ئەڵمانیا داوای کەمکردنەوەی پارەی بژارکردنەکەی کرد، لیژنەیەکی هونەری پێشنیاری کەمکردنەوەی پارەی بژار کردنەکەی بۆ هەشت ملیۆن دۆلار واتا هەمان ئەو پارەیەی کە جاری یەکەم دانرابوو، دەوڵەتە هاوپەیمانەکان ڕازی بوون و پەیمانێکیان بەست لە لاهای لە ساڵی ١٩٣٠ز ئیمزایان لەسەر کرد. بەم جۆرە گیروگرفتی بژاردن زۆری نەمابوو کە بە تەواوەتی چارەسەر بکرێت.بەڵام قەیرانی ئابووری کۆتایی نەهات ئەڵمانیا چی دی پارەی نەدا و ساڵی ١٩٣١ز داوای دواخستنی پارەکەی کرد لە ئەنجامی ئەمەدا بە کۆنگرەیەک لە لۆزان ساڵی ١٩٣٢ز بەسترا بڕیاری کەمکردنەوەی بژاردنەکە درا بۆ حەوت ملیۆن دۆلار ئەگەر ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕازی ببێت بە کەمکردنەوەی قەرزەکانی لە سەر هاوپەیمانەکانی، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان بەمە ڕازی نەبوو، خراپی باری ئابووری هاوپەیمانەکانی ناچار کرد بوەستن لە دانانی قەرزەکانیان و ئەڵمانیاش وەستا لە پارە دانەوە، بەم جۆرە گیروگرفتی بژاردن خرایە پشتگوێ، بەڵام لە ڕووی یاساوە لانەبرا و ئەمە هۆیەک بوو لە ناکۆکی نێوان ئەڵمانیا و دەوڵەتە سەرکەو تووەکان.

## چەک داماڵین:

بەڵام گیروگرفتی گشتی تر کە دەوڵەتە گەورەکانی پێ هەراسان بوو ئەویش گیروگرفتی چەک داماڵین بوو، چونکە ئەم دەوڵەتانە وایان هەست کرد کە ئیتر چی دی ناتوانن بەردەوام بن لە خەرجکردن لە پێناوی پڕ چەک کردندا، کۆنگرەی ئاشت بوونەوەی تازە بڕیاریدا کە ئەڵمانیا پڕ چەک بکات بۆ ئەوەی ئەم کارە ببێتە ڕێخۆشکەر بۆ وڵاتانی تریش. لەبەڵگەنامەی کۆمەڵەی نەتەوەکانیش دا هاتووە چەک داماڵین تا کەمترین ڕادە تا بۆ ئەوەی ئاسایشی ناوخۆیی هەر دەوڵەتێک دەستە بەر بکات، کۆمەڵەی نەتەوەکانیش ئەرکە دانانی پلانی پێوست بۆ چەک داماڵینی گشتی دابنێ، بەڵام ئەو گیروگرفتە چارەسەر نەکراو بووە یەکێ لەو هۆیانەی کە ناکۆکی لە نێوان دەوڵەتە گەورەکان دروست بکات. دەوڵەتەکان توانیان تەنیا ڕادە بۆ هێزی دەریایی دابنێن، لە کۆنگرەی واشنتۆندا لە ساڵی ١٩٢٢ز ئەم پێنج دەوڵەتە (بەریتانیا، ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یابان و فەڕەنسا و ئیتاڵیا) بە پێی ڕێژەیەکی دیاریکراو بێت، وتوێژی کۆنگرە بە ئەنجام نەگەیشت لە بواری کەشتی سووکی جەنگیەوە، بڕیارەکانی کۆنگرەی واشنتۆن ماوەکەی درێژ کردەوە بۆ ساڵی ١٩٣٧ز بەڵام پێشبرکێ لە پێناوی پڕ چەک کردندا لە وشکانی و لە دەریادا هەر لە ساڵی ١٩٣٥ز دەستی پێکرد و کۆنگرەی نێودەوڵەتیش لە ڕووی چەک داماڵینەوە سەر نەکەوت، کاتێک پارتی نازی هاتە سەر حوکم ساڵی ١٩٣٣ز ئەڵمانیا بە خێرایی هێزەکانی وشکانی زیاد کرد. بەم جۆرە پرۆژەکانی چەک داماڵین سەری گرت.

## پرسیارەکانی بەندی شەشەم

١ – ئـەو دەوڵەتـە تازانـە کامانـەن کـە لـە ئەوروپـادا پەیـدا بـوون دوای جەنگـی یەکەمـی جیهانـی.

٢ – ئـەو گیروگرفتـە ئابوورییانـە کامانـەن کـە لـە دوای کۆنگـرەی ئاشـتی لـە پاریسـدا دەرکەوتـن.

٣ – گرنگتریـن بڕیارەکانـی پەیمانـی ڤرسـای بژمێـرە ئـەو ڕەخنانـە چیـن کـە ئاراسـتەی کراوە.

٤ – یاسـای کۆمەڵـەی نەتـەوەکان لـە جنێـڤ چـۆن بـوو بـە ڕێخـراوی نەتـەوە یەکگرتـووەکان بـەراورد بکـە.

٥ – هۆیەکانـی پەیدابوونـی بزووتنـەوەی فاشـی کامانـەن؟ تایبەتییەکانـی ئـەم بزووتنەوەیـە چییـە؟

٦ – بۆچـی وڵاتانـی ڕۆژئـاوا بـە شـێوەی لاواز دەرکەوتـن لـە نێـوان هـەردوو جەنگـی یەکـەم و دووەمـی جیهانـی.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئا | | بەربەرەکانێ | منافسه |
| ئازادیخوازان | الاحرار | بێ ئامان | الجارف |
| ئازووخە- ئازووقە | مؤونه | بەرپرس | مسؤول |
| ئاوات | طموح | باکوور | شمال |
| ئامێری ورد | الالات الدقیقه | باشوور | جنوب |
| ئەنسکلۆپیدیا | الموسوعه (دائره المعارف) | باجگر | الجابي |
| هەڵاوسان | التضخم | بەڵگەنەویست | بتاکید |
| ئامۆژگا | معهد | بیروباوەڕ | المعتقد |
| ئۆقیانووس | المحیط | باوەڕ | العقیده |
| ئاگاداری | اعلان | بنچینه | المنشا اساس |
| ئاستان- ولایەت | ولایه | بنەچە | الاساس |
| ئاوکۆ- ئەستێلک | الحوض | بوار | المجال |
| ئەزموون | التجربه | بەخاوەن بوون | التملک |
| ئامێری فرین | الالات الطائره | باڵۆن | المنطاد |
| ئەبونا | الاب | بێ تەل | اللاسلکي |
| ئەستێرە گەڕۆکەکان | الکواکب السیاره | بووژانەوە | الانتعاش |
| ئەندامی | العضوی | باڵادەست | المهیمن- المسیطر |
| ئاوێتەیی | الترکیبي | بەرپابوون | قیام- اشعال |
| ب | | | |
| بەرهەڵستی کردن | مقاومه | بەکاربردن | الاستهلاک |
| بەڕێوەبردن | الادراه | بەکارخستن | لتشغیل |
| بانگ ڕاهێشتن | اعلان (للحرب والسلم) | پ | |
| بەڵگەنامە | الوثیقه-المیثاق | پادشا | الملک |
| بریکار | الوکیل | پادشایەتی | الملکیه |

| بەڵێن | وعد | پادشاویستەکان | الملكيون |
|---|---|---|---|
| بودجە | ميزانيه | پێشبرکێ | المسابقه |
| باج | ضريبه | پەشێوی | الاضطراب |
| بژاردن | تعويض | پایه | منصب |
| بێ لایەن | حياد | پرچەک | تسليح |
| بنەما | مقومات-اصول | پێکدادان | اصطدام |
| پێشنیار | اقتراح | تێچوون | الكلفه |
| پابەند | متعلق-مرتبط | تەشی | مغزل |
| پێناسە | تعريف | تەون | نول |
| پاپۆڕ-کەشتی | باخره | تازەبابەت | البدعه |
| پەیمان | حلف | تۆژینەوە | البحث |
| پەیمان بەستن | التحالف | تۆژینەر | الباحث |
| پێوەر | مقياس | توخم | عنصر |
| پێوان | قياس | تاقیگەیە | التجريبي |
| پەرەسەندن | تطور | تەنەئاسمانییەکان | الاجرام السماويه |
| پەیدابوون | نشوو | تەنگەبەرە ئاوییەکان | المضايق المائيه |
| پۆزشت | اعتذار | تەبایی | ائتلاف |
| پێکەنیناوی | الفكاهي | ج | |
| پێداویست | مستلزمات-متطلبات | جقە | تاج |
| پاڵەپەستۆ | الضغط | جەنگ | حرب |
| پێکوت | المصل | جڤات | نقابه |
| پەروەردکار | المربي | جووڵێنەر | محرک |
| پیلان | الدسيسه | جەنجاڵ | ازدحام |

| | | | |
|---|---|---|---|
| پسپۆری | الاختصاص | چ | |
| پەیدابوون و گەشەکرد | النشوو والارتقاء | چەرخ | عصر |
| پێشەنگ | الطلائع- البوادر | چوونەپاڵ | انضمام |
| پەلاماردان | الاعتداء | چوارقۆڵی | الرباعي |
| پەنابەر | اللاجئ | چەقی گەردوون | مركز الكون |
| ت | | چاکەخواز | المصلح |
| تێکچرژان | الاشتباك | خ | |
| تێکشکان | الفشل- الاندحار | خواست | الاراده |
| تخوب | حدود | خاوەن مافە تایبەتییەکان | اصحاب الامتيازات |
| تۆقاندن | الارهاب | د | |
| تۆقینەر | رهيب | دانان | تشريع |
| تەوژم | تيار | داکۆکی | تدعيم- تعجيد |
| تەێکەری | سريع | داخوونی | ادخال |
| دارێژگەی یادگاری | النصب التذكاري | رووناکبیر | مفكر- ميقف |
| دەست تێوەردان | التدخل | رێنمایی | الارشاد- التوجيه |
| دامرکاندنەوە | القمع- الاخماد | رەگەز | الجنس-العنصر |
| داگیرکەر | المحتل- المستعمر | راستەقینە | الواقعي |
| داگیرگە | المستعمره | رەچەڵەک | الاصل-الوراثه |
| دادوەری | القضاو | رێژە | النسبه |
| دادگا | المحكمه | ز | |
| دوولایەن | الثنائي | زەلکاو | مستنقع |
| دەستەبەری | الضمان | زۆربەی | الاكثريه |
| دژایەتی | التناقض | زیادەڕۆیی | التطرف-المغالاه |

| دەمارگیری نەتەوەیی | التعصب القومی | زەبر | الاثر |
| --- | --- | --- | --- |
| دەسەڵات | السلطه-النفوذ | ژ | |
| دەمەتەقێ | المناقشه- المجادله | ژیار | الحضاره |
| دەستە | هیئه | ژیری | العقل |
| دەست وپێوەند | الاتباع | س | |
| درکاندن | التصریح | سەرژمێر | الاحصائیه |
| ر | | ستوون | العمود |
| ڕەش بین | المتشائم | سەرکێش | المغامر-الطائش |
| ڕەشەگرانەتا | التیفوس | سیما | الطابع |
| ڕاستەوخۆ | المباشر | سێ بەرۆ | الحمی الصفراو |
| ڕێباز | المذهب،الاتجاه | سکاڵا | الشکایه-العریضه |
| ڕێککەوتن | الوفاق-الصلح | سەردەم | العصر-العهد |
| ڕەورەوە | العجله | سڕبوون | السبات |
| ڕاوێژکار | المستشار | ش | |
| ڕاوێژکردن | استشاره | شێوە | الصبغه-الشکل |
| ڕەوکردن | الهجره | شەڕوەستاندن | الهدنه |
| ڕووبەر | المساحه | شوێنەوار | الاثار |
| ڕاڤە | شرح | شکۆمەندی | الکرامه |
| ڕارا | متردد | ف | |
| ڕواڵەت | مظهر | فەرماندار | حاکم (سیاسی) |
| فێرگە | المدرسه | کەلوپەل | البضائع |
| فشار | الضغط | کاریگەری | تأثیر |
| فەرمانگە | الدائره | کەش | الجو |
| فریاکەوتنی بەرایی | الاسعاف الاولیه | کێشەی مانەوە | تنازع البقأ |

| فەلسەفەی ئاوێتەیی | الفلسفه المرکبه | کەڵەکردن | تکدیس |
|---|---|---|---|
| ک | | کوتان | تطعیم |
| کۆڕ | مجلس | گ | |
| کەمهێنان-کورتهێنان | العجز | گوشراو | العصیر |
| کۆتایی پێهێنەر | الحاسم | گەنجینەی چاک | مخزن الاسلحه |
| کایە | المجال | گرانەتا | التیفوئید |
| کەڤر (تاوێر) | الصخر | گاڵتەجاری | السخریه |
| کۆڕەو | موکب | گەشبین | المتفائل |
| کۆشک | بلاط-قصر | گەشەسەندن | الارتقاْ |
| کۆمپانیا | الشرکه | گەشەکردن | النمو-التطور |
| کەنارگرتوان | المحافقین | گفتوگۆ | المفاوضات |
| کۆمار | الجمهوریه | گرنگ | مهم |
| کۆمارویستەکان | الجمهوریون | گۆشەگیری | الانعزال |
| کەنداو | الخلیج | گوزارشت | التعبیر |
| کۆمەڵناسی | علم الاجتماع | گەف | الانذار ـ التهدید |
| کەلاوە | انقاچ | گومەز | القبه |
| کەوانەیی | القوس | گەردوون | الکون |
| کەنار | الساحل | گەڵاڵەنامە | اللائحه |
| کۆیلە | الرق | گەرد | جزئ |
| کەشتیوانی | الملاحه | گەردیلە | ذره |
| کەمینە | الاقلیه | گەلەکەشتی | الاسطول |
| کاردانەوە | ردالفعل | ل | |
| کیشوەر | القاره | لاگیری | تایید |
| کەشتی | السفینه | لایەنگر | مؤید ـ منحاز |

| | | | |
|---|---|---|---|
| کێشه | القضيه | لەرادەبەدەر | فظيع |
| کپ کردن | القمع - الاخماد | لەخۆبوردن | الايثار |
| لەمپەر | حاجز | وتووێژ | المناقشه |
| م | | هـ | |
| ماوه | مدی - خلال | هاڤرکێ | المسابقه |
| مەیلەوگەرم | الدافئ | هەمبەری | التوازن |
| مافی تایبەتی | الامتياز | هەڵگەڕانەوه | الانقلاب |
| مەیدانی ئیش | حيز العمل | هەڵکوتان | غاره |
| مەکۆ | المکوک | هەلپەرست | الانتهازی |
| مڵ پەرپچن | المقص | لە هەڵوێست | الموقف |
| موڵکداری | التملک | هەست پێکراو | المحسوس |
| | | ن | |
| هۆز | العشيره | | |
| نۆکەند | القناه | هاریکاری | التعاون |
| نەمان | اضمحلال - فناء | هیوڵ | الهدوو |
| ناڕەوا | التعسف | هاوهێز | المتکافئ |
| نیاز | مراد | هەرزن | الدخن |
| ناکۆکی | النزاع | ی | |
| ناوەند | الوسط | یاسا | القانون |
| نەتەوەیی | القومی | یاسای کێش کردن | قانون الجاذبيه |
| داب ونەریت | القوميه | یەکە | وحده |
| نەشتەرکاری | التقاليد | یاداشت | مذکره |
| نوێخواز | العمليات الجراحيه | | |
| نائەندامی | المجدد | | |

| نیگار | لاعضوی | | |
|---|---|---|---|
| ناوازە | رسم | | |
| نێردراوە | الارساليات | | |
| مژدەدەرەكان | التنشيريه | | |
| نوێنەری باڵا | المندوب السامي | | |
| و | | | |
| وروژاندن | اثاره | | |
| وریابونەوە | انتباه - تنبيه | | |
| وێژە | الادب | | |
| وزە | الطاقه | | |

پێرست

